کورد

# دوژمنی خۆت بناسە



## بیرەوەری لیزانێکی موخابەرات

رەفیق پشدەری

بەرگی سێیەم



كورد..

# دوژمنی خۆت بناسه

نووسینی

رەفیق پشدەری

بەشی سێیەم

٢٠٠٠

**پێشەکیی:**

❖ بەهەموو ئەو کوردە نیشتمانپەروەرانەی لەپێناوی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١و ڕاپەڕینی ١٩٩١دا گیانیان بەخشیی و ماڵیان وێران بوو دەربەدەر بوون.

❖ بەوانەی ئاشبەتاڵ و ٣١ی ئابیان بینیی و ماڵیان تالانکرا.

❖ بەوانەی لەپێناو دروشمی یاخەمرین یا ئەمریندا بوون بەقوربانی لەکاتێکدا. ئەمڕۆ سنوورمان لەسنووری شارەوانی شارو شارۆچکەکانی دهۆك، هەولێر، چەمچەماڵ، کەلارو مەیدان تێناپەڕێت و حزبەکانیش دەنگیان لێوە نایەت. بەڵکو ڕێگا خۆش دەکەن بۆ زیندوکردنەوەی دیکتاتۆر صەدام.

❖ دووبارە پێشکەشە بەهەموو ئەوانەی بڕوایان هەیە بەوەی کەتەنیا لەڕێگای ڕاپەڕینێکی جەماوەرییەوە بنەماڵەی بارزانی لەناو دەبرێت نەك بەهۆی ئەو سەرکردە حزبییانەوە کە لە ترسی لەدەستچونی بەرژەوەندییەکانیان مجامەلەیان دەکەن. چونکە دوای نەمانی بنەماڵە بە٢٤ سەعات ئاشتیی و برایەتی و ئارامی لەناو سەرجەم گەلی کورددا بەرقەرار دەبێت و هەموو حزبە سیاسیەکان یەك دەگرن.

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

بەداخەوە کەپیلانەکانی دوژمنی کورد بەتایبەتی دوژمنی ناوخۆ، لەمێژووی خەباتی ئێمەدا ئەوەندە زۆرن کەباسکردنیان بەبەرگێك و دوو بەرگ تەواو نابێ، بۆیە کەسێك بیەوێ بەڕاستگۆیی و بێ خۆدانە پاڵ هیچ حزبێك و پاکانەکردن بۆ هیچ لایەك ئەو مێژووە بنوسێتەوە، ناچار دەبێ بەرگی سێیەم و چوارەم و پێنجەمیش بنووسێ، تا بەرچاوی نەوەی نوێی گەلەکەمان رۆشن بێت و بتوانێ دۆست و دوژمنی خۆی جیابکاتەوە، هەوڵبدا پەند لەهەڵەکانی رابردوو وەربگرێ و بیکاتە مەشخەڵی عەقڵ و هۆشی خۆی، تا لەدواجاردا گوڕی گەورەترو خێراتر بەو بزاڤە نەتەوەییە بدا. لەخوێنەری بەڕێزی ناشارمەوە کەهاندان و پشتگیریی ئەوان، چ ئەوانەی لەناوەوەی کوردستانن چ ئەوانەی بەتەلەفۆن و فاکس لەزۆربەی شارەکانی ئەوروپاوە پەیوەندییان پێوە کردووم، هێزو تاقەتێکی زیاتری پی بەخشیم لەتەواوکردنی ئەو پرۆژەیەی بێلایەنانە دەستم پێی کردبوو،کە ئەویش ناساندنی گەلەکەمانە بەدوژمنی ناوخۆی، بەو دوژمنەی بەهەمان زمانی کوردی دەدوێ و لەهەمان نەتەوەیەو سەرسەختترین دوژمنیەتی. بۆیە بەو پاڵپشتە مەعنەوییە گەورەیەو بەپشت بەستن بەخوا، وا بەرگی سێیەمیش کەوتە بەردەستی خوێنەری بەڕێز. کەهیوادارم بتوانێ رۆشنایی

زیاتر بخاتە سەر مێژووی گەلەکەمان و جێی متمانەو سوودبەخشین بێ بەتۆ. چونکە ئەم کتێبەم وەکو بەرگەکانی پێشوو هەروەها ئەوانەش کەئینشائەڵلا- بەدوایدا دێن، بیرەوەری و یادەوەریی کەسێکە لەناوجەرگەی رووداوەکاندا ژیاوەو لەخۆشی و ناخۆشیەکانیدا بەشدار بووە. جگە لەوەش هەموو کەس دەزانێ کەمن کابرایەکی حزبی نیم و دژی کەسیش ئەم کتێبەم نەنووسیوە، بەڵکو من هاتووم چیم بینیوەو چی کراوە بۆ خەڵکم ئاشکرا کردووە، با فلان و فیساریش پێیان ناخۆش بێت. هەروەکو قورئانی پیرۆز فێرمان دەکا *وقل الحق من ربكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر...*، چۆن خوا فەرمان بەپێغەمبەر دەکا کە لەبارەی خوای خۆیەوە راستی بڵێ و گوێ نەدا بەوەی کەکێ بڕوا دێنێ و کێش کافر دەبێ، بەهەمان شێوە، منیش پەیمان دەدەم و سوێند بەخوا دەخۆم، کە لەبارەی مێژوو بەسەرهاتی گەلەکەمان- ئەوەندەی لێی ئاگادار بم- لەڕاستی کەمتر نەڵێم، خەڵکیش ئازادن بڕوا دێنن یان نا، پێیان خۆشە یان نا. هەر لەم بڕوایەوە سەرەتای ئەم بەرگەش هەر وەکو بەرگی پێشو بەچەند تێبینییەك لەسەر بەرگی دووەم دەست پێدەکەم، بەو هیوایەی ئەگەر لەبەرگی رابردوودا لەشوێنێك ناڕۆشنی هەبووبێت یان شتێکم بیر چووبێ، ئەوا خوێنەری خۆشەویست بەو تێبینیانە زیاتر بابەتەکەی لا روون بێتەوەو کەڵکی لێ وەربگرێ.

خزمەتکاری کوردو کوردستان.

رەفیق پشدەری

زیاتر بخاتە سەر مێژووی گەلەکەمان و جێی متمانەو سوودبەخشین بێ بەتۆ. چونکە ئەم کتێبەم وەکو بەرگەکانی پێشوو هەروەها ئەوانەش کەئینشائەڵلا- بەدوایدا دێن، بیرەوەری و یادەوەریی کەسێکە لەناوجەرگەی روداوەکاندا ژیاوەو لەخۆشی و ناخۆشیەکانیدا بەشدار بووە. جگە لەوەش هەموو کەس دەزانێ کەمن کابرایەکی حزبی نیم و دژی کەسیش ئەم کتێبەم نەنووسیوە، بەڵکو من هاتووم چیم بینیوەو چی کراوە بۆ خەڵکم ئاشکرا کردووە، با فلان و فیساریش پێیان ناخۆش بێت. هەروەکو قورئانی پیرۆز فێرمان دەکا *وقل الحق من ربكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر*...؛ چۆن خوا فەرمان بەپێغەمبەر دەکا کە لەبارەی خوای خۆیەوە راستی بڵێ و گوێ نەدا بەوەی کەکێ بڕوا دێنێ و کێش کافر دەبێ، بەهەمان شێوە، منیش پەیمان دەدەم و سوێند بەخوا دەخۆم، کە لەبارەی مێژوو بەسەرهاتی گەلەکەمان- ئەوەندەی لێی ئاگادار بم- لەراستی کەمتر نەڵێم، خەڵکیش ئازادن بڕوا دێنن یان نا. پێیان خۆشە یان نا. هەر لەم بڕوایەوە سەرەتای ئەم بەرگەش هەر وەکو بەرگی پێشو بەچەند تێبینییەك لەسەر بەرگی دووەم دەست پێدەکەم، بەو هیوایەی ئەگەر لەبەرگی رابردوودا لەشوێنێك ناڕۆشنی هەبووبێت یان شتێکم بیر چووبێ، ئەوا خوێنەری خۆشەویست بەو تێبینیانە زیاتر بابەتەکەی لا روون بێتەوەو کەڵکی لێ وەربگرێ.

**خزمەتکاری کوردو کوردستان.**

**رەفیق پشدەری**

*تێبینی:*

*لەسەر بەرگی دووەمی کورد دوژمنی خۆت بناسە ل٣٠.*

**سەرلێشێوانی بنەماڵە**

دوای رێککەوتنی جەزایر، لەنێوان عێراق و ئێران ١٩٧٥/٣/٦ بارودۆخی کوردستانی باشوور تووشی پەشێوی و ئاڵۆزییەکی زۆر گەورە بوو. خەڵکی کوردستان لەسەرەتای رێککەوتنەکەوە تا راگەیاندنی ناوەڕۆکەکەی لەدڵە راوکێ و دوودڵییەکی زۆردا دەژیان، چونکە دەیانزانی پاشەڕۆژو ئەنجامی شۆڕشەکەیان لەبەردەم هەڕەشەی جددیدایە، کەسیش لەوە دڵنیا نەبوو کەباوکی شۆڕش بارزانی لەئاست ئەو رێککەوتنە هەڵوێستی چی دەبێ ئەگەر هات و دژی بەرژەوەندییەکانی شۆڕش وەستایەوە. ئاشکرایە کەبارزانی لەئاست دوا بڕیاری شومی رێککەوتنی جەزائیر تەنها چوار رێگای لەبەردەمدا بووە:-

١- بریتی بوۆە لەخۆدانە دەست حکومەتی بەعس، کەئەمەیان قورسترین و سەختترین دەرگا بووە رووی تێ بکات، چونکە هەڵبژاردنێکی ئاوا بێجگە لەوەی کەشۆڕش و دەستکەوتەکانی بەبا دەدا، لەهەمان کاتدا خودی بارزانی و بنەماڵەکەشی رووبەڕووی هەڕەشەی مەرگ دەبوونەوە. بارزانی دوای شۆڕی کەگەڕایەوە بۆ کوردستان بەشکۆدارییەوە پێشوازی کرا، بەجۆرێك کەجێی چاوەڕوانی نەبوو. بەڵام ئەو بەداخەوە زۆر نابەرپرسانە چووە بەردەم عەبدولکەریم قاسم و پێی وت: من سەربازی تۆمو لەدانیشتنێکیتردا پێی وتبوو من قەیتانی قۆندەرەکانتم!

ئەم خۆدانە دەست و چوونە پێشەوەی بارزانی لەدەسەلاتی ئەو کاتەی عێراق بەهاو نرخی ئەو پیاوەی لەبەر چاوی سەرانی رژێمدا کەم کردەوە، بۆیە بەردەوام وەك سەرۆك جاشێك مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد نەك سەرکردەیەکی سیاسی.

پاش ماوەیەکی کەم بارزانی دژی شۆڕشی ١٤ی تەمموز چەکی هەڵگرت و بوو بەکەوا سپی بەر لەشکر، لەئەنجامدا حکومەتیعەبدولکەریم روخا، دوای هاتنی بەعس بۆسەر دەسەلات لەعێراقدا پاش رووخانی دوو حکومەتی عەبدولسەلام وعەبدولرەحمان، بەیاننامەی ١١ی ئادار راگەیەنرا، بەڵام هەرزو شەڕ لەنێوان حکومەت و شۆڕشدا دەستی پێکردەوە، هەمو ئەوانە وای لەبارزانی کردبو کەنەتوانێ بگەڕێتەوە ژێر دەسەلاتی رژێمی بەعس.

٢- **هەڵاتن بۆ ئێران:** گەرچی ئەمرۆ هەموومان دەزانین کەبارزانی ئەم رێگایەی هەڵبژارد، بەڵام ئەمەشیان هیچی لەوەی یەکەمیان کەمتر نییە،چونکە لەهەردوو حاڵەتدا شۆڕش بڵاوەی پێدەکرێ و گەل تووشی زیانی گەورە دەبێ، تاکە جیاوازیەك ئەوەیە کە لەم رێگایەیاندا گیانی ئەندامانی بنەماڵەی پارێزراو دەبێ و ژیانیان مسۆگەرە. با بەزەلیلی و ملشۆڕیش بێ، گەل و شۆڕشەکەشی بەقوربانی ئاسودەیی و رزگاربوونی بنەماڵەبێ! چونکە بەلای بارزانییەوە ئەگەر گورگ پەلاماری مەڕبدا گرنگ نیە مەڕەکان چیان بەسەردێ، گرنگ ئەوەیە شوان پارێزراو بێ.

بۆیە من دڵنیام دوای هەرەسی ١٩٧٥هەموو ئەو کارەسات و نەگبەتی و نەهامەتییانەی بەسەر گەلەکەماندا هاتووە، بەشێکی

ـەرە زۆری لەئەستۆی بنەماڵەدایە، ئەگەر ئەوان شۆڕشیان نەکردبا بەقوربانی بەرژەوندیی تایبەتی خۆیان و لەبەردەم دەسەڵاتی بەعسدا چۆکیان دانەدابا، ئەوا بەعسیش بەو ئاسانی و دڕندەییە نەدەکەوتنە گیانی گەلەکەمان.

٣- سێیەمین ڕێگای بەردەم بارزانی کەپەسەندترین ڕێگایەو لەهەموویان سەختترە، ڕێگای درێژەدان و بەردەوامیی شۆڕشە، ڕێگای ملکەچ نەکردن و ملنەدانە بەدوژمنان، ڕێگای یان کوردستان یا نەمانە، ڕێگای شێخ عوبێدولا نەهری، شێخ سەعیدی پیران، شێخ مەحموودی حەفید، قازی محەمەدو چەندین ناودارو شۆڕشگێڕی‌تره. بەلام چ لەمەلایەك دەکەمی کەخۆی بەشوێن کەوتوی پێغەمبەر بزانێ و کار بەقسەکەی نەکا کاتێك فەرمویەتی کلکم راع وکلکم مسؤل عن رعیتەبەڵکە حاڵی ئەو بلێ انا الراعی، ومسؤل عن نفسی فقط!

٤-ئەم ڕێگایەی بەردەم بارزانی خۆکوشتن بوو. لەسەرەتای دەرکەوتنی پیلانە دوژمنکارییەکەی جەزائیر زۆربەی خەڵك بڕوای وابو کەمەلا مستەفا خۆی دەکوژێ و ملشۆڕی قبوڵ ناکا. ئاشکراشە لەمێژووی خەباتی گەلاندا نمونەی ئەوامان زۆرە کەپاش ئەوەی سەرکردەی شۆڕش دڵنیا دەبێ لەوەی بەرامبەر پیلانێکی وادایە کەناتوانێ خۆی بۆ بگیرێ و بەرەنگاریی بکا، لە ترسی ریسوابوون خۆی دەکوژێ تا لەیادەوەری و مێژووی گەلدا بەزیندویی بمێنێتەوە، نەك ژیانێکی زەلیلی قبوڵ بکا کەدواجار لەکەسێکی شۆڕشگێڕەوە بۆ مرۆڤێکی بەرژەوەندی پەرستی دەگۆڕێت.

كاك فؤاد عارف بۆی باسكردم كەدوای گەڕانەوەی بۆ بەغداو بینینی مەلا مستەفا پێی گوتبودەبو هەمیشە دەمانچەیەكت پێبا، بۆئەوەی لەكاتێكی ئاوادا یان خۆت یانشات كوشتبا .

ئەو هەڵوێستە ترسنۆكەی بارزانی هەمان هەڵوێستی سەدامم بیر دێنێتەوە كەپاش ئەوەی لەشەڕی دووەمی كەنداو تووشی شكستیی گەورە بوو، هاوپەیمانان چەندین مەرجی ریسواكەریان لەسەردانا تا ئەوەی كەوتیان دەبێ خودی خۆی بێتە سەر تەلەفزیۆن و ملكەچیی بێمەرج رابگەیەنێ سەدام وەك فس فس پاڵەوانی شەڕ تەنها بۆ ئەوەی گیانی پارێزراو بێ هەموو مەرجەكانی قبوڵكرد.، لەو كاتەدا سەرۆك موعەممەر قەزافی– دڵسۆزترین سەركردەی عەرەب بۆ كورد– هاواری كردو وتی "ژەهرت خواردبا گەلێك باشتر بوو لەو ئیمزایە". هەرچەندە ئەو كارە لەمەلا مستەفا زیاتر چاوەڕوانكراو بوو وەك دكتاتۆری بەغدا، چونكە سەدام لەداگیركردنی ولاتێكدا تێكشكا، بەلام مەلا مستەفا شۆڕشی رزگاریخوازی گەلێكی بەبادا دا.

لەو كاتەدا كەبارزانی بڕیاری ئاشبەتاڵی داو بەرەو ئێران هەلات، شۆڕش خاوەنی ١٥ ملیۆن فیشەكی تفەنگ و رەشاش ونزیكەی ٥٠٠٠ گوللە تۆپ و هاوەن و لەشكرێكی زیاتر لە٧٠٠٠٠ پێشمەرگە بوو، لەگەڵ نزیكەی ٤٠٠٠٠كم چوارگۆشە گردو شاخ و دەشتی لەبەر دەستدا بوو. لەڕووی ئازوقەو ئابووریشەوە رەنگە لەو ساتەدا دەوڵەمەندترین شۆڕشی رۆژهەلات بوبێ. تاكە كەموكوڕییەكی شۆڕش نەبوونی سەركردەی شیاو و لێهاتوو بو، بەڵكو بەپێچەوانەوە دەركەوت

خـالی لاوازی شـۆرش، هاوتەبانـەبوونی سـەرکردەو گـەل بـوو لەگیان بەخشین و دلسۆزی بۆ شۆرش.

دیـاره سـەرکردەی نـه تـرس و جەربـەزه دەتوانـێ شـۆرش لـه ترسناکترین و دژوارترین باردا رزگاربکاو، گەلیك بریـاری ژیـانی دابێ دەتوانێ نەك پیلانه ئینسانییەکان، بەلکو خودی قەدەریش بەپیی ویستی خـۆی هەلسوڕینی، شاعری تونسی ابو القسـام دەلی:—

*اذا الشعب يوما ارادا الحياة*

*فلابد أن يستجيب القدر*

بـەلام وەکـو ئامـاژەم پـێدا، بـارزانی بەشـێوەیەك هـەلات و ئاشـبەتالی لیکـرد، کەنـەك هـەر لـەناو کوردسـتاندا جیـی سەرسـامی و پرسـیار بـو، بـەلکو لەدەرەوەشـدا نـاوی کـورد و شۆرشـەکەی زراند. لـەکتێبی الحـزب الدیمقراطـی الکردسـتانی کەلیژنـەی ئامادەکـار نووسـیویەتی و لەسـەرەتای کـانوونی دووەمـی سـالی ۱۹۷۷دا دەرچـووه هـاتووه کـاتیك شـای ئـیران بەبارزانی راگەیاندبەپیی ریککەوتنی جـەزائیر دەبـێ کۆمـەك و یارمـەتی لەشۆرشـی کوردی بـبرێ و ریگـا نـەدا هیـچ یارمەتییـەك بەریگای ئیراندا بەشۆرش بگا ، لەکاتیکدا شا ئەمەی بەبارزانی راگـەیاند و چـاوەریی وەلامـی دەکـرد ئـاخۆ دەبـێ هەلویسـتی سەرکردەی شۆرش چۆن بووبێ؟

وەلامی بارزانی ئەوە بوو کەگوتویەتی: *نحن شعبك، ومادمت راضيا عن اتفاقية الجزائر وتؤمن مصالح ايران التى هي وطننا الأم، لايوجد لدينا ايضا شيء ضدها ونحن رهن اوامرك اذا قلت*

*لنا موتوا نموت او عيشوا نعيش. لقد كنا مخلصين لك ولا نزال، وسوف نبقى هكذا فى المستقبل ايضا ونأمل ان تستمر رعايتكم لنا ولقضيتنا دوما*...الخ. پاشان هەر لەهەمان کتێبدا، دوای تەواوبوونی خەجالەتنامەکەی بارزانی بۆ شا، لەلایەن دەستەی ئامادەکارەوە بەدواداچونێك بۆ ئەم نامە کراوە کەتێیدا هاتووە *(ان هذا الاقوال التى اطلقها البارزانى فى طهران يوم* ١٩٧٥/٣/١٢ *بشكل متخاذل جدا لم يجبره احد عةلى التفوه بها ولم تكن ايضا تكتيكا لعدة ايام، وقد تصرف هكذا بدلا من ما كان يجيش فى صدر شعبه الجريح ومن الدفاع عن القضية فى هذا اللقاء، وقد اعقب اقواله هذه بقرار عدم المقاومة وإنهاء الثورة، الأمر الذى لايزال وسيبقى دوما موضع شجب وغضب ابناء شعبنا المخلصين قاطبة، وكذلك اصدقاء شعبنا الحقيقيين. كما ان هذة الأقوال والمواقف هى موضع استهزاء وعدم احترام الاعداء بالتأكيد ايضا.*

*(وكانت تصرفات واقوال البارزانى فى تلك الجلسة موضع الأسى والألم الشديدين، ولا تعبر عن ارادة شعبنا بحالة من الأحوال وليس لها مايبررها عةلى الاطلاق، حيث ان الشاه كان انتهى من توقيع صك التآمر عةلى شعبنا فى الجزائر طاعنا بذلك قضيتنا من الخلف وبشكل لااخلاقى).*

بەم شێوەیە بارزانی خۆی بەدلسۆزو گوێرایەلی شا دەناسێنێ و بەکردەوەش سەلماندی کەئەو نەك هەر لاری لە ناوەرۆکی ڕێککەوتنەکە نییە، بەلکو ئەو تەنها گوێرایەلیی لەسەرە بۆ دەسەلاتی تاران، بافەرمانەکانی ئەو دەسەلاتە دژی

گەلی کوردو شۆڕشەکەشی بێ، گرنگ ئەوەیە دلی شا نەرەنجێ و نەلی بارزانی بێوەفا بو ! بۆیە ئەگەر هەندێ لەئەندامانی سەرکردایەتیی بەو بڕیارەی شاو پارتی نارازیش بووبن گفتۆگۆشیان لەسەر کردبێ، ئەوا بارزانی هیچ لاریەکی لەبەردەم ئەم فەرمانە شاهەنشاییەدا نیشان نەداوە. بۆ نمونە لەکتێبی *(الموساد فی العراق ودول الجوار، ص ٢٠٤)*دا ئەوە هاتوە، کەکاتێك بارزانی بەهاودلیی دکتۆر محمودو نوێنەری پارتی شفیق قزاز لەتاران بەدەم بانگکردنی شاوە دەچن، تاریککەوتنی جەزائیریان پێ رابگەیەنێ لە١١ئاداری ١٩٧٥، پاش ئەوەی شا ناوەرۆکی ریککەوتنەکەیانی بۆ ئاشکرا دەکات و داوایان لێ دەکا کەکۆتایی بەشۆڕش بێنن، دکتۆر محمود لێرەدا هەلویست وەردەگرێ و نارەزایی خۆی بەرامبەر بڕیارەکەی شا دەردەبڕێ. ئەویش وەلامی دەداتەوە دەلی: *(انا اقول لك ما هو قراري ولا مكان للجدال والمناقشة)* بێ ئەوەی بارزانی نقەی لێوەبێ و هیچ وشەیەك بلێ کە لەبەرژەوەندیی شۆڕشدا بێ. هەر بۆیە مەلا مستەفا یەکسەر تارانی جێهێشت و لە١٩٧٥/٣/١٣ گەرایەوە کوردستان، لەبالەك دەستی کرد بەبەستنی چەند کۆبوونەوەیەك لەگەل مەسعودو ئیدریس و مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی. هەمو بەشداربوانی کۆبوونەوەکان جگە لەئەندامانی بنەمالە لەسەر ئەوە کۆکبوون کەدریژە بەشۆڕش بدەن و نەهێلن پلانەکانی دوژمن سەربگرێ، بۆیە کۆبوونەوەکان تا ١٩ی مانگ دریژەیان کیشا، لەم ماوەی شەش رۆژەدا خەلکی کوردستان بەگشتی چاوەروانی دوابریاری سەرکردایەتیی شۆڕشیان

دەکرد، تابزانن چارەنوسی شۆرش و خەباتیان بەکوێ دەگاو، ئایا سەرۆکی شۆرش لەنیوان کوردستان و نەماندا کامیان هەلدەبژێرێ؟

مەلا مستەفا دووبارە کۆبوونەوەیەکی تری لەگەڵ شادا بەست، ئنجا بۆ ماوەی نیو سەعات بەنهێنی لەگەڵمستەرXدا دانیشت، دوای ئەوە یەکسەر بریاری ئاشبەتالیدا. ئەم زنجیرە کۆبوونەوە یەك لەدوای یەکانەی مەلا مستەفا لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆرش و سەرانی ئیران وC.I.A تەنها بۆ دوو مەبەست بوو، یەکەمیان بۆ ئەوەبو کەبروا بەسەرکردایەتیی شۆرش بینێ تا دەسبەرداری بیری شۆرش بن و لەئاکامەکانی دریژەدان بەشۆرش بیان ترسێنێ و گیانی فیداکاریی خەلکی کوردستان ساردبکاتەوە. دووەمیان هەولبدا ژیان و گوزەرانی بنەمالە مسۆگەر بکاو دەسکەوت و داهاتەکانی شۆرش بۆ ئیران بگوازێتەوە.

مەلا مستەفا لەکاتی کۆبوونەوەکاندا هەرچی سەروەت و سامانی شۆرش هەبوو هەموی بەلۆری رەوانەی تاران کرد، ئینجا بروسکەی بۆ هەموو بارەگاکانی پێشمەرگە کرد بۆ ئەوەی چەکە قورسەکانیان لەناوبەرن و بەچەکە سوکەکانیانەوە پەیوەندیی بەحکومەتی ئیرانەوە بکەن، لەهەمان بروسکەدا داوای لیکردبوون کە لە١٩٧٥/٣/٢٦دا بەیەکجاری روویکەنە ئیران و کۆتایی بەهەموو شتیك بینن.

هەر لەهەمان کتیبی پیشووی لیژنەی ئامادەکاری *(الحزب الديمقراطي الكردستاني، ص٨٠)*دا هاتووە: *(كانت هذه*

*الأجتماعات لكسب الوقت، حيث كانت قيادة البرزاني قد قررت نبيء ترار تاريخي خطير انتبت بموجبه ثورتنا بشكل مهين وكذلك نضال الحزب الديمقراطي الكردستاني لثلاثين سنة اصبحت كلها مبتورة بما فيها ثورة ايلول)*. بەهەر حال، مەلا مستەفا بەفەرمانی شاو C.I.A و بەئاگاداریی ئیسرائیل ئاشبەتالی لیکردو لەکەرەج لەتاران پالیدایەوە، ئەوانەش کە لەبەندیخانە بوون و مە ترسی لیدەکردن دریژە بەشۆرش بدەن، فەرمانی بەئیدریس و مەسعود کرد بیانکوژیت وەکو محەمەد ئاغای میرگەسووری کورەکانی، هەرچی دیلەکانی رژیمی عیراقیش بوو کەژمارەیان ۳۰۰ سەرباز بوو تەسلیم بەئیرانی کردن، حکومەتی ئیرانیش کردنی بەدیارییەك و دانیەوە دەستی رژیمی عیراق.

مەلا مستەفا بەم کارەی پروپاگەندەی دوژمنانی سەلماند کەدەیانگوت (هەر کاتی ئیران پشت لەشۆرش بکا، ئاشبەتالی لیدەکری). بۆیە لەئەنجامی ئەم رووداوە بەروونی دەرکەوت کەئەم بنەمالەیە تەنها بەدوای پارەو دەسەلاتدا دەگەرین و دروشمەکانی شۆرش و رزگاریی نەتەوەیی لای ئەوان لەسیاسەتی چەواشەکاری و هەلخەلەتاندنی خەلك بەولاوە هیچی تر نین، تابتوانن زۆرترین سەرمایە کۆبکەنەوە، کەتەنها دوای ئاشبەتال نزیکەی ۷۰ ملیۆن دۆلارو ٤٥ ملیۆن دیناری عیراقیی سویسرییان رەوانەی بانکەکانی ئەمریکا کرد. جگە لەوەی کاتیك بنەمالە گەیشتنە تاران، شا ۱۰۰ خانووی پییان بەخشی و یەك ملیۆن دیناری بۆ مەلا مستەفا نارد، تەنها بۆ

مەسروفاتی جەنابیان، ئەمەش لەکاتێکدا گەلی کورد لەعێراق ماڵوحاڵو گوزەرانیان لەدەست دابووو بەدەستی بەتاڵەوە لە ترسی رژێمی عێراقی هەڵاتبوون، چونکە بەعس پاش ئەوەی ناوچە ئازادکراوەکانی شۆرش، کە لەساڵی١٩٦١ەوە لەلایەن گەلی کوردەوە دەستکرا بوو بەرزگارکردنیان، بست بەبستو گرد بەگرد، کەتا جەبەل حەمرین بو، هەر هەموو ئەو ناوچانە تەنها بەبریارێکی ترسنۆکانە کەوتنەوە بەردەستی بەعسو خستنیەوە ژێر دەسەلاتی خۆی، ئەمەش بۆ درێژەدان بەسیاسەتە نەگریسەکانی دەرهەق بەگەلەکەمان کەیەکەم هەنگاوی بریتیبوو لەراگواستنی کوردەکانی خانەقین، جەلەولا، کفری، کەرکوك، دوورز، شێخان، شنگارو تەلەعفەر تا سنووری دهۆكو ناییدە.

ئەو بازرگانییەی کەمەلا مستەفا بەشۆرش کردی دەقاودەق وەك ئەو پەندە عیراقییە وایە کەدەلی: *(یشتری بالمفرد ویبیع بالجملة)*. پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەرەتادا حزبێکی سیاسیی نەتەوەیی بوو، مەشخەلی رزگارکردنی کوردستانی هەلگرتبوو، تا ئەو کاتەی بنەماڵەو بەتایبەت مەلا مستەفا دەستی بەسەردا گرت، لیرەوە کاتیك حزب وەك دامەزراوێکی سیاسیی نوی لەبزاڤی رزگاریی گەلی کورددا دووبارە لەلایەن عەقلی هۆزەوە کۆنترۆل کرایەوەو پیوانە شۆرشگیریو سیاسییەکان گۆران بۆ دووریو نزیکیی لەسەرۆك هۆزو بنەماڵە بۆ گرتنی دەسەلاتو لیپرسراویەتی لەناو حزبدا. بنەماڵە بۆ ئەوەی بتوانی بەتەواوی پارتی تەسلیم بەئیرادەی خۆی بکا، دەستی کرد بەنانەوەی گۆبەندو فەرتەنەو دوبەرەکی لەناو هۆزو

تیرەو توێژەکانی ناو پارتیو لەرێگەی بەخشینی دەسەلاتو پارە توانی خەلکانی نەفسنزمو خائن بکا بەدۆستو لایەنگری خۆی، بێجگە لەوەی کە لەو کاتەدا کۆمەلگەی کوردی لەرووی عەقلیەتو پێکهاتەی کۆمەلایەتییەوە ئامادە باشی تێدا بوو بۆ پێشوازیکردن لەبنەمالەیەکی ئاوا، چونکە ئێمە لەمێژووەوە فێربووین کەسەرکردەو رابەر، کاتێك دەسەلات دەگرێتە دەستو گەل شوێنی دەکەوی کەبەپێی عەقلیەتی خەلك بجولێتەوە. بۆیە دوای ئاشبەتال هەموو ئەو کادرو رۆشنبیرانەی تائەو کاتە بەناچاری خۆیان لەناو پارتیدا بینیبوّوە، دەستیانکرد بەدروستکردنی حزبو گروپیتر کە لەسەر بنەمای شۆرشگێرترو پێشکەوتووترو نوێتر بنیاتنراوە، بەجۆرێك کەقۆناغیکی نوێ لەشۆرشو خەباتی گەلی کورد هاتە ئاراوە.

*تێبینی/*

بێجگە لەئەمەریکاو ئیسرائیل، تەنها سێ لایەنی ناوچەکە لەرێککەوتنی جەزائیرو ئاشبەتال، سوودمەند بوون:

١- محەمەد رەزا شا، کەتوانی بەو رێککەوتنە کۆتایی بەناکۆکیەکانی لەگەل رژێمی عێراق بێنێت لەسەر کەنداوی عەرەب. لەلایەکیتر توانی بەئاشبەتالی شۆرشی کورد لەکوردستانی عیراقدا بەگەلی کورد لەئێران بلی کەکورد ناتوانی لەدەرەوەی دەسەلاتی حکومەتی ئێران هیچ بکا.

٢- حکومەتی بەعس، دوای هاتنە سەر کاری بەعس بۆ دەسەلات لەعێراقدا، ئەمە گەورەترین سەرکەوتن بوو کەتوانی بەدەستی بێنی. گەلی کورد لەکوردستانی ژێردەستی بەعس

لەپاش ئەم شکستە گەورەیە بەجۆرێك توشی بێئومێدیو بێهیوایی بوو کەماوەیەکی زۆرو رەنجیکی گەورەی ویست تا دووبارە متمانەی بەشۆرشی نویو سەرکردایەتییەکەی پەیدا کردەوە.

٢- مەلا مستەفاو بنەمالەکەی گەورەترین سودمەندبوون لەو پلانەدا، چونکە بەو هۆیە توانییان لەتاران کەئەو کاتە وەکو پاریسی ئیستا وابوو پال بدەنەوەو ژیانیکی تیرو خۆش بۆ خۆیان مسۆگەر بکەنو، بەئارەزووی خۆیان هاتوچۆی ولاتە رۆژئاواییەکان بکەن. جگە لەوەش بەدوورکەوتنەوەیان لەشۆرش هەرەشەی کوژرانو تیرۆرکردنیان لەخۆیان دوورخستەوەو دەستیان گرت بەکلاوەکەی خۆیان تا با نەیبا، چش لەکلاوی گەل. تاکە زەرەرمەند لەم ناوەدا، خەلکی هەژارو رەشوروتی کوردستان بو، کەبەهەزار دەردەسەریو نەگبەتی شتیکیان پیکەوە نابو تا لەسایەیدا بژین، بەلام ئەویش کرا بەقوربانی ئیسراحەتی بارزانی. پاش ئەوەی رژیمی عیراق لیبوردنی گشتیی دەرکرد ژمارەی ئەوانەی لەسنووری ئیرانەوە پەرینەوە سەرمال‌وحالی تالانکراویان ١٧٠ هەزار کەس بوو. بەم شیوەیە مەلا مستەفا بوو بەخاوەنی گەورەترین گالتەجاری سیاسی لەمیژووی گەلی کورددا کە بەدلنیاییەوە پاش خۆی کاریگەریی خراپی لەسەر کەسایەتیو سایکۆلۆژیەتی تاکی کورد جیهیشتو، ئەم وتەیەی خستە ژیر گومانەوە کەبەردەوام دۆستو دوژمن دەیلینەوە دووبارەی دەکردەوە "کورد گەلیکی ئازایە".

تێبینی:

سەیر بەرگی دووەم ل ١٠٦

هەندی لەو بەریزانەی بەرگی دووەمیان خویندبۆوە لەوانەی خەلکی ناوچەی بەمۆن، گلەیی ئەوایان لاکردم کەمن بەباشی باسی بنەماڵەی شەرەف بەیانیم کردووە، لەکاتیکدا ئەم بنەمالەیە دەرەبەگن!

سەرەتا من نە بەباشی و نەبەخراپی باسی کەس ناکەم، من تەنها میژوو دەنوسمەوە، چاکی و خراپی شتیکە پەیوەندی بەرووداوەکانەوە هەیە نەك حەزی من، واتامن لەگیرانەوەی هەر شتیکدا ئەوپەری راستگۆی و بیلایەنی خۆم بەکار دینم، جا ئەگەر ئەو نووسینە لەجیگایەکیدا بەدلی کەسیك نەبی ئەوە خەتای من نییە، چونکە میژوو ئەوەنییە کەتۆ حەزی لیدەکەی یان پیت ناخۆشە، بەلکو رووداویکە لەرابردوو، بەتالی و سویری و بەرزی و نزمی و ساردوو گەرمییەوە کەسەکان و لایەنەکان لیی بەرپرسیارن، هەمووشمان ئەو پەندەمان لەبەرە کەدەلی:چ بچینی ئەوە دەدوورییەوە". بۆیە ئەم قسەی ئەو برا بەریزانە دەرهەق بەبنەمالەی شەرەف بەیانی لەراستیدا دوورە لەواقعو، چاكو خراپی لەراستیدا لەسەر بنەمای چیندەرەبەگ/ جوتیار دیاری ناکری، لەمیژووی ئیمەی کورددا چەندین بنەمالەی دەرەبەگ چاکە کارو جوتیاری خراپ دەبینین، جیا لەوەش من هەروەك لەبەرگی دووەمدا لەئاست ئەو بنەمالە بەریزە گوتومە کەبارەگای هیزی پیشمەرگە لەسایەی ئەوان

لەناوچەکەدا کرایەوە. بۆیە دووبارە جەخت دەکەمەوە سەر شۆرشگێریی و بەخانەدانی ئەم بنەمالەیە.

*تێبینی/*

من لەکتێبەکەدا نوسیبوم ئەختەر خان خوشکی حامد بەگە، کە لەراستیدا کچیەتی، بۆیە داوای لێبووردن لەخوێنەرانی بەڕێز دەکەم.

## ناوچەی پشدەرو ڕۆڵی عەباسی بایزی باولو

*تێبینی/*

*لەسەر بەرگی دووەمی ٥ی کورد دوژمنی خۆت بناسە.*

- ناوچەی پشدەر، بەهۆی ئەوەی ناوچەیەکی شاخاوی سەختەو دەکەویتە سنووری عێراق-ئێرانەوە، دوای دروست بوونی دەولەتی عێراق هەموو کات، بۆتە دەروازەو لانکی جولانەوە شۆرشگێریەکانی گەلی کورد لەکوردستانی باشور، بەشێوەیەك کەلانکی کوردایەتی بوو بەناوی دووەمی شاری قەلادزی.

ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق، هیچ دریغییان نەکردووە لەپیادەکردنی سیاسەتە دوژمنکارییەکانیان بەرامبەر بەم ناوچەیە. کارەسات و ویرانکارییە یەك لەدوای یەکەکانی شاری قەلادزی، کەدوایینیان ویرانکردنی تەواوی ناوچەی پشدەرو ڕاگواستنی خەلکەکەی و قەدەغەکردنی ژیان لەو ناوچە بەرفراوان و گرنگە بوو کە لەدرەندەییدا، لەمێژووی هەموو

ناوچەکەدا بەگشتی بێوێنەیە، ئەو کارەساتە ئەگەر لەلایەك بەڵگەی فاشییەت و دکتاتۆرییەتی رژێمی بەعسی بێ، ئەوا لەلایەکی ترەوە ئەنجامی خۆڕاگری و مڵنەدانی خەڵکی ئەم دەڤەرە شۆڕشگێڕەیە بەخواستە نا ئینسانیەکانی دکتاتۆری بەغدا، کە لەمێژووی پرسەروەریی ناوچەکەدا مێژوویەکی دووردرێژی هەیە. هەر لەسەرەتای دروستبوونی حکومەتی عێراقەوە خەڵکی ئەم ناوچەیە لەژێر سایەی دەسەڵاتێکی ناوچەیی سەربەخۆدا ژیاون و دوور بوون لەدەسەڵاتی پێتەخت. ئەو کاتە بابەکر ئاغای سەلیم (بابەکر ئاغای پشدەر) کەسەرۆکی هۆزی پشدەر بوو، پیاوێکی عاقڵ و دانا و زیرەك بووە و توانیی بەلێهاتوویی خۆی دەسەڵاتی هەموو ناوچەکە بگرێتە دەست، بەهەموو هۆز و خێڵەکانیەوە. بەڕادەیەك سەرکەوتووبوو کە لەسایەی دەسەڵاتی ئەودا ئارامی و ئاسایش لەهەموو دەڤەرەکە بەر قەرار بووو کەدەکرێ بەسەردەمی زێڕینی ناو بنێین لەمێژووی ناوچەکەدا. ئەمە وای کرد باری ئابووری گەشە بکاو بازاری نوێ لەشارۆچکەکەدا بکرێتەوە وەکو بازاڕی مینا کە لەسەرانسەری کوردستاندا خەڵك بازرگانی و کڕین و فرۆشتن روویان تێدەکرد بۆ. کار گەیشتە ئەوەی کەخەڵکی بێگانەش بیر لەوە بکاتەوە بێت لەم ناوچەیەدا بژی، لەوانەزیدان عەرەب کەخەڵکی کازمیەی بەغدا بوو، حمەی عەجەمو بشیر عەلی کەخەڵکی ئورمێ بوون.

لێهاتویی بابەکر ئاغا تەنها لەلایەنی ئیدارییەوە نەبوو، بەڵکو ئەو تاکە سەرۆك هۆز بووە کە لەتوانا و گرنگیی ئینگلیز

گەیشتووە لەسیاسەتی ئەم ناوچەیەدا، بۆیە کە لەساڵی ١٩٥٦دا هاتە بەغداو میوانم بوو داوای لێکردم لەگەڵیدا بچم بۆ لای باڵوێزی بەریتانی لەبەغدا، بەڵام من وەڵامم دایەوەو گوتم: لەبەر ئەوەی ئینگلیزی باش نازانم، ناتوانم لەخزمەتتدا بێم.

بۆ ئەم مەبەستە کابرایەکی لەگەڵ خۆیدا برد بەناویم.ع بۆ چاوپێکەوتنی باڵوێز. لەکاتی گفتوگۆدا باڵوێزی بەریتانی پێی ڕاگەیاندبوو کەهاتنی ئەم. حکومەتی پاشایەتیی عێراق بەتایبەت خودی نوری سعید نیگەران دەکا، چونکە ئەوان نایانەوێ ئینگلیز لەگەڵ هیچ سەرۆک هۆزێك پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەبێ. هەروەها پێی گوتبوو کەهەر کێشەیەکت لەگەڵ حکومەتدا هەبوو، دەتوانی بەئاسانی ماجد مستەفا ببینی، ئەویش ئێمە ئاگادار دەکاتەوە تا هاوکاریت بکەین.

سەرباریشی بابەکر ئاغا هیچ کات هاوکاریی ئینگلیزی نەکردووە بۆ جێبەجێکردنی نەخشە داگیرکارییەکانی و نانەوەی کێشەو ئاژاوە لەگەڵ حکومەتی عێراق، بەڵکو ئەو تەنها دەیویست کۆمەك لەدەسەڵاتی ئینگلیزەکان وەربگرێ و دۆستایەتی لەگەڵیاندا ببەستێ. ڕەنگە هۆیەکی تری ئەم هەوڵانەی بابەکر ئاغا بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزدا بەمەبەستی ئەوە بوبێ کە لەداهاتوودا ئینگلیزەکان بۆ ڕزگارکردنی ناوچەی پشدەر لەدەسەڵاتی حکومەتی بەعس پشتی بگرن. چونکە خەڵکی ئەم ناوچەیە بەردەوام لەهەوڵی خۆ ڕزگارکردندا بوون لەچەپۆکی ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق. خەڵکی ئەم ناوچەیە چەندین جار دژی ڕەزا شای

کۆنەپەرست راپەڕین و لەو پێناوەدا چەندین شەهیدیان دا. ئەم ناوچەیە لەسایەی دەسەڵاتی بابەکر ئاغادا تا ساڵی ١٩٣٦ بەسەربەخۆیی مایەوە. لەو ساڵەدا بابەکر ئاغا لەگەڵ حکومەتی مەرکەزیدا رێککەوت لەسەر ئەوەی ئیدارەی حکومەت بێتە ناوچەکە، ئەمەش بەچەند مەرجێك:-

١- بەڕێوەبەری ناحیەو سەرۆکی شارەوانی لەخزمەکانی خۆی بن.

٢- تا ماوەی حەوت ساڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە سەربازی نەکەن.

٣-مەشقی سەربازیی لەقەڵادزێ بێ، دوای تەواوبوونی مەشق ئەوجار بۆ شوێنانی تر بگوازرێنەوە.

ئەم ریککەوتنە پاش گوشاری زۆری حکومەت بۆ سەر بابەکر ئاغا داسەپێنرا، بەڵام بەئاشکرا لاوازیی دەسەڵاتی حکومەتی عیراقی لەو کاتەدا لەناوچەی پشدەر دەبینرا، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بووبێ. خەلکی ناوچەکەش تا ماوەیەکی دوورودریژ بەچاوی بیگانە سەیری ئیدارەکانی رژیمیان دەکردو هەر بابەکر ئاغایان بەمەرجەعی خۆیان دەزانی.

دوای شۆرشی ١٤ی تەمموزو توندبوونی ناکۆکیو پەیدابوونی حزبایەتیی تەسك، پەشیوی کەوتە ناوچەکەوە، هۆزو تیرەو خیڵ و چینە جیاوازەکان بەسەر حزبەکاندا دابەشبوون، هەر حزبەو کاری بۆ هاندانی لایەنگرانی لەدژی لایەنەکانیتردا دەکرد ، ئەمە سەرەتایەکی خراپ بوو لەناکۆکی، کەئاغاکان بەردەوام رۆلی خراپیان تیدا دەبینی. چونکە

لەسەردەمی حوکمی ئەواندا هیچ جوتیارێك مافی مولکایەتیی زەوی نەبوو، جگە لەوەی ڕێگربوون لەکاری بازرگانی، بەتایبەتی کەبازرگانەکە لەخۆیان نەبا. دانان وکردنەوەی بازاریان قەدەغەکرد، بۆیە هەرچەندە چەندین کەسایەتیی ناوچەکە ڕۆلی بەرچاویان بووە لەئاوەدانکردنەوەو پێشخستنی دەڤەرەکەدا، بەڵام نەیانتوانی ببنەخاوەنی تەنها دوکانیکیش، بۆ نموونە لەبیستەکاندا حەوت کەس ڕۆلی گەورەیان لەئاوەدانکردنەوەی قەڵادزێدا بینیووە بێ ئەوەی خاوەنی هیچ مولکێك بن کەبریتین لەحاجی سادق -کە باپیرمە-، خدرە سپیلکە، مەولان، حاجی تاهر، حاجی کەریم، حاجی حەمەرەش، بابەکر ئەحمەد.

بەهاتنی ڕژێمی بەعس بۆ سەرکار لە١٩٦٨دا، ناکۆکییەکان قوڵتر بوون و بەرەو مەرامە سیاسییەکان ئاراستە کران. بەعس هەر لەسەرەتای حەفتاکانەوە ئەم ناکۆکیانەی ناوچەی پشدەری قۆستەوە کەئەو کات پێیان دەگوت: ناکۆکی نێوان نورەددین و میراودەلی بەتایبەتی دوای دەرچوونی یاسای ژمارە٩٠ی سالی ١٩٧٥ کە تایبەتە بەریفۆرمی کشتوکال. هۆکارێکی سەرەکی بۆ سەرکەوتنی پیلانەکانی بەعس لەو ناوچەیە دەگەرێتەوە بۆ پشت بەستنی ڕژێم بەخەلکانی پیاوکوژو نەفسنزم بۆ جیبەجیکردنی بەرنامەکانی.

بۆ نموونە عەریف بابەکر کەئامر مەفرەزەی ئیستخبارات بوو دەیان کاروانی کوردی ئیرانی لەو ڕیگایانەدا تالان کردو چەندین کەسی لی کوشتن و بریندارکردن. کەپیشتر بەئازادی کاروانەکان لەنیوان عیراق و ئیراندا لەریگای ئەم سنوورەوە

هاتوچۆیان دەکرد. نارەحەتکردنی هاوولاتیان لەلایەن عریف بابەکرەوە وای لەخەلکی ناوچەکە کرد لەئەنجامدا لیی راپەرن و لەگوندی گەناو کوشتیان، بەجۆریك کە تائیستا کەس نازانی تەرمەکەی چی بەسەر هات.

دووەم پیاوی رژیم لەو کاتەدا حەمەسوور ئاغای گویزیلی بوو کەبەحسەینی حەمەسوور ئاغا ناسرابوو. ئەو کابرایە لەخراپەکردن بەولاوە، کوشتن و تالان و جەردەیی و ئازاردانی خەلك زیاتر هیچی تری نەدەزانی، لەژیانی خۆیدا ئەوەندە تاوانی کرد کەبەکتیبیك تەواو نابێ.

سییەم پیاوی بەعس کەزۆر بەدلسۆزییەوە نەخشەکانی رژیمی جیبەجی دەکردو وەك سەگی هار لەو خەلکە بەر بوو بوو، عەباسی بایز بالو بوو. ئەم کابرایە بەبنەچە خەلکی گوندیکی ناوچەی سەنگەسەر بوو، دروستبوون و پەیدابوونی بنەمالەکەی بۆ سەردەمی عوسمانیەکان دەگەریتەوە. گوایە پاش ئەوەی عوسمانیەکان دین بۆ ئەم ناوچەیە، لەیەکیك لەگوندەکان بالول ناویك کەشوانیکی گیلۆکە بووە، دەیهینن و وەك سوکایەتیکردن بەخەلکەکە دەیکەنە دەمراست و ناوی دەنین بالول ئاغا، کەباپیری عەباسی بابیزە.

عەباس، دوای ئاشبەتاڵ بوو بەباوەرپیکراوی ئاسایشی قەلادزی و مانگانە ٨ دیناری هەبوو. لەبەر ئەوەی خۆی کەسیکی نەفسنزم بوو، دەستی لەگەل رژیمدا تیکەڵ کرد. رژیمیش توانی گەورەترین سوود لەو کابرایە وەربگری بۆ ئەنجامدانی دزی، جەردەیی، پیاوکوشتن، تالانی، داوین پیسی و... هتد کەتەنها

بەمەبەستی نانەوەی پشێویی و ئالۆزی بوو. بۆ ئەم مەبەستە عەباس هێزێکی پێکهێنابوو تاکو گورجتر فەرمانەکان جێبەجێ بکات. سەرەتا دەستی کرد بەکەمین دانان بۆ هێزی پێشمەرگە، ئەوەبوو لەیەکەم دەستوەشاندنیدا چەند پێشمەرگەیەکی سۆشیالیستی دەستگیرکردو تەسلیمیکردنەوە بەرژێم کەژمارەیان ١١پێشمەرگە بوو، لەو ژمارەیە تەنها یەکێکیان زیندانی کرا، ئەوانیتر هەرهەموویان بڕیاری لەسێدارەدانیان بەسەردا درا، کەناویان ئەمایە: مەحموود حاجی محەمەد پاچکار، حەسەن سوور، خدر حەمەسوور بادینی، حەمەی هەمزە قەجەر، عەبدوللا حەسەن، فەرخە حاجی عەبدوللا، محەمەد مام ئەللارەش گەرمکان (کە لەبەر پیری بڕیاری لەسێدارەدانی کرا بەزیندانی)، ئەحمەد حەسەن پێیان (ئەویش دوایی توانی لەدەست رژێم هەڵێت)، حەسەن مەولوود (کەخەڵکی ئێران بوو).

پاش گیرانی ئەم کۆمەڵە کەسە، کەسوکاریان چونە لای عەباس و پارەو دیارییەکی زۆریان بۆ برد تاکورەکانیان رزگار بکا، هەرچەندە عەباس هەموو پارەو دیارییەکانی لێ وەرگرتن بەڵام هەر بەسێدارەدانی دان.

ئەو خوێنرێژە لەلایەکیترەوە پیاوی بنەماڵە بوو، بەفەرمانی خودی مەسعود بەم کارانە هەڵدەستاو، خۆی لەچەندین دانیشتندا بەئاشکرا وتبووی کەئەو سەر بەبنەماڵەیە.

خۆم لەبرایەکی سەر بەپارتی لەقەڵادزێ، بیستبووم کەعەباس چەکداری پارتییە. لەکاتێکدا ئەو بەردەوام شانازی بەوەوە

دەکرد کەپێشمەرگە دەکوژێ یان دەیانگرێ و تەسلیم بەرژێمیان دەکاتەوەو بەپێکەنینەوە دەیگوت: من راوە پێشمەرگەی یەکیتی دەکەم، تا ئیستا رەنگە زیاتر لە١٠٠ پێشمەرگەی یەکیتیم کوشتبێ.

لەسالی ١٩٨٤دا گفتوگۆ لەنیوان یەکیتی و رژێمی بەعس دەستی پیکرد، لەو کاتەدا من نوینەری یەکیتی بووم، بەمەبەستی راکیشانی سەرۆك جاشەکان بۆلای خۆمان. پەیوەندیمان بەزۆریانەوە کرد، عەباس یەکیك بوو لەو سەرۆك جاشانەی کەبۆ هەمان مەبەست چوینە لای، کەپیشتر لەبۆسەیەکی هیزی پیشمەرگەدا برازایەکی کوژرابوو. من لەگەڵ بەریزان جەنابی مامۆستا مەلا محەمەد دەلگەیی و جەنابی کاك حەمەسوور مینە عەرەب بەناوی پرسەوە چوینە لای لەناحیەی سەنگەسەر. دوای بەخیرهینان کەمیك ئیسراحەت، عەباس رووی کردە من و گوتی: (ئیوەی یەکیتی خەلکم لی دەکوژن و دینە پرسەشم)، منیش یەکسەر بەدەنگیکی بەرز گوتم: (قازانجە کەماویت، ئەگەر فریای خۆت نەکەوی رۆژیك سەرەی تۆش دێ)، دوای ئەم قسەیە عەباس سوور هەلگەراو قسەی بۆ نەکرا، چونکە دلنیا بوو من پشتم بەهیزی پیشمەرگە قایمە. پرسەکەمان جێ هیشت و دووبەدوو کەوتینە گفتوگۆ، لەپیناوی گەیشتن بەئامانجیکی باش چوار جار لەنیوان عەباس و سەرکردایەتی یەکیتیدا هاتوچۆم کرد، لەکۆتاییدا بریاانی سەرکردایەتی فەرموویان ئەم تاوانبارە دەبێ بیتە سەر ریی راست و دەستبەرداری ئازاردانی هاوولاتیان بیت و نەبیتە

كۆسپی بەردەم شۆڕش لەناوچەكەدا. منیش ئەوانەم هەموو پێ‌ڕاگەیاندو پیم گوت: (ئەگەر وا نەكەیت ناتوانی خۆت لەهەرەشەی هێزی پێشمەرگەی یەكیتی بپاریزی).

لەیەكێك لەو شەوانەدا كەدووقۆلی لەگەڵ كورە ١٢ ساڵەكەیدا بۆ گفتوگۆ لەدیوەخانەكەیدا دانشتبووین، بەدەم قسەكردنەوە قاپێك ویسكیمان خواردەوە، كە لەراستیدا بەئەنقەست وامكرد بەشی هەرە زۆری دەرخواردی عەباس بدەم بۆئەوەی نهێنی پێ‌بدركێنم، ئەوە بوو لەو شەوەدا عەباس زۆر سەرخۆشبوو گوتی: (مادام عافوكرام، بائەو راستییەت پێ بڵیم: لەم ژوورەدا- مەبەست دیوەخانەكەیە- ١٣ رۆژ بكوژانی شێخ محەمەد صالح تالەبانی برای هەڤاڵ مام جەلال و هەردوو كچەكەی هێرۆو بەنازم حەشاردابوون).

منیش گوتم: (ئەوەی رۆی رۆی، گرنگ ئەوەیە لەمەودوا خراپە نەكەی). بەلام هەزار رەحمەت لەپێشینان كەگوتویانە تۆبەی گورگ مەرگە*.

وەكو گوتمان بەعس بەمەبەستی دەستیوەردان لەناوچەی پشدەرو نانەوەی ئاژاوەو ڕیگەگرتن لەشۆڕش، پشتی ئەو

---

* شێخ محەمەدصالح تالەبانی، كەخاوەنی گوندی‌كەلكان بوو لەبناری كۆسرەت، لەتەمەنی ٦٠ ساڵیدا بەفەرمانی عەباس لەگەڵ دوو كچیدا هێرۆو بەناز تیرۆر كرا، لەشەوی ٢٩-١٩٨٤/٦/٣٠ سەعات یەكی شەو، كاتێك لەگەڵ خێزانەكەی لەسەر بان نوستبوو. راستە شێخ محەمەد برای مام جەلال بوو، بەلام كابرایەكی خانەدانی دوور لەسیاسەت‌و حزبایەتی بوو لەناو خەلكی گوندی كەلكان زۆر خۆشەویست بوو.

پیاوەو هاوشێوەکانی دەگرت، بەڵام وەنەبێ بەعس تەنها لەناو ئاغاکاندا پیاو کوژی هەبووبێ، بەلکو لەچینی جوتیارانیشدا توانی چەندین کەسی وا بدۆزێتەوە ئەگەر وەکو عەباسیشی پێ نەکرابێ بەڵام بەهەمان شێوە دلسۆزی ئەوان و دوژمنی کورد بوون، لەوانە بابەکری وسوو، کە بەبابەکری جوتیاران دەناسرا ناودارترینیان بوو، هەروەها محەمەد دەرویش باوزیو خلە ژیرسێو عەزەی گوڵە خوار ناوبانگی خراپەکاری و دوژمنکارییان دەرهەق بەخەلك تاکو ئیستا لەسەر زمانی خەلکی ناوچەی پشدەرەو، لەناو چینی رۆشنبیرانیشدا محەمەد حەسەن قەیسی سەرپەرشتیاری قوتابخانەی سەرەتایی، ببوو بەزورناژەنی بەعس. ئەو کابرایە بەردەوام ئەرەشەی لەمامۆستا کچەکانی ئەو ناوچەیە دەکرد تابێن بەبەعسیو دەیگوت ئەوەی نەبێ بەبەعسی، بۆ باشووری عیراق دوور دەخرێتەوە. بەلام کچانی ئەم ناوچەیە هاوشانی برا شۆرشگێرەکانیان لەبەردەم شەپۆلە بۆگەنەکانی بەعسدا خۆراگر بوون.

خوشکە گورجیە هاوسەری شەهید فاروقی مام عەلی نموونەی خۆراگریو ملنەدان بوو لەناو کچان و ژنانی ئەم دەڤەرە، کاتێك وەڵامی ئەو بەعسیەی دابۆوەو گوتبوی: (چتان پێ دەکرێ بیکەن، بەلام نابم بەبەعسی).

لەلایەکیترەوە بەعس تادەهات کیشەی نێوان نورەددین و ئاغاکانی گەورەتر دەکرد، تا بتوانێ لەو نێوانەدا ئەوەندە خوین برژێ کەساریژکردنی زەحمەت بێ، بۆیە تائەمرۆش ئەم گرفتە لەو ناوچەیە درێژەی هەیە.

دوای راپەرینی گەلی کوردستان لە ئاداری ١٩٩١داو گەرانەوەی خەلکی ناوچەکە بۆ سەر زەوی‌وزارو گوندە روخاوەکانیان، دووبارە شەرو هەرا لەنیوان ئەم دوولایەنە بەخەستی دەستی پیکرد، هەرچی حزبە کوردستانی و عیراقیەکانیش بوو لەبری ئەوەی ئاویك بەو ئاگرەدا بکەن، دەستیان کرد بەهاندانی خەلك لەیەکتری و هەلرشتنی پارەو پیی‌ە بۆئەوەی بتوانن زۆرترین خەلك لەزووترین کاتدا لەو ناوچەیە بەلای خۆیاندا رابکیشن. هەر حزبەو شەری بوو لەسەر ئەوەی کەفلان ئاغا یان فلان سەرۆك هۆز یان سەرۆك جاشی دوینێ بکا بەئەندامی خۆی. بۆیە دووبارە خەرمان سوتاندن‌و ئەرومالات بەتالانبردن‌و داگیرکردنی زەوی‌و کوشتن کەوتەوە ناوچەکە.

هەرچەندە ئیستا تا رادەیەکی زۆر ئارامی لەهەموو ناوچەکەدا بەرقەرارە، بەلام لەراستیدا کیشەکە چارەسەر نەکراوە، بەلکو تەنها هودنەیەك هەیەو شەرەکان بۆ کاتیکی‌تر دواخراون، چونکە داهاتی رۆژانەی زۆربەی خەلکی ئەو ناوچەیە لەکشتوکال‌و زەوییەوەیە، کەئەمەش ناوەرۆکی کیشەکەیە، نابی ئەوەشمان لەبیربچێ کەئەم شەرە گەورەیەی نیوان یەکیتی‌و پارتی لەدوای راپەرین، سەرەتاکەی لەم ناوچەیەوە دەستی پیکردو لەسەر ریزیك دوکان بوو !! کەتییدا چەندین تیکۆشەری گەلەکەمان شەهید بوون، لەوانە شەهید عەلی نەبی‌ومام جوتیار. بیجگە لەوەش ئەم ناوچەیە پاش ئەوەی لەلایەن رژیمەوە ویرانکراو ژیرخانی ئابووری توشی تیکشکانیکی گەورە بوو، کە

ئەنجامدا بێکاری و نەدارییەکی زۆری لێکەوتەوە، کوردیش دێرینە گوتویەتی: (کاسەی پڕ، ئاشتی ماڵە).

بیری حزبایەتیی تەسك وایکرد کەزۆر لەسەرۆك جاش و ئامر فەرزە و پیاوکوژەکانی دوێنێ، ببن بەخاوەن دەسەڵات و بەرپرساو لەناو شۆڕشدا. لەوانە عەباس کە تاپێش راپەڕین خاوانبارێکی گەورەی ناوچەکەبوو بەلام پاش راپەڕین بوو بە یەکەم پیاوی پارتی لەناوچەکەدا. جگە لەوەی کەعەباس بەرەسمی و بەئاشکرا دەستی لەگەڵ ئیتلاعاتی ئێرانی تێکەلکردبوو، ماڵەکەی لەمەر سەنگەسەری بوو بەبارەگای ئاشکرای ئیتلاعات، بەجۆرێك کەجەماوەر سەرسام بوون بەوەی کەکۆماری ئیسلامی چۆن پشت بەم پیاوە خوێنرێژە دەبەستی لەکاتێکدا دروشمی بەرگری لەچەوساوەکان (*الدفاع عن المستضعفین*)ی هەلگرتووە؟! بەلام راستە، لەسیاسەتدا ئەخلاق نییەو ئەگەر بتەوێ سیاسەتەکانت سەرکەوتوبێ دەبێ ئەخلاق و ویژدان بخەیتە لاوە. چونکە بەرژەوەندی چەقی کاری سیاسییە، سیاسەتیش کۆی رێگا و شوێنەکانی پاراستنیەتی.

*بەرژەوەندی عەباس لەم کارەدا چەند خالێك بوون:-*

١- دەسکەوتنی پارەوپول.

٢- پاراستنی دەسەلاتی خۆی.

٣- خۆ پاراستنی لەجەماوەرو یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

هەرچی ئێرانیشە، ئەوە ئاشکرایە بەرژەوەندییەکەی چییە، کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر حزبە کوردییەکانی ئێران و عێراق و دەستوەشاندنە هێزی پێشمەرگەی کوردی ئێرانی. بەلام خوا

دوعاو هاواری هەژارانی قبولکرد، پاش ماوەیەکی کەم خوشك و کچێکی عەباس رەدووکەوتن و هەریەکەو دەستی لاویکی گرت و هەلاتن.

پاش فراوانبوون و تۆکمەبوونی دەسەلاتی یەکێتی لەناوچەکەدا بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەی روویاندا، عەباس هەستی بەهەرەشەی جددی کردو زانی ئەگەر فریای خۆی نەکەوی کەس ناتوانی رزگاری بکا، بۆیە بەفەرمان و کۆمەکی بنەماڵەی مەلا مستەفا خۆی گەیاندە باوەشی کۆماری ئیسلامی و هەلات. لەئیران پیشوازییەکی گەرم وگوریان لیکرد کەچاوەروان نەدەکرا. نەك هەر ئەوەندە بەلکو لەهەموو رووێکەوە دەسەلاتیان دایە، هەر لەسنووری تەمەرچیان تا دەگاتە چۆمان تا بارەگاکەی لەخانە (پیران شهر) بەو سپیردرا. ئەویش دووبارە بەئارەزوی خۆی لەو سنوورانە دەستی کردەوە بەدزی و جەردەیی و کوشتن و برین. تاکە بیانووی ئەو کۆمەکەی ئیران بۆ عەباس و بۆ بەخشینی ئەو دەسەلاتە فراوانە پێی، ئەوەبوو کەعەباس دۆستی دیرینی کۆماری ئیسلامییە. خراپەکاریی عەباس و چەکدارەکانی تەنها کوردی عیراقی نەدەگرتەوە، بەلکو ئەو لەو پیاوانەبوو کەدەلین: (نانی لەکوشتندایە). بۆیە لەمانگی تەمووزی سالی ۲۰۰۰ کەسوکاری عەباس و چەکدارەکانی، هاوولاتی کوردی ئیران (ئاکۆ حەسەنپور) دەکوژن. لەئەنجامدا خەلکی خانە لییان رادەپەرن و هیرش دەکەنە سەر بارەگاو مالی عەباس و تالانیان دەکەن، پاشان هەمووی دەسوتینن بەدوو سەیارەوە. لەم راپەرینەدا

چەندین هاوولاتی خانە زامدار دەبی. عەباس یەکسەر ناوچەکە جێدیلی و هەلدی، کۆماری ئیسلامی سوپییەکی تایبەت لەمیراوە بەهانای بنەمالەی عەباسەوە دەنیری، پاشان هەر هەموویان رەوانەی هەولیر دەکاتەوە بۆ ژیردەسەلاتی بنەمالە، ئەوەش بەپیی ئەو پەندەی دەلی: (مالی قەلب سەر بەساحیبیەتی).

ئیستا تاران بەم جۆرە باسی عەباس دەکاو دەلی: (اشراری عراقی اصل). بەم شیوەیە دەستی خۆی لەتاوانەکانی عەباس دەتەکینی. بەلام ئایا بنەمالەی بارزانی چۆن پاساوی تاوانەکانی ئەو پیاوکوژە دەدەن؟

## بۆچی لەدەست بنەمالەی بارزانی و ئیتلاعاتی ئیرانی بەرەو تورکیا هەلاتم:

*تیبینی:*

*لەسەر بەرگی دووەمی کورد دووژمنی خۆت بناسە لاپەرە ٥٩*

ئەو کاتەی لەئیران بووم لەتاران لەگەرەکی گەوهەر دەشت، بەیانیەك سێ لیپرسراوی کۆماری ئیسلامی هاتنە لام، یەکیکیان ناوی حسەین بوو کە لەدەفتەری سەرۆك وەزیران موسەوی سکرتیر بوو. ئاغای حسەینی وتی: ئیمە نزیکەی ٧ سالە دەنگوباس لەسەر تۆ کۆدەکەینەوە، بۆیە زانیاریەکیی تەواومان لەسەر تۆو بنەمالەکەتان هەیە. پاشان دەستی کرد بەباسکردنی بەشی زۆری کەس وکارەکانم بەناوو ئیش وکارەکانیانەوە، بەجۆریك شارەزایان بوو کەسەرسامی کردم.

لێپرسراوە ئێرانیەکە وتی: موعامەلەی کورەکانت تا ئیستە سێ جار تەواو بووە، بەڵام ئیمە ریگەی لی دەگرین و هەلیدەوەشینینەوە هەمووشی بۆ ئەوەیە دەستمان بەسەرتدا زاڵ بیت، ئیمە چاوەریی ئەو رۆژەمان دەکرد کەدییتە بەر دەستمان.
ئینجا لەدریژەی قسەکانیدا وتی: ئیمە بەرنامەمان ئەوەیە کەریکخراویك دابمەزرینین، بۆیە دەبێ لەگەلماندابی و ئەم کارەمان بۆ بکەیت، چونکە سەرپەرشتیەکەی دەدەینە دەست تۆ، ئیمەش هەموو هاوکارییەکت دەکەین تانیوەی جەماعەتی جەلال و مەسعود پیوەندیت پیوە بکەن بەهەموو جۆریك پشتگیریت دەکەین تا لەکارەکانتدا سەر کەوتووبیت و ببیت بەسەرکرتیری بەهیزترین حزبی کوردستان. سەرەتا ملیۆنیك دۆلارو بیست ملیۆن تمەن دەخەینە بەردەستت و منالەکانیشت لەدانیشگە دادەمەزرینین و لەرامسەر خانویان بۆ دابین دەکەین.
پاشان وتی: وەلام بۆ هەموو کەسوکارت بنیرە تا لەیەك شوین کۆیان بکەینەوە. ئەو پیشنیارە گڵاوەی کۆماری ئیسلامی کەدژی نەتەوەی کوردە وای لی کردم هەلیم بۆ ژیر دەسەلاتی پارتی ئەمەش بەو هیوایەی سەرکردایەتیی پارتی کۆمەکم بکات بۆ ئەوەی خۆم و مال و مندالم لەکۆماری ئیسلامی و بەرنامە دوژمنکارییەکەی بپاریزم.

کاتیك بەسەلامەتی گەیشتینە گوندی سلیڤانە، یەکسەر لەگەڵ کاك دلشادو نیچیرڤان بارزانی کۆبومەوەو باسی بارودۆخی خۆم بۆکردن و پیم گوتن: من بۆیە رام کردووە چونکە ئامادە نەبوم ببمە پیاوی ئیرانو، بەم نیازە پەنام بۆ خزمەت

برای گەورەمان کاك مەسعود هیناوە تا لەریگەی تایبەتی خۆیەوە بەرەو تورکیا دەربازمان بکات، بەلام تکام وایە تاشوینمان ئاشکرا نەبووە بەزوترین کات کارەکەمان بۆ جێ بەجێ بکەن. وەلامیان داینەوەو وتیان: بەزوترین کات وەلامت ئەدەینەوە.

دوای دوو سەعات بەسەیارەی خودی کاك مەسعود ئیمەیان گواستەوەو بردیانینە بارەگای هاوینەهەواری مەکتەبی سیاسیی پارتیو لەوێ بەناوی مالی شیخ ناساندیانین. جیی باسە کە لەو ماوەیەدا خزمەتیکی زۆریان کردین، بەلام ئیمە لەراستیدا هەرچاوەرێ بووین بۆ تورکیا بەریمان بکەن. خەلکی گوندی رازان هاتوچۆیان دەکردم، بەلام من نەمدەویرا سەردانی کەس بکەم نەودك ئاشکرا ببم.

زۆر شەو لەسەعات نۆ بەدواوە سەردانی کاك عەلی عەبدوللام دەکرد. ماوەی چوارمانگ هەروا ماینەوە، تا ئیوارەیەك کاك رەنجبەری برازای مامۆستا عەلی عەبدوللا سەردانی کردینو وتی: مامم سەلامت لیدەکاو منی ناردۆتە خزمەتت تا هەندێ قسەی ئەوت پێ رابگەیەنم، ئیمرۆ حاجی مستەفەوی لیپرسراوی ئیتلاعاتی ئازربایجانی غەربی لەبارەگای مەکتەبی سیاسی بوو، لەبەر ئەوەی بەفر ریگەی هاتوچۆی بریوە نەهاتە خزمەتت. ئیستا چاوەروان دەکەن تاریگاکە پاکدەکریتەوە بۆ ئەوەی بگەنە لات، یان تۆ بییتە بارەگای مەکتەبی سیاسیی تا چاوت بەحاجی مستەفەوی بکەویت، چونکە کۆماری ئیسلامی دەزانن تۆ لیرەیت، بەلام نازانن بۆ زویر بوویو بریاریان داوە

لەورمی (رەزائیە) خانویەکی خۆشت بۆ تەرخان بکەن و چیت پێویستە بۆتی ئەنجام بدەن بۆ پشودانی خۆتان.

وتم: لەتاران خەلکی لەحاجی مستەفەوی گەلیک پێی بەرزترم بینی و لەخانویەك زیاتریان بۆ دەکردم، بەلام ئامادە نەبووم دەست بخەمە دەستیان. من پێویستم بەئیوە نییە ریگەی ئیرانم نیشانبدەن، بۆیە هانام بۆ ئیوە هیناوە چونکە بالیکی سیاسی گەلی کوردن، تارزگارم بکەن نەك تەسلیم بەئیرانم بکەنەوەو بمکەن بەسیخور. بەراستی چاوەروانی ئەوەم لەکاك مەسعود نەدەکرد، لەکۆتاییشدا پیم وت: مامت چۆن چاوپۆشی لەوە دەکات لەژیر بالی پارتیدا سیخوری بۆ ئیران بکەم دژی گەلی کورد؟ لە وەلامدا ئوتی: من راسپیراوم ئەوەت پی رابگەیەنم، جەنابت بۆ لەمن تورە دەبیت. کەوای وت بۆم دەرکەوت کەمن زۆر بەتورەیی و گرژییەوە وەلامم داوەتەوەو زیاد لەپیویست دەنگم هەلبریوە.

دوای رۆیشتنی کاك رەنجبەر بروام نەدەکرد ئەمە رای سەرکردایەتیی پارتی بیت، لەبەر خۆمەوە دەم گوت: دوور نییە ئەمە تەنەی پاراستن بێ، یان دەسیسەی ئیتلاعات بێ و لەریگای رەنجبەرەوە بیت. دوای گفتوگۆیەکی زۆر لەنیوان خۆماندا بریارماندا کەخۆم سەردانی کاك عەلی عەبدوللا بکەم تا تی بگەین راستی ئەم هەوالە چەندە. بۆئەم مەبەستە لەشەوی دووەمدا سەعات ٨/٣٠ گەیشتمە بارەگاکەی کاك عەلی داوام لەپاسەوانەکان کرد بمبەنە لای کاك عەلی. بەلام وەلامیان دامەوەو وتیان نوستووە. کاتیك نزیك ژورەکەی کەوتم رووناکی

نەزم بەدی کرد، بەڵام کەپێیان وت کاك رەفیق هاتووە ژورەکەی تاریك کرد. ئینجا بۆم رون بۆوە کەقسەکانی کاك رەنجبەر راستەو ماموستا عەلییش هیچی پێ نییە تاكو لەگەڵمدا گفتوگۆ بکات. ناچار لەگەڵ بازیان و رەوەزی کورم گەراینەوە شوێنی حەوانەوەمان بۆ پشودان و دوان لەسەر ئەوەی چی بکەین باشە. سەرەتا بۆ پوچەڵکردنەوەی پلانەکانی پاراستن و دەزگای ئیتلاعاتی ئێرانی پەیوەندیم بەسەرۆك مەسعود بەهێز کرد ئەویش لەرێگای راپۆرت نووسین دەربارەی بارودۆخی ئێستای کوردستان. هەر هەفتەیەك دووجار بۆچوونی خۆمم ئاراستە دەکرد، تێیدا دڵسۆزیو فیداکاریی خۆمم نیشان دەدا بەرامبەر بەپارتیو بنەماڵەو کۆماری ئیسلامی. تا توانیم بڕوای پێبێنم کەنیازی چوونەدەرەوەمان بۆ تورکیا نەماوە. لەو ماوەیەدا بەنهێنی لەگەڵ سێ کەسی گوندی راژان کۆبوومەوە. باسی ئەوەم بۆکردن کەچۆن بنەماڵەی بارزانی کوردستانیان تەسلیم بەئێران کردووە ئاواش نیازیانە من بەئێران بفرۆشن تا ببمە سیخوری ئێران. لەوەڵامدا هەریەکەیان ئامادەیی خۆی نیشاندا کەمن هەر کاتێك پێویستم پێی بێ تەواو یارمەتیم دەدەن بۆ رزگار بوون. پاراستن لەو ماوەیەدا بڕوای تەواویان هێنابوو کەئێمە لەتوانامان‌دا نییە لەراژانەوە* بگەینە تورکیا. چونکە دوو

* گوندی راژان دەکەوێتە سەر سنووری ئێران تورکیا، ئێران عیراق. ئەم گوندە بەپێ سەعاتێك لەخاکی تورکیاوە دورەو دوو سەعات

ئافرەتمان لەگەڵەو منیش تاقەتی رۆیشتنم نەماوە بەناو بەفری ناوچەی شاخاویدا. لەو ماوەیەدا کاك عومەر دەبابە هات بۆ راژان تاچاوی بەئەنداماني مەکتەبی سیاسیی پارتی بکەوێت. لەو سەفەرەیدا شەوێکیان سەدانی کردم، منیش بارودۆخی خۆمم بۆ باس کردو داوام لێ کرد کەلای سەرانی بنەماڵە بۆم تێبەکەوێت و بەوە قایلیان بکات کەبڕیارم داوە بۆ تورکیا سەفەر نەکەم. کاك عومەر لەم کارەیدا سەرکەوتوو بوو وتبووی کەرەفیق، بەهۆی ناخۆشیی رێگا نیازی نییە بچێت بۆ تورکیا. لەهەمان کاتدا ئامۆژگاری کردم کەناوچەکە بەرەو دەرەوەی سنووری ئێران بەجێ بهێلم.

هەر لەو ماوەیەدا زووزوو چەند کەسێك سەردانیان دەکردم. کەلێرە تەنها دوو کەسیان باس دەکەم.

یەکەمیان پاراستن بوو بەکاری تایبەتی خۆی دەهاتە لامان، دەنگو باسی دەورو بەری بۆدەهێنام لەهەمان کاتدا قسەکانمی دەکردە راپۆرت و بۆ سەروی خۆی دەنارد. کاتێك لەگەڵی دادەنیشتم باسی راپۆرتەکانی خۆمم بۆدەکرد کەبۆ خودی مەسعودم دەناردو، دەمگوت: مەلا مستەفای بارزانی کوردی

---

لەخاکی عیراق. لەزستانداو بەتایبەت لەشەودا زریان ورەهێڵە بەیەکجاری رێگەکە دەگرێ.

بارەگای م.س لەهاویندا لەدەرەوەی گوندەکە بو بەدووری سێ کیلۆ مەتر، لەزستاندا دەگوازرێتەوە ناوەوەی گوندەکە. کە لەدوو ژووری هۆڵێك پێك دێ، خانووی دووەم ئەم بارەگای پێشمەرگە بوو ئەم چێشتخانە.

بەجیهان ناساند، هەموو کورد دەبێ بەفرمانی سەرۆك مەسعود بجوڵێتەوە، لەو رۆژەوەی کاك نێچیرڤان بۆتە لێپرسراوی پاراستن هەموو جوڵەیەکی بەعس ئاشکرا بووە. بەردەوام بەم جۆرە قسانە ئەو کادرەی پاراستم هەڵدەخەڵەتاند، لەهەمان کاتدا رێگاو شوێنم دادەرشت بۆ هەڵهاتن بەردو تورکیا لەدەست بنەماڵەی بارزانی و دەزگای ئیتلاعاتی کۆماری ئیسلامی.

لەدواییدا بۆم دەرکەوت ئەو کابرایەی هەر بەناو کادرە لەپاراستیدا پاراستنە، لەپاشاندا ئاشکرابوو پەیوەندی بەبەعسەوە هەبووە. ئەم کابرایە لەژێر باڵی پارتیدا ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکی کوردو عەرەبی دەدا. لەساڵی ١٩٩٠ لەهەولێر هاتە لام و وتی: کاك مەسعود ناردوومی، بەڵام من دەرگام لێ نەکردەوە.

دووەم کەس کوردێك بوو لەوانەی دڵسۆزی پارتی بوون، ئەم پیاوە وای بۆدەچوو کەهەتا بنەماڵەی بارزانی مابێت ئەوا کوردستان ئازاد نابێت. هەفتەی دوو جار سەردانی دەکردم، بەراستی زۆر جێی بڕواو متمانەم بوو، هەموو دەنگوباس و گۆڕانکارییەکانی پێم دەگەیاند بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بەخۆمەوە هەبوو. لەبەر ئەوە داوام لێکرد سەردانەکانی کەم بکاتەوە مەگەر زۆر پێویست بێت. هەندی جار بەشەو رەوەز یاخود بازیانی کورمم دەنارد بۆلای. ئێستا ئەم پیاوە لەهەولێرە.

دوای ئەم رووداوو گیروگرفتانە سوپاس بۆ خوا لەدەستی کۆماری ئیسلامی و چەتەکانی بنەماڵەی بارزانی رزگارمان بوو بەسەلامەتی گەیشتینە تورکیا ئەمەش بەهۆی سێ کوردی

دڵسۆزی خەڵکی دێی ڕاژان. ئەمانە دوای ئەوەی بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێرانەوە کەچۆن بنەماڵەی بارزانی دەیانەوێ بمدەنە دەست ئێران زۆریان بەلاوە گرانبووو ئامادەیی خۆیان پیشاندا کەسەعات دەی شەوی پاشتر لەگەڵماندا بێن. یەکێکیان وتی کەرۆژی پێنج شەممەی داهاتوو زەماوەند دەکات، لەبەر ئەوە داوای لێکردم کەبازیانی کوڕمی لەگەڵدا بنێرم بۆئەوەی قسە لەگەڵ دایکی بکاتو گواستنەوەی بووك دوابخات.

کاتێك من ڕەزامەندیم نیشانداو بازیان چوو بۆماڵی پیاوەکە، دایکی دەستی بۆ سنگی خۆی بردو بەکوڕەکەی خۆی وت: شیری ئەم مەمکانەمت پێ حەرام بێت ئەگەر بەدڵو بەگیان یارمەتی ئەم ماڵە شێخە نەدەیت شایانی باسە کە لەوێ بەبنەماڵەی شێخ ناسرابووین.

ئەوە بوو بەپشتیوانی خواو بەهۆی یارمەتیی ئەم کوردە خەمخۆرانە، بەسەلامەتی گەیشتینە سنووری کوردستانی خۆمان.

لێرەدا خوێنەری بەڕێز بۆی ڕووندەبێتەوە کەبۆچی لە١٩٩١/٣/١٣دا کاتیك مەسعود پێی گوتم: جەولەیەکم بەدەستەوەیە لەکوردستان، پێم خۆشە لەگەڵم بێت، چونکە تۆ وەزیری دەستە ڕاستی ئاێندەی.

من لەوەلامدا پێم گوتبوو:- دەبمە فەراش بەلام لەگەڵتا نایم. چونکە ئەو بنەماڵەیە ئەگەر بتکەنە وەزیریش ئەوا هەر دەتبەستنەوە بەداگیرکەرانی گەلی کورد. لەو ڕوداوەوە من بەیەکجاری دڵنیابووم کەئەم بنەماڵەیە ماهیەتیان هەر ئەوەیە

پیاوی داگیرکەران بن و سیخوریان بۆ بکەن و، هەر کاتێ خۆیان بوون بەکلکی درگیرکەران ئەوا گەلی کورد بەگشتی دەبێ لاسایان بکاتەوە، بۆیە لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا خۆیان ئالقە لەگەڵی ئیتلاعات بوون، قبوڵیان نەدەکرد کوردێك ئامادەنەبێ بەقسەی تاران بکا لەبەر بەرژەوەندی گەلی کورد.

## کۆمپانیا جیهانییەکنی نەوت

## لە پشت خیانەتی ۳۱ی ئابەوە بوون

تێبینی لەسەر بەرگی دووەم کورد دوژمنی خۆت بناسە ل ۳۰۲-۳۰۳-۳۰٤ لەسەر ۳۱ ئاب:

قسەیەك هەیە دەڵێ سەلماندنی شتی روون قورسترە لەسەلماندنی شتی لێڵ و تاریك. ئەگەر ئەم قسەیە لەبواری فەلسەفەو فکردا راست و تەواو بێ، ئەوا لەبواری سیاسەتدا تاڕادیەکی زۆر راست نییە. بۆیە رووداوە سیاسییەکان لەمێژوودا بەشێکی هەرەزۆریان یەکلاکردنەوەو ئاشکراکردنی نهێنییەکانیان ئاسانە. بەمەرجێك بەرۆحێکی بابەتییانەی بێلایەنانە قسەی لەسەر بکەین و قسەکەر پێشوەخت هیچ بڕیارێکی لەسەر رووداوەکە نەدابێ، تانوسینەکەی زۆرترین راستی بگرێتە خۆی و دووربێ لەسۆزو عاتفە.

ئەمڕۆ زیاتر لەچوار ساڵ بەسەر ترسناکترین و گەورەترین روداودا رۆیشتووە لەکورستانی پاش راپەڕینەوە، یان راستتر وایە بڵێم ترسناکترین رووداوو هەڕەشە لەدوای ئاشبەتاڵەوە

کەرووبەڕووی گەلەکەمان و شۆڕشەکەی بۆتەوە خیانەتی گەورەو مەزنی ٣١ئابە. ئەگەر ئێمە بمانەوێ مێژووی خەبات و رزگاریی گەلەکەمان لەسەر بنەمای رووداوی گەورەو مەزن پۆلێن بکەین و، هەر رووداوە بکەینە سەرەتای قۆناغێکی‌ترو، هەر وەکو چۆن ١٩٩١/٣/٥یەکەم رۆژی راپەڕینەو سەرەتای قۆناغێکی نوییە بەبەراورد بە٣/٤ی هەمان ساڵ، ئەوا بەهەمان شێوە، پێم وایەو دڵنیام لەوەی کەلە٣١ی ئابەوە قۆناغێکی نوێ و جیاواز هاتە کایەوە، قۆناغێك کەپێویست دەکا لەسەر هەموو کوردێك و، هەموو مرۆڤ دۆستێك بەخۆیدا بچێتەوەو بیربکاتەوە ٣١ی ئاب بۆ؟! گەلێك کە لەراپەڕینێکی جەماوەری بێ وێنەدا هەموو دام ودەزگاکانی بەعسی لەماوەیەکی کورتدا تێك شکاندو لەبری دکتاتۆریەت و تەعریب و تەبعیس و تەهجیر دروشمی ئازادی بەرزکردەوە، گەلێکی ئاوا چۆن قبوڵی ئەوە دەکا یەکێك لەحزبە گەورەکانی، لەو حزبەی کە لەهەڵبژاردنێکی ئازاددا نیوەی گەل دەنگی پێدا، چۆن قبوڵی دەکا هەمان ئەو دەبابەو سەربازانەی برژێنێتە سەر کەتادوێنێ گوندەکانیان دەروخاندو شارەکانی کاولدەکرد؟! ئەی چۆن حزبێك گوایە دۆست و لایەنگرو ئەندامانی لەسەر بنەمای کوردایەتی کۆکردۆتەوەو کار بۆ رزگاری نەتەوەیی دەکا لەهەمانکاتدا سوپاسی درەندەترین و سەرسەختترین دوژمنی گەلەکەی دەکا؟!

ئەی ئەو حزبانەی بەقسەو رۆژنامەو راگەیاندنیان مزایەدە بەسەر جەماوەرەوە دەکەن و خۆیان بەدوژمنی سەرسەختی سەدام دەناسێنن، بەچ بیانویەك و بەچ پاساوێك وەڵامی ئەو

خیانەتە بێ وێنەیە لەمێژووی گەلەکەماندا دەدەنەوە؟! نازانم ئەبێ وەڵامی ئەو هەموو مەلاو شێخە لەرۆژی قیامەتدا بەرامبەر خوای گەورە چی بێ کاتێك پێیان دەڵێ بۆ بەم ئایەتەتان نەکرد (مالکم لاتقاتلون فی سبیل الله والمستضعفین فی الارض)؟ رۆشنبیرە بێدەنگەکان، ئەوانەی ئامادەن لەسەر هەموو شتێکی وردودرشت قسە بکەن‌و گۆڤار دەربکەن‌و کتێب بنووسن، ئەوانە چۆن لەبەردەم ئەو روداوە گەورەیە قەراقوپی لێدەکەن؟ حاڵی ئەوانە بەراستی وەکو چیرۆکی پیریژنەکەو ئەفلاتون وایە، کەدەگێرنەوە گوایە رۆژێکیان پیریژنێك بەلای چالێکدا دەروا، دەبینێ پیاوێك کەوتۆتە چالەکەوە، پیاوەکە دەستی بۆلای دریژدەکاو داوای یارمەتی لێدەکا، لەوکاتەدا پیریژنەکە لێی دەپرسێ تۆ ئەفلاتۆنی فەیلەسوف نیت؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ ئەوجار پیریژنەکە پێدەکەنێ‌و دەڵێ: تۆ لافی ئەوە لێدەدەی شت لەسەر فەلەك‌و ئاسمان دەزانی، بەڵام ئاگات لەژێر پێی خۆت نییە ؟ بۆیە دەرواو تەنها جێی دیلێ. ئەو چالەش کەدوژمنانی گەل لەریگای حزبی بنەماڵەوە لە٣١ی ئابدا، بۆ گەلەکەمانیان نایەوە، ئەوەندە گەورەبوو کەهەر ئەم‌و ئەوی نەدەگرتەوە، بەڵکو من‌و تۆش‌و هەموو کوردیکی نیشتمانپەروەرو هەموو عێراقییەکی شۆڕشگێری دەگرتە خۆی. چونکە لەراستیدا ئەم کارەساتە تاکتیکیك نەبوو پارتی لەبەرامبەر یەکیتیدا بیکا بۆ ئەوەی هەولیر بخاتەوە ژیر کۆنترۆڵی خۆی، بەڵکو ئاشبەتالیکی ئاشکرابوو لەسەر هەمان شیوەی ١٩٧٥، بەڵام ئەم جارەیان

زەمەنەکە گۆڕابوو حزبە شۆڕشگێرەکان نەیانهێشت ئەو پلانە سەر بگرێ.

منیش وەك کوردێك و ڕۆشنبیرێك و بێلایەنێك و کەسێکی خاوەن تاقیکردنەوەو مێژوویەکی دووروودرێژ لەگەڵ بنەماڵەدا، بەئەرکی سەرشانی خۆم زانی کەراوبۆچونی خۆم و هەلویستم لەونووسینەدا بخەمەروو. چونکە هیچ شتێك لەوە ترسناکتر نییە گەلێك کارەسات و خیانەت و دوژمنەکانی خۆی لەبیر بکات، تارادەی ئەوەی بەلایەوە گرنگ نەبێ بزانێ پێشکەوتنی دەبابەی دوژمن یانی چی و سوپاسکردنی بکوژی گەلێك چ واتایەکی هەیە؟

سەرەتا پیم باشە بەسادەترین و ناراستترین لێکدانەوە بۆ خیانەتی هەرە گەورەی ٣١ی ئاب دەست پێبکەم و بیکەمە دەروازەی چونە ناو باسەکەوە، ئەویش ئەو ڕایەیە کەژمارەیەك لەخەلکی سیاسی و بەناو ڕۆشنبیر بەردەوام دووبارەی دەکەنەوە، کە گوایە ئەم خیانەتە ئەنجامیکی ڕاستەوخۆی شەری ناوخۆیەو، بنەماڵە لەوپەری ناچاریدا پەنای بۆ بەعس برد. ئەم ڕایە پێش هەموو شتێك هەلاتنە لەهەلویست و خۆدزینەوەیەکی ئاشکرایە لەبەرپرساریی مێژوویی و خۆشاردنەوەیە لەجەماوەر. چونکە بەغداو بەعس تاکە ڕیگای بەردەمی بنەماڵە نەبوو، بەلکو دەکرا ڕیگای قەلاو منارەیان گرتبا بۆ ئاشتی و ڕیککەوتن، هەمووشمان باش دەزانین کەبنەماڵە ئەم شەرەی لە١٩٩٤ داگیرساند لەپیناوی پارەی ئیبراهیم خەلیلدا بوو نەك شتیتر. بنەماڵە ئەو کاتەو ئیستاش ئەگەر بیەوێ شەر رابگرێ و ئاشتی

بۆ ناومالى كورد بگيريتەوە ئەوا دەكرێ بەيەك بريار ئەم كارە بكا، گەراندنەوەى داهاتى گەل بۆ هەمو حزبەكانى گەل و وازهينان لەجاشايەتى بۆ ئەمو ئەوى بيگانە.

بۆيە من لەهەموو ئەوانە دەپرسم كەبەو بيانويە خۆيان لەهەلويستى نيشتمانى دەدەزنەوە، بۆچى لەئاست شەرى ناخۆدا هەلويستتان نەبوو؟ بۆچى هەرزوو ريگەتان لەو شەرە نەدەگرت و هەولى جديتان نەدەدا بۆ ئاشتى و ئەو لايەنەش ئامادە نەبوو شەر رابگرێ ئاشكرا تان نەكرد بۆ خەلك و دژمنايەتيمان بۆى رانەگايەند، بەپيى ئەم ئايەتە پيرۆزەى *(وإن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما، فأن بغت احداهما فقاتلو التى تبغى)*؟ بەلام لەراستيدا ئەم حزبانە بەتايبەت ئيسلاميەكان نەك هەروايان نەكرد بەلكو گەورەترين قازانجيان لەدريژبوونەوەى شەرەكەدابوو، چونكەلە كاتيكدا دوو حزبە گەورەكەى كوردستان بەيەكترييەوەسەرقالبوۆن ئەوان بەرنامەكارى خۆياندا دادەرشت و بەئارەزووى خۆيان تەراتينيان دەكرد. جيالەوەى كەخودى شەرەكە بۆ ئەوان زۆر پيويست بوو تا خەلكى لەكوردايەتى سارد بكەنەوەو لەناو حزبى ئيسلاميدا، گوايە حيزبى ئيسلامى ئاشتيخوازەو گەل لەشەر دەپاريزێ. لەكاتيكدا حزبە ئيسلامييەكانى ئەفغانستان داروبەردى ئەم ولاتەيان بەسەر يەكتريدا روخاند.بۆيە ئەوان ئەگەر راستدەكەن دەبو هەر سەرەتا ريگايان لەو شەرە گرتبا يان هەلويستيان لەبەرامبەر لايەنى شەرخوازدا بووبا.

ئەگەر بیانویان ئەوە بێ ئیستا نازانن کێ شەری هەلگیرساندو کێ رای نەگرت، خۆ روون و ئاشکرایە کەئەم شەرەبۆ دریژەی کیشاو بنەمالە چۆن دەسبەرداری پارەی ئەم گەلە نابن ! شەری ناوخۆ تارادەیەك سروشتییە لەنیوان دوو حزبی شۆرشگیری نەتەوەیی، بەمەرجیك هیچیان کار بۆ دژە بەرژەوەندییە نەتەوەییە بالآکان نەکات. هەر لەکوردستانی خۆمان حزبی دیموکرات وکۆمەلەی ئیرانی ماوەیەکی دووروودریژ شەریان بوو، بەلآم هیچیان بیریان لەوە نەکردەوە پەنا بۆ تاران بەرن دژی ئەوی تر، لەکاتیدا هیچ رژیمیك بەئەندازەی بەعسی عیراق و خودی سەدام دوژمنکار نییە بەرامبەر گەلی کورد، ئەنفال و هەلەبجەی تەعریب و تەبعیس و تەهجیر لەهیچ ناوچەیەکی تری کورد نشین بەو شیوەی کوردستانی باشور رووی نەداوە لەمیژوودا.

رای دووەم کە لەهی یەکەم ساکارترە،ئەوەیە دەلێ دەبایەو گاردی کۆماری کەهیرشیان کردە سەر کوردستان ویەکیتی و، وەلآمی هیرشی ئیران بوو بۆسەر کۆیەو حزبی دیموکرات.

ئەم رایە گەرچی بەراوردو خالی هاوشیوەی تیدایە، بەلآم لەراستیدا هیچ بنەمایەکی توکمەی نییەو، وەکو ئەوە وایە بلیی سەدام ومانديلا وەکو یەك وان، چونکە دەیەها خالی هاوبەشیان هەیە. بۆیە ئەم رایە جگە لەوەی بایی فلسیك راستی تیدا نیبە، لەهەمان کاتدا گالتەکردنە بەعەقلی خەلك، کورد گوتەنی درۆیەکی شاخدارە چونکە:-

- ـەشـکری ئـیران لەسـەر داوای یـەکیتی نـەهات بـۆ سـەر
ـێنـۆکـرات، بۆیـە لـەبری سوپاسـکردنی سـەرۆکی ئـیرانیو،
ـەسـعود کـردی بەرامبـەر سـەدام بەشـی هـەرە زۆری
ـەرکردایەتیو کادیرەکـانی یـەکیتی ئیدانـەی هەلویسـتەی
کۆماری ئیسلامیان کرد.

٢- یـەکیتی وەکـو پیشـتر باسمـانکرد زوو حزبـی دیموکراتـی
ئاگادار کردەوە لەو هیرشەی کۆماری ئیسلامی.

٣- پیشمەرگەی یەکیتی نەك هەر هاوکاری لەشکر کیشیەکەیان
نەکردوو پیشی نەکەوتن، بەلکو کۆمەکی حزبی دیموکراتیان
کرد.

٤- لەشکری ئیران نە کوردی ئەنفال کردووەو نە کیمیابارانی
شارەکانی کردووەو نە دییەکانی روخاندووەو نەوەکو لەشکری
سەدام درندەو داخ لەدلە بەرامبەر بەکورد.

٥- لەشکری ئیران لەهەموو حالەتیکدا بیگانەیە لەکوردستانی
عیراقو بەزووترین کات پاشەکشەی کرد.

٦- ئیران پـەلاماری یـەك ناوچـەی دیـاری کـراوو بچوکـی داو
لەدوورەوە بۆردوومانی کرد.

٧- هیچ کات یەکیتی فەخری بەو کارە نەکردووە، بەلام پارتی
نەك هەر فەخری پێ دەکات بەلکو هەموو سالیك لەیادی ئەو
رۆژە شومەدا ئاهەنگ دەگیرێ.

٨- زیـانی حزبـی دیموکـرات وەکـو ئامـاژەمـان پیـدا، تەنـها دوو
مریشـكو رووخـانی دوسـێ خـانوو بـوو. لـەکاتیکدا گـەلی کـورد
بـەهۆی خیانـەتی ٣١ ئـاب پەرلـەمانو پیـیتـەختو سـەدەها

پیشمەرگەی قارەمانی لەدەستدا، جگە لەوەی لەدەرەوە کوردی خستە هەلویستیکی شەرمنەوە، چونکە سەرۆکی دووەم حزبی کوردستان کە لەهەلبژاردنی پەرلەماندا گوایە زۆرینەی دەنگی هینابو سوپاسی سەدامی کرد بۆ ئەو هاوکارییە بێ وینەیە لەگەڵ گەلی کورددا بۆ دەرپەراندنی حزب و دامو دەزگاکانی هەزارەها شەهیدی ریگای رزگاری !! بۆیە ئەوانەی لەو خیانەتە گەورەیە بێدەنگ بوون و نەویران قسە بکەن، ئەوا با خۆیان بۆ میژوو هەلبگرن، چونکە میژوو نەك هەر بەزەیی بەکەسدا نایەتەوە بەلکو هەموو ئەوانە رسوا دەکا کە لەسەر گەلەکەیان بەدەنگ نەهاتوون جا با بەهەر بیانویەك بێ و، بنەمالەش بەهەر بیانویەك پیش دەبابەکانی گاردی کۆماری کەوتبن و ئیستا هەر پاساویکی بۆ بیننەوە، لەسوکایەتی و ریسوای زیاتر بۆیاننانووسرێ. با هەموو ئەوانەش کەبێ دەنگ بوون و وەك نەعامە لە ترسان سەریان خستۆتە ناو چالەوەو لاشەیان بەدەرەوەیە، با باش بزانن ئەگەر ئەوان پەیوەندییان بەشەرو خیانەتیشەوە نەبی، ئەوا دەرئەنجام شەرو خیانەت ئەوانیش دەگریتەوە، ئاگری گەورەش تەرو وشك جیاناکاتەوە. لیرە بەدواوە من لەلای خۆم لەسەر ئەو خیانەتە دەخەمە بەردەست گەلەکەم، ئەو گەلەی بەلینم پیداوە دوژمنەکانی بۆ ئاشکرا بکەم و دریغی نەکەم لەخزمەتکردنی. پیشوەخت و بەر لەوەی بچینە ناو وردەکاریی بۆچوونەکانم لەسەر خیانەتی ٣١ ئاب، با خوینەری بەریز بزانێ کەمن ئەو کارەساتە بەبەرنامەیەکی گەورەتر دەزانم لەوەی کەتاکتیکیکی پارتی بێ بۆ گرتنەوەی

ـەولیرو دەرپـەراندنی یـەکیتی. بـەڵکو ئـەم کارەسـاتە بەشـێکە لەسیاسـەتە نەگریسـەکانی کۆمپانیا نەوتییـە گـەورەکانی جیـهان کــە لەلایــەن پینــج دەولەتــە هەمیشـــە ئەندامــەکانی نەتــەوە یەکگرتووەکانـەوە سەرپەرشـتی دەکریـن، بەتایبـەتی ئـەمریکا و بەریتانیا. چونکە ئەم ولاتانە بریاریانداوە کەبەهیچ جۆریك نابێ بیرە نەوتـەکانی کـەرکوك بکەویتـە ژیـر دەسـەلاتی کـوردی، هـەر بۆیـە دوای شـەری کـەنداوی دووەمو تیـك شـکانی لەشـکری عـیراقی لەبەرامبـەر هیزەکـانی هاوپـەیمانانداو بەسـەر پەرشـتی ئـەمریکا و، لـەچوار چیـوەی سـەپاندنی مـەرج بەسـەر رژیمـی عـیراقدا هیلـی ٣٦یـان دانا، کەبەشـی هـەرە گرنـگو دەولەمـەندی کوردسـتانی باشـووری نەگرتـەوە، بـەو پیـیەی ناراسـتەوخۆ دەسـەلاتی تـەواوی خـواروی هیلـی ٣٦یـان بـۆ رژیمـی بەعسـی ردفتـار فاشـی چۆلکـرد بـۆ ئـەوەی بـەئارەزووی خـۆی دریـژە بەسیاسەتە دوژمنکارەکانی دژی کورد بدا لەتـەعریبو تـەبعیسو تـەهجیر. بەتایبـەت لەناوچـەکانی کـەرکوك، شـیخان، شـنگارو تەلەعفەر.

هەر لەوچوار چیوەیەدا ئیستا کۆمپانیاکـانی نـەوت بـەهاوکاری CIAو موساد پرۆژەیـەکی گـەورەتریان بەدەستەوەیەو کـاری پـێ دەکـەن، ئـەویش نیشـتەجێکردنی ئـاوارە فەلەسـتینیەکانە لـەو ناوچەیە بەبەرچاوی نەتـەوە یـەکگرتووکانو بـەئاگاداری خـودی کۆفـی ئـەنان. ئەگـەرچی ئـەم پلانـە لـەرووە سیاسـییەکەیدا بەبـەرژەوەندی ئیسـرائیلو ئـەمریکا و خـودی رژیمـی عـیراقی کۆتایی دیـت، بەلام لەلایـەنی ئابوورییـەوە کۆمپانیا گـەورەکانی

نەوت بەم کارە دەتوانن چواردەوری بیرە نەوتەکان لوغم ریژ بکەن تا پێی کورد پێیان نەگات، بەم شێوەیە خۆیان لەمە ترسی لەدەستدانی ئەو ناوچە هەرە دەولەمەندەی نەوت لەجیهاندا دەپارێزن. سەرەتای هەستکردنی ئەم کۆمپانیایانەش بەمەترسی گەشەکردن و فراوانبوونی دەسەلاتی کوردی بۆ نزیک بیرە نەوتەکان بۆ ئاداری ١٩٩٥ دەگەڕێتەوە. لەو کاتەدا کەیەکیتی بەهاوکاری حزبی شیوعی و پاریزگاران و زەحمەتکیشان و سۆسیالست و INC، پەلاماری رژیمی بەغدایاندا لەسنوورەکانی تەماس، کۆمپانیاکانی نەوت پاش ئەو پەلامارەو سەرکەوتنی لەزۆر قۆلداو تیکشکان و کوژرانی بەشێك لەسوپای عیراقی لەم سنوورانە بۆیان روونبۆوە کەئەگەر لەبەغدای پێی تەخت هەر گۆرانیکی چاوەروانکراو روبدا، ئەوا هێزە کوردییەکان بەئاسانی دەتوانن دەست بەسەر بیرە نەوتەکاندا بگرن و بەهۆی کوردی بوون و کوردنشینی ناوچەکە لەو ناوەدا بمیننەوە کەدواجار ئەوان دەولەمەندترین سەرچاوەی نەوتیان لەدەست دەردەچێ و تووشی زیانی گەورە دەبن. بەتایبەتی دوای ئەوەی کەیەکیتی توانی پارتی لەهەولیر دەرپەرینێ و تەرازووی هێز لەناوچەکە بەبەرژەوەندی خۆی لاسەنگ بکات. دوای ئەوەی نەیتوانی هێزی کوردی تیك بشکینن. لەلایەن رژیمی تورکیا و بەتایبەت دکتاتۆر سەدامەوە یارمەتی زۆری بنەمالە درا بەچەك و جبەخانەو پارەو زانیاری. هەرچەندە سەرەتا خەلك ئەم قسانەی بەپروپاگندەی حزبی وەردەگرت، بەلام دوای ٣١ی ئاب و هاتنی لەشکری تورکیا لە١٩٩٦ بۆ کۆمەکی بنەمالە، بۆ هەموو خەلك

ـ شکرا بۆ کەبنەماڵە پیاوی بیگانەن. ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کەبنەماڵە بەدەستی خۆی بۆ خۆی دروستکردبوو، بەجۆریك کەدڵنیا بوون ناتوانن بەشەر هەولیر بگرنەوە ئەگەر پشت بەهێزی بیگانە نەبەستن و، یەکیتیش مەرجی گەرانەوەی پارتی بۆ هەولیر بەئاشتی بەبێ شەر ئەوە بوو کەبنەماڵە داهاتی ئیبراهیم خلیل بخاتەوە ژیر دەسەڵاتی پەرلەمان و حکومەتی شەرعی کە لەهەڵبژاردنیکی جەماوەریدا هەڵبژیردرابوو. بۆیە بنەماڵە هەمان ریگای ریککەوتنی جەزائیری گرتە بەر بۆ بەرژەوندی تایبەتی خۆیان. ئەم کارە تەنهامەسعود بەرزانی و نیچیر بەبەرنامەکەی ئاگادار بوون و ئەم دوانە لەهەموو کۆبوونەوەیەکی تایبەتی لەگەڵ کادرانی پارتی جەختیان دەکردە سەر ئەوەی کەپارتی ناتوانێ بەشەر هەولیر بگریتەوە، کەئەمە بۆخۆی ریگا خۆشکردن بوو بۆ پەنا بردن بۆ لەشکری سەدام.

لەهەمان کاتدا بەنهینی و لەریگای پیاوە تایبەتیەکانیانەوە پەیوەندییان لەگەڵ رژیمدا توندتر کردو لەکاتی گونجاو دەگەران بۆ ئەم کارە، کەنەك هەر کادرەکانی پارتی پیی ئاگادار نەبوون بەلکو زۆر لەئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی چاوەرییان نەدەکردو، کو لەبەرگی دووەمدا رونم کردەوە کەبەریز عەلی عەبدوڵلا لەوەڵامی ئەوەدا کەلیم پرسی بۆچی ئەم کارەتانکردو لەگەڵ لەشکری بەعسدا ریککەوتن دژی کورد؟ ئەو بەدەست پانکردنەوە تیی گەیاندم کەبێ دەسەڵاتەو ئاگای لەو پلانە نەبووە. لەکاتیکدا لەدوای راپەرینەکەی بەهاری

١٩٩١بەنزیکی شەش مانگ کاتیك کەبینیمو دووبەدوو دەستمان کرد بەقسەکردنو فەرمانی بەپاسەوانەکە کرد نەهیلێ کەس بیتە ژوورەوە. لەوەلامی پرسیاریکیدا ئەوەم بۆ باسکرد کە لەقەزای دیانە لە ١٩٩١چیم بەمەسعود گوت (بروانە بەرگی دووەم، کورد دوژمنی خۆت بناسە، ل٥٩-٦٠ ) پاش ئەمە عەلی عەبدوللا وتی: بارودۆخی ئیستای کورد بەتایبەتی ئیمەی پارتی چۆن هەلدەسەنگینی ؟ رای تۆ چییە؟

وتم: ئایا ئیوە ئامادەیتان تیدایە لەگەڵیەکیتی ببنە یەك حزب.

وتی: نەخیر

وتم: کەواتە دوارۆژ بەجۆریك لەکەمی دەدەن بەرامبەر یەکیتی نامینن. بەرای من ئیوە لەداهاتوودا پەنا بۆ سەدام دەبەن.

وتی: کاتیك کاك مەسعود لەبەغدا بوو خەریکی گفتوگۆ بوو منیش لەراژان بەبروسکە بەجفرە ئاگاداری مەسعودم کرد کە لەگەڵ سەدام ریکبکەوەو ئیمزای بکە. بەلام ئەوەش کە لەسالی ١٩٩١دا روویداوە مانای ئەوەنییە کەبەریز عەلی عەبدوللا مەبەستی بوبێ کوردستان تەسلیم بەدکتاتۆری بەعس بکریتەوە. بەلکو ئەو تەنها مەبەستی ئەوە بو کەگەلی کورد لەهیرشی سەدام بپاریزێو پیش وەخت لەگەلی ریکبەکەون. بەلام ئەوەی لە٣١ ئابدا روویدا تەنها بۆ پاراستنی کورسی بنەمالەو خودی مەسعودو نیچیر بوو. کە لەئەنجامدا تەنها گەلی کورد زیانی پیکەوت.

لەزەمینــــە خۆشـــکردن و ئاســـانکاری و جیبەـــجیکردن و سەرخستنی ئەم پلانە گڵاوە دژی گەلی کورد بەرای من چەند دەولەت و کەسایەتییەك بەژدار بوون، لەوانە:-

١-*تورکیا/* ئەم دەولەتە بەردەوام پەیوەندی توندو تۆلی لەگەڵ بنەمالەدا هەبووەو، هیچ کیشەیەکی لەگەڵ پارتیدا نەبوو.تەنها ئەوە نەبێ کەیەکیتی رۆژ بەرۆژ گەورەتر دەبێ بەتایبەت دوای گرتنی هەولیر کەئەمەش مە ترسی بوو بۆ سەر تورکیا و بەکریگیراوەکانی میت لەهەولیرو ناوچەکانی‌تر. تورکومانەکانی هەولیریش نەیاندەتوانی وەکو جاران کۆمەکی میت و حکومەتی تورکیا بکەن. بۆیە تورکیا مەبەستی بوو دووبارە بنەمالە بیتەوە هەولیر بۆ پاکتاوکردنی کادردکانی PKK و دوورخستنەوەی مەترسی.

٢-*سوریا/* هەرچەندە دۆستایەتییەکی دیرینی لەگەڵ یەکیتیدا هەیە، بەلام پاش کۆنترۆلکردنی هەولیر، ئەوان دەترسان ئەو تیکچوونی تەرازووەی هیزەکانی کوردستانی باشوور خراپ بەسەر بەرژەوەندییە نەتەوەیییە عەرەبیەکانیاندا بشکیتەوە و دەترسان لەبەرەوپیشچوونی یەکیتی بەرەو ناوچەکانی‌تری پارتی لەنزیك سنووری سوریا پەشیوی و ئالۆزی ناوچە سەر سنووریەکان دابگرێ.

٣-*کۆماری ئیسلامی ئیران/* ئەوانیش دووبارە لەگەڵ تیکچوونی تەرازووی هیزدا نەبوون. هەروەها ئیران سەرنەکەوتنی هیرشەکەی بۆ سەر دیموکرات بەدەسیسەی یەکیتی دەزانی و، دلنیا بوو لەوەی ئەگەر یەکیتی بکەویتە سەرپیی خۆی و

پێویستی بەئێران نەمینێ ئەوە نەك هەر ڕێگا لەلەشکری ئێرانی دەگرێ کەهێرش بکاتە سەر دیموکرات، بەلکو خۆشی بەشداری دەکا لەسەر خستنی شۆڕشی کورد لەئێران. بەلام هەرچی بنەمالەیە ئەوە لەگەڵ حزبی دیموکرات و ئۆپۆزسیۆنی کوردی ڕۆژهەلاتدا خوێن لەنێوانیاندایە.

نابێ ئەوەشمان بیربچێ کەئەم سێ دەولەتە لەو ماوەیەدا پێکەوە هەرچەند مانگ جارێك لەیەکێك لەپێتەختەکانی دیمەشق، تاران و ئەستەمبۆڵ کۆدەبوونەوە بۆ ڕێککەوتن لەسەر وەزعی کورد لەعێراق، لەدوای ٣١ ئابەوە ئەم کۆبوونەوانە کۆتاییان پێ هات !! ئەمەش پاش ئەوەی ڕوداوەکان بەبەرژەوەندی ئەوان کۆتایی هات.

٤-*ڕژێمی عێراق/* پاش تێکشکانی گەورەی عێراق لەکوێتدا، ڕژێمی عێراق تا ٣١ئاب نەیتوانیبوو هیچ سەرکەوتنێك بەدەست بێنێ، بۆیە ئەم ڕوداوە بۆ لەشکرو ڕژێمی عێراق بەسەرکەوتنێکی گەورە تۆمار کرا. جگە لەوەی ئەم ڕژێمە لەڕێگای بنەمالەوە توانی کێشەی کورد کەچووبوە قالبی ئینسانییەوەو لەهەموو ولاتە دەسەلاتدارەکانی جیهان قسەو باسی لەسەر دەکرا، توانی بچوکی بکاتەوەو پەیامێك بەجیهان و گەلی خێرنەدیوی عێراق بگەیەنێ و بلێ ئێمە هەرکات بمانەوێ کوردستان دەخەینەوە ژێر دەسەلاتی خۆمان. هەروەها ئەم ڕژێمە پاش ئەوەی ئەمریکا گلۆپی سەوزی بۆ داگیرساند بۆ بەرەو پێشەوەچوون لەهەولێر، وایزانی ئەمە سەرەتایەکی تازەیە لەپەیوەندیکردنەوە بەئەمریکا. جگە لەهەموو ئەوانە ڕژێمی

بەعس بەم کارەی دەسکەوتی گەوردی بووو، توانی بارەگاکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراق لەهەولێر تالان بکاو ئەندامەکانیان بکوژێ یان دەستگیریان بکاو بەرەو بەغدا بیانبا.

٥-*مەسعود بارزانی و بنەماڵە*/ ئەم لایەنە کەپەیوەندی راستەوخۆی بەو رووداوەوە هەبوو، ماوەیەکی زۆر بەر لەرووداوەکە لەرێگای راگەیاندن و کادرەکانیەوە زەمینەسازی بۆ دەکرد، کاتێك دەیانگوت یەکێتی بەپاڵپشتی ئێران و بەهاوکاری هێزی بەدر نیازیانە لەهەولێرەوە پەلاماری پارتی بدەن و هاواریان دەکرد هەولێر بۆتە لانکەی ئیتلاعات و سوپاکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراق. لەو کاتەدا یەکێتی دەبوو هەر زوو بیزانیایە کەپارتی بەم قسانە دەیەوێ شەرعیەت بدا بەپلانێکی گەورە، بەڵام سەرکردایەتی یەکێتی نەیتوانی وەك پێویست لەو بارودۆخە بگەن، بەلکو ئەوانیش بەبێ ئەوەی بزانن کەوتنە داوی دوژمنەوەدو، هەموو راگەیاندنەکانیان لەبارەی هاوکاری رژێمی بەعس و بنەماڵە وەکو پروپاگەندە تەماشاکرا .

هەر لەو ماوەیەدا مام جەلال لەسەر تەلەفزیۆن و بەئاشکرا هەرەشەی لەرژێمی عیراق دەکردو بەچەقەلی دەچواندو دەیگوت پارتی دەبێ بەدووربین سەیری هەولێر بکات و لەمەولا فاتحە بۆ سەر پارتی دەخوێنین.

ئەم قسانە گەرچی پروپاگەندەی سیاسی بوو، بەڵام پارتی بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەی کەلکی لێبینی. هەربۆیە خودی مەسعود بارزانی دەستی کرد بەدارشتنی بەرنامەی چۆنیەتی جێبەجێکردنی پلانەکە کەزۆر بەنهێنی بوو. لەبەرەبەیانی ئەم

. ڕۆژە شومەدا کەهیشتا خەڵکی قەڵاو منارە لەشیرینی خەودابوون بە دەنگی تۆپ خەبەریان بۆوە، کەپیشتر مالی ئیمە لەعەنکاوە بەیانیان بەناقوسی کەنیسە هەلدەستاین. لەسەعات ١٠دا دەنگی زنجیرو گرمەی تانکەکانی گاردی کۆماری لەهەموو هەولیر هەلدەستا پەشیوی‌و ئالۆزییەکی وا کەوتەوە کەدزی‌و جەردەیی ئاوا لەهەولیر مەگەر هەرلە لەشکرکیشییەکەی هۆلاکۆ لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەم شارەی هینابێ.

'فەرمایشتە جوانەکەی مامۆستا خورشید شیرە کە لە ١٩٩٦/٨/٣٠ لەهاوینەهەواری سەلاحەدیندا وتبووی، وەکو خۆی‌و بەزیادەوە جێبەجیکرا، کاتیك بەلەشکرەکەی ڕاگەیاندبوو سبەی لەهەولیر چیتان دەستکەوت هەتاکو ٧٢ حەفتاو دوو سەعاتی‌تر، سەربۆ ئیمەو مالیش بۆ ئیوە.

جیی باسە بنەمالەی بارزانی ئەوەندە داخ لەدل‌و توورە بوون لەخەلکی بەشەرەفی شاری هەولیر، کەسەرەتا ویستیان هەموو شوینیك تالان بکەن بەبی گویدانە هیچ بەهاو دابوو نەریتیکی کوردەواری. بۆ نموونە: فەرمانیاندا بەتالانکردنی کتیبخانەو ئەرشیفە گەورەو پر لەدەستنوسەکەی مامۆستا ڕەشاد موفتی کەچەندین دەستنووسی بایەخداری تیدا بوو. بەلام خۆشبەختانە ئەو کەسەی جیبەجیکردنی فرمانەکەی پیسپیردرابوو، ویژدانی ڕیگەی نەدا لەم تاوانەدا بەژداربیت. بۆیە هەر زوو کەس‌وکاری مامۆستا ڕەشادی ئاگادار کردەوە بۆ ئەوەی ئەرشیفەکە بگوازنەوەو لەتالانکردن بیپاریزن. بنەمالە لەتالانکردنی ئەرشیف‌و کتیبخانەی مامۆستا ڕەشاددا

مەبەستیان کەلك وەرگرتن نەبوو لەو دەستنووسانە، تەنها مەبەستیان تالانکردن بوو. چونکە کاك عەدنان موفتی کوری مامۆستا رەشاد دوای ئەوەی بوو بەلێپرسراوی مەلبەندی ۲ی هەولێر توانی کاریگەری زۆر لەسەر هەموو دانیشتوانی هەولێر دابنێت و خەلکی ئەو دەڤەرە زیاتر لەپارتی دوور بخاتەوە و خزمەتیکی زۆری یەکیتی بکات. ئەوی کەیارمەتی کاك عەدنان موفتی دا لەو کارەیدا سەرکەوتوو بیت، جگە لەکارامەیی و دەستپاکی و لیهاتوویی خۆی، ناوبانگ و ریزو خۆشەویستی بەربلاوی بنەمالەکەیان بوو لەهەولێر.

من خۆم ئەوەی لە۳۱ ئابدا بینیم نانوسریت و ناگوتریت، هاوولاتیان سەریان سوورمابوو کەچۆن لەشکری بەعسی فاشی بەسەرۆکایەتی قوسەی بەهاوکاری مەسعودو بنەمالە توانی پەلاماری هەولێر بداو پەرلەمان و هەموو وەزارەتەکان تالان بکا.

یەکەم رۆژ کونجی مالم گرت و دەستم کرد بەسووراندنی میلی رادیۆکە، بەلام بێ ئەوەی هیچ ببیستم کەدلم خۆشبکا. بەیانیەکەی ۱۹۹٦/۹/۱ لەمال هاتمە دەرو گەیشتمە بارەگای مەکتەبی سیاسیی یەکیتی، بینیم هەمووی تالانکراوە، لە حەوشەکەدا چەند تانکیك ئالای زەردیان هەلدابوو، چەند سەربازیکی عەرەب لەگەل ئەفسەریك وەستابوون. خەلکی بەچاویکی سەیر تەماشایان دەکردن، چواردەوریان بەچەکداری جل وبەرگ کوردی جەمەدانە سور گیرابوو، تابیانپاریزن. ئەگەر ئەم وینەیەم نەدیتبایە بەچاوی خۆم هەرگیز بروام نەدەکرد کەئەمە رووی داوە و، پلاهی کەئەمەم بینی ئەوەندە دلگران بووم

دەستم کرد بەگریان و لەدلی خۆمدا دەمگوت: یارەبی مەسعود ونیچیر ریسوای دونیاو قیامەتبن وەکو ئەم تاوانە گەورەتان دژی گەلی کوردو کوردستان ئەنجامدا. ئەو کارەساتە وای لیکردم شەوورۆژ بیربکەمەوە لەخۆم بپرسم کەئایا من دەتوانم خزمەتیکی بچوك بەمیللەتەکەم بگەیەنم وئەو راستیانەی لامە بۆ خەلکی ئاشکراکەم تاچیتر چەواشە نەکرێو، دوژمنی خۆی بەراست بناسێ. ئیستاش کەنویژ دەکەم و لەکاتی سوجدەدا لەخوای گەورە دەپاریمەوە کتیبەکانم ببیتە مایەی سوودو قازانج بۆ نەتەوەو گەلەکەم.

سەدام لەکاتی قسەکردنیدا لەبەرامبەر ئەفسەرەکانی گاردی کۆماری لەبەغدا لەبەرامبەر ئەو هیرشەیاندا گوتی: *(استطاعت جحافلنا الخفیفة بقیادة مەسعود البارزانی مع مساندة الجیش العراقی بأستعادة اربیل)*. تارق عەزیزی وەزیری دەرەوەی ئەوسای عیراقیش لەیادەوەرییەکانی خۆیدا نوسیویتی کە لەشکری عیراق لەسەرداخوازی مەسعود بەهانایەوە چوو. سوپای عیراق لەم هیرشەدا پیك هاتبوو لە٤٠٠٠٠ سەربازو ٣٠٠ تانك و ٤٠ تۆپ. لەئەنجامی ئەم پەلامارەدا ٢٦ تانك تیك شکینراو ١٠٠ سەرباز کوژران و زیاتر لە١٧٠ کەسیان زامداربوون. لەبەرەی گەل و یەکیتییش ٤٠٠ کەس شەهیدبوو، زیانیکی مادیو مەعنەوی یەکجار گەورەش بەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد کەوت. هەرچی پیشمەرگەوخەلکی مەدەنیە زامدارەکانی ناو نەخۆشخانە هەیە، پاش ئەوەی دەستیان بەسەرداگیرا هەرهەموویان کوژران.

لەبەرامبەر ئەو پیشێلکارییەی عیراق، ئەمریکا هیچ هەلویستیکی جددی وەرنەگرت بەلکو تەنها بۆئەوەی خۆی لەگلەیی بدزیتەوە چەند موشەکیکی بە پرۆژەی بەخیوکردنی مریشکەوە نا لەباشووری عیراق و، دوو تانکی تیکشاویشی سوتاند! خۆ ئەگەر هاتبا ئەمریکا تەنها موشەکی بەلەشکری عیراقییەوە نابا لەهەولیر ئەوا هەموو لەشکرەکە بەپارتییەوە دەیقوچاندو گەلی کورد سەرکەوتنیکی گەورەی بەدەست دینا.

بەلام وەکو وتمان ئەو پلانە لەلایەن کۆمپانیا جیهانییەکانی نەوتەوە زۆر بەوردی داریژرابوو، بەجۆریك هەرەشەی کورد لەسەر کەرکوك دووربخەنەوەو دریژە بەو بارودۆخە ئالۆزەی عیراق بدەن، بەپیی یاسای نە شیش بسوتێ نە کەباب.

سەرەتا ویستیان دەستیان تاکوێ بگات کۆمەکی پارتی بکەن بۆ بەرەو پیشچوون، ئەوەبوو هەموو چەكو جبەخانەکانیان خستە ژیر دەسەلاتی پارتی بۆ داگیرکردنی ئەم ناوچەیە، لەدوای ئەمەوە پارتی هەر بەهەمان پالپشت زیاتر چووە پیش و، یەکیتی دەستی کرد بەپاشەکشە لەبەرامبەر ئەو پلانەدا.بەم شیوەیە هیزی گەل و شۆرشەکەی لەسنووری ئیران و لەسەر کیوەکان خۆی گرتەوەو کۆبوونەوە.

### گەردەلولی تۆلە

پاش کۆبوونەوەی هیزی هاوپەیمانی نیشتمانیو لیکۆلینەوە لەبارودۆخەکە، سەعاتی سفر دانرا، بۆ پەلاماردانەوەی حزبی بنەمالەو رزگارکردنی هەموو ناوچەکانی کوردستان. ئەوەبوو

پاش ٤٠ شەو بەسەر ٣١ ئابدا، پەلاماردان دەستی پێکردو پارتی بەجۆرێك شکاو هەڵاتن کەمەسعود ناچار بەناو ڕژێمدا لەرێگای کەرکوکەوە خۆی گەیاندەوە هەولێر. لەهەمان کاتدا دەنگی تێکشانە خێراکەی پارتی لەناو هەولێر دەنگیدایەوەو بڵاوبۆوە، بۆیە ئەو بەرپرسە پارتیانەی بەهاوکاری بەعس لەهەولێردا خۆیان داکوتابوو، بەشی زۆریان بەرەو شاری موسڵ قوچاندیان و بەشەکەی تریان لەگەڵ کاك مەسعود بەرەو بارزان و بادینان هەڵاتن. بەڵام بەداخەوە مام جەلال دووبارە هەڵەی کردەوە کاتێك لە ترسی لەشکری عێراقی هێرشی بۆسەر هەولێر ڕاگرت. چونکە ئەگەر ڕژێمی عێراق بەرگریشی لەهەولێر کردباو پەلاماری هێزی پێشمەرگەی دابا ئەوا پارتی زیاتر ڕیسوادەبوو. جگەلەوەش خەڵکی هەولێر بەگشتی خۆی بۆ ڕاپەرین ئامادەکردبوو دژی پارتی وبەعس، هەروەکو ١١ی ئاداری ١٩٩١ کە لەم ڕۆژەدا جەماوەری ئەم شارە خۆڕاگرە سەلماندیان ئەوان دوژمنی بەعس و کوری شۆرش و کوردن. ئەو مامۆستایەی کەخەڵکی کۆیەبوو لەرۆژی ڕاپەرینەکەدا لەهەولێر بەبەر ماڵی ئێمەدا شات و ڕانکوچۆغەیەکی خورمای لەبەردابوو تفەنگی برنەوی پێ‌بوو، لەچواردەوریدا کۆمەڵێك هەرزەکاری گۆچان بەدەستی لێبوو، ئەو مامۆستایە کاتێك پەلاماری بارەگای بەعسی داو بەیەکەم تەقە یەکێکی لێزامدارکردن و ئەوانی‌تری هەمووی بەدیل گرت، دڵنیام لەوڕۆژەدا پاش خیانەتی ٣١ ئاب ئامادەبوو لەوەش زیاتر بکاو ئەگەر ئێستا تیرۆر نەکرابێ ئەوە

بەدڵنیاییەوە لەزیندانی عەقرەیە لەسەر بیرو باوەڕی شۆڕشگێڕی.

ئەو هەڵەیەی مام جەلال ئەگەر بەبیانووی پاراستنی گیانی پێشمەرگە بێ ئەو هەر دەرەنجامی خراپی هەبوو، چونکە لەوکاتەوە تائێستا چەندین پێشمەرگەی جوامێرو گیان لەسەردەست گیانیان بەخشی لەبەرامبەر هێزی پارتیو دەوڵەتە ئیقلیمیەکاندا، لەکاتێکدا رەنگە ئەو هێرشە ئەگەر سەرکەوتبا کۆتایی بەشەڕی ناوخۆ هێنابا. جیا لەوەش لەشکری عێراق لەو کاتەدا لەبارێکی یەکجار خراپدا بوو بەبەراورد لەگەڵ کاتی راپەڕین، بەجۆرێك کەدکتاتۆری بەغدا لەرۆژدا دەسەڵاتی ٩٠٪بوو لەشەویشدا ٥٠٪.

پاش ئەم کارەساتە، پەیوەندی خودی سەدامو مەسعود بەجۆرێك پتەوبوو کەمەسعود چووە بەغداو نزیکەی ٤٠ رۆژ مایەوەو، نەبێ ئەوە مانای ئەوەبێ کەمەسعود پێشتر پەیوەندی لەگەڵ بەغدادا ناخۆش بووبێ، بەڵکو ئەو بەردەوام لەبەغداوە رێزی لێگیراوەو وەکو دۆستێکی نزیکی خۆیان تەماشایان کردووەو بەوەکیلی رژێمیان زانیوە لەکوردستان. هەر بۆ نموونە لەمانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩١ کاتێك عزەت دوری کەجێگری سەرۆك کۆمار بوو کۆبوونەوە بە١٢ دوانزە موستەشار ئەفواج خفیفەی کورددەکا، لەوکۆبوونەوەیەدا پێیان دڵێ: ئەوەی لەکوردستان رووی‌دا لە٧٠٪ی خەتای ئێمەبوو باقیەکەی واتا ٣٠٪ی تاوانی ئێوەیە، چونکە رەوشتو کردەوەتان لەگەڵ خەڵکدا باش نەبوو، ئەوە هۆی ئەوەبوو کەخەڵك لەکاتی

پێویستیدا پشتتان تێبکاو لەدژتان بوەستێ. ئێوە باش دەزانن ژمارەی افواج خفیفەی ئێمە لەکوردستان زیاد لە٥٠٧ فەوج بووە، بەڵام هەموو هێزەکانتان نەیانتوانی ئیدارەی کوردستان بکەن. ئێمەش وا بڕیارماندا کوردستان تەسلیم بەکاک مەسعود بکەین، بۆ بەرژەوەندی خۆمان و عێراق، چونکە ئێمە بەگشتی لەئەنجامی گفتوگۆ بۆمان روون بۆتەوە جیاوازییەکی ئێجگار زۆر هەیە لەنێوان مەسعودو جەلال، هەرچی کاک مەسعودە جێی باوەڕو متمانەیەو بەهیچ جۆرێك گومانمان لێی نییە، بەڵام جەلال جێی باوەڕ نییە، بۆیە بڕیارماندا ئێمە لەهەموو روویەکەوە پشتگیری مەسعود بکەین.

*تێبینی/*

دوای ڕاپەڕین، خەڵکێکی زۆر لەوانەی شان بەشانی بەعس دژی خەڵکی کوردستان راوەستابوون بەرەو بەغدا هەڵاتن. لەمانگی یانزەی ساڵی ١٩٩١ لەگەڵ مستشارەکان لەیەك شوێن کۆیان دەکەنەوەو بەخێرهاتنیان دەکەن. ئینجا پێیان دەڵێن جەنابی سەرۆك دەیەوێ بتانبینێ، بۆیە هەریەکەو کیسێکیان دەدەنێ کەناویان بەسەرەوەیە. پێیان دەڵێن چیتان پێیە بیخەنە ناوکیسەکەوە، پاشان یەکەیەکە دەیانبەنە ژوری پشکنین لەسەرەوە تاپێڵاوەکانیشیان دەپشکنن، دوای هەموویان سواری پاسێکی کۆستەری جام تاریك دەکەن کەدەرگای تەنیشتی نییە، بەڵکو لەپشتەوە سوار دەکرێن، پاسەکە دەست بەڕۆیشتن دەکات، پاش وەستان دەرگاکانی پشتەوە دەکرێتەوەو

دادەبەزینرین بەرەو ژوری جیگری سەرۆك دەیان بەن. جیگری سەرۆك كۆمار عزەت دوری دیتە ژوورەوەو لەگەڵ هەموویاندا تەوقە دەكاتو بەخیرهاتنی گەرمیان دەكاو بەگەرمی ئەحوالیان دەپرسیت، كەئەمە ناوەكانیانە؛

١-ئەسعەد هەركی ٢-سالح ئەحمەد گۆران ٣-فەتاح جاف ٤فەرزەندە هەركی ٥-محەمەد تاهر شیروانی ٦-ئەحمەد جەوهەر ٧-قاسم ئاغا كۆیی ٨-لوقمان سمكۆ زۆكی ٩-جەمال تاهر ١٠-عاسم ئاغا دارەتویی.

یەكیك لەوانە وەلامی بۆناردمو ئەم هەوالەی پیراگەیاندم، داوای لیكردم بچم بۆ بەغدا بۆلایو سەردانی بكەم، منیش چومە بەغداد لە تەلەفۆنم بۆ كرد، دوای سەعات حەوتی ئیوارە كابرایەك هاتە لامو پیكەوە چوینە لای. دووبەدوو لەژوریك دانیشتینو دەستمان كرد بەگفتوگۆكردن. چەند باسیكی زۆر نهینی بۆ باسكردم، ئەوەی لەپیشەوەگیرامەوە یەكیكە لەوانە، پاشان وتی: دەزانی بۆچی بانگم كردووی بۆ ئیرە؟ من پەشیمانم لەهەموو تاوانەكانم كە لەرابردوودا كردوومە بەرامبەر ولاتەكەمو شەرمەزارمو رۆژگارم لی ناروا. لەكاتیكدا من لیرە وەزعی دارایی‌و پیی‌ەم زۆر باشە. لەگەڵ خودی سەدامدا هاورییەتیم پیەوە. بەلام دەمەوی ئەوەی لەتەمەنم ماوە لەكوردستاندا بیبەمەسەرو سەرمایەكەم لەكوردستاندا بەگەر بخەم.

ئنجا لەدریژەی قسەكانیدا وتی: باوەرم بەتۆیەو گومانم لیت نییە، ئەمەوی بچیتە خزمەتی كاك مەسعودو مام جەلال ئەم قسانەی منیان بۆ بكەی. چاوەروانم وەلامم بدەیەوە، تالەماوەی

١٥ ڕۆژدا خۆم کۆبکەمەوەو لەڕیگای تایبەتی خۆمەوە بگەمەوە کوردستان. بەمەرجیك تۆ بەخودی پیم رابگەیەنی کە لەلایەن هەر دوو سەرکردە عافوکرامو هیچ هەڕەشەیەکم لەسەرنەماوە.

منیش لەوەلامدا وتم: بەداخەوە ئەم ئەرکە زۆر زۆر گەورەیە، چونکە تۆیەکیکی لەوانەی کەدژی راپەرینەکە راوەستاویتو ئەلین زیاتر لە ٣٠ کەست کوشتووە، مالی هاوولاتیانت تالانکردوە.ئینجا بۆ ئاگاداریت من هیچ پەیوەندیم بەهیچ لایەکیانەوە نییە، بڕواناکەم ئەوانیش بتوانن ژیانت لەجەماوەر بپاریزن. پیم وت دەتوانی لەڕیگای کەسیکیتر کەدۆستی ئەو دوو پیاوە بێ ئەم کارە بکەیو کارئاسانیت بۆ بکا. بۆیە داوای لیبوردنم لیکردو خواحافیزیم خواستو هاتمە دەرەوە، ئەویش لەوەلامدا وتی: خۆشحالم کەراستیەکەت پیراگەیاندم، بەلام هەرچەندە پەیوەندی مەسعود بەسەدامەوە پتەوو خۆش بێ، مومکین نییە سەدام بەقسەی مەسعود بکاو لەشکرکیشی بکاتە سەر هەولیر، ئەگەر لەئەمریکاو ولاتە زلهیزەکان دلنیا نەبێ کەپەلاماری نادەن.

هەقی خۆیەتی لیرەدا ئەو پرسیارە لەخۆمان بکەین کەبۆچی دوای ئەوخیانەتە گەورەیەی مەسعود لەناو پارتیدا دووبەرەکی رووی نەداو دەنگی نارەزایی بەرز نەبۆوە؟! سەرەتا پیشتر بەکورتی باسی پیکهاتەی بنەمالەم کرد، بەتایبەت دوای ئاشبەتال، وتمان کەبنەمالە خۆی لەسەر جاشو بەعس دامەزراندوە، بنەمالەی مەلامەستەفا پارتییان کردبوو بەرەشمالی عەشرەتەکەی خۆیان، بۆیە هەموو فەرمانەکانی ئەو

بنەماڵەیە وەك ئایەتی قورئان تەماشا دەکرێ‌و کەس گفتوگۆی لەسەر ناکا. هەتا خەڵکە رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرەکەی ناو پارتیش تەسلیم بەو وەزعەبوون‌و دەستیان بەکڵاوی خۆیانەوە گرتووە تا بای بنەماڵە نەیبا، چونکە بنەماڵە لەریگای دەزگای پاراستنەوە هەموو جولەی کادرانی پارتییان خستۆتە ژێرچاودیری توندەوەو هەر کەسیك لاری بنوێنێ لەمل کەچی بۆ بنەماڵە ئەوا خۆی دوچاری هەرەشەی مەرگ دەکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەکادرو ئەندامانی پارتی لەدانیشتنی تایبەتدا باس لەهەڵەکانی بنەماڵە دەکەن لەمێژوودا، کە٣١ ئاب لەدوای ئاشبەتالەوە لەهەموویان گەورەترو زەقترە. زۆر لەکادرانی پارتی لەوانەی بروایان بەمن هەبووو دڵی خۆیان بۆ واڵاکردمو گلەیی‌و رەخنەکانیان لەبنەماڵە بۆ هەڵرشتوم، کەناتوانم لەبەر هۆی ئەمنی ژیانیان لێرەدا ناویان بێنم، یەکێك لەوانە لە١٩٩٦/٩/٥ کەکادریکی پارتی ناسراوە لەهاوینەهەواری سەلاحەدین کاتێك لەریگاوە رووبەرووی یەك بووینەوە یەکسەر وتی: ئەمەچی بوو مەسعودو نیچیر کردیان لەگەڵ دوژمنی گەلی کورد، ئەم ریککەوتنە خەتەرناکە ئاشبەتالی زیندووکردەوە، بۆچی لەگەڵ مام جەلال ریك نەکەوتن؟ بەداخەوە بنەماڵە هاتە ریزی دەستەشارەکان!

ئەمەی وت‌و رۆیشت وحیمایەکانی دوای کەوتن. من لەناو پارتیدا چەندین کەسی وام بینیوە کەهەر هەموویان خەڵکی ناسراو کادری چالاك بوون. خۆم لەسەرزاری چەند دیلێکی یەکیتی کەلای پارتی بوون بیستم کەوتیان زۆر لەئەندامانی

لیژنەی مەرکەزی دوو بەدوو دەلێن ئەمە کاری بنەماڵە بووەو ئێمە لێی ئاگادار نین.

هەر بۆیە پاش ئەم رووداوە زۆر لەکادرو پێشمەرگەکانی پارتی یارمەتیو هاوکاری یەکێتی دەکەن. بەڵام بنەماڵە بەهۆی سەرمایەی زۆرو دەسەڵاتی بەهێزی خۆیان، توانییان پارتی لەهەر جوڵانەوەیەکی نارەزایی ناوخۆ بپارێزن. هەر کەسێك بیانزانیایە نارازییە بەرامبەر ئەم کارە، بەنهێنی تیرۆریان دەکردو تاوانەکەشیان دەخستە پاڵ یەکێتی. لەم کارەساتەدا زۆر حزبی کوردستان بێدەنگ وەستانو قسەیەکی خێریان تێدا نەکرد. لەوانە؛

١-بزوتنەوەی ئیسلامی، ئەم حزبە زۆربەی ئەندامەکانی سەرکردایەتییان مێزەری مەلایەتیان لەسەرەو پروپاگەندەی ئیسلامەتی دەکەنو، بانگەشەی ئەوە دەکەن کەئەوان موسلمانی راستەقینەنو بەرگری لەگەلی کوردی موسلمانی ستەمدیدە دەکەنو هەرگیز دەستی بەدەستنوێژیان ناخەنە دەستی دوژمن. تا روداوی ٣١ ئابیش بەردەوام شانازییان بەوە دەکرد کەئەوان نەلەشەری PKK بەشداریان کردووەو نە پاش کۆرەوە گەورەکە چوونەتە بەغداش.

بەڵام دوای ئەم روداوە دەنگیان براو خۆیان کرکرد. لەکاتێکدا لەشکری سەدام کەهاتە هەولێر پەلاماری بارەگاکەی ئەوانیشی داو چەند ئەندامێکی لێ بەدیل گرتن، بریندارەکانیان لەنەخۆشخانەی موسڵ بەلۆکە ئاویان دەکرد بەقورگیاندا، بەڵام هەر بێدەنگ بوون. لەگەڵ ئەوەی لەشەریعەتی ئیسلامیدا بۆت

نییە لەسەر هەق بێدەنگبیو لەئاستی تاوانو خیانەتدا خۆت بێساحیب بکەی بەهیچ بیانویەك. بەڵام ئەمانە نەك هەر وایان نەکرد، بەلکو بەپێچەوانەوە دوای دامەزراندنی کابینەی سێیەم لەلایەن پارتییەوە چوونە ناوحکومەتی ناشەرعیو وەزارەتیان وەرگرت، لەکاتێکدا تایەکێتی لەهەولێر بوو دەیان گوت ئەم کارە حەرامەو کوفرە. سەیرە! بۆ لەناکاو کوفر بو بەواجبو حەرام حەڵاڵ بوو، دوژمن بوو بەدۆست. بزوتنەوەی ئیسلامی ئەگەر ئیسلامەتییان تەواوبا نەدەبوو لەئاست ئەم کارەساتەدا بێدەنگ بن، بەڵام راستە پارەو دەسەڵاتو بەرژەوەندی قەناعەتی ناکامڵ زۆر دەگۆڕێ.

٢-یەکگرتووی ئیسلامی: جیاوازی ئەمانە لەگەڵ بزوتنەوەد تەنها چەکە، ئەمانە دەڵێن ئێستا کاتی چەك نەهاتووەو بۆ کاتێکیترە. بەڵام بەپێی شەرعی ئیسلام، موسلمان دەبێ بەرگری لەسەروەتو سامانو ماڵو شەرەفی خۆی بکا، هەرکاتێ دوژمن هێرشی بۆ هێنای، هەروەکو پێغەمبەر فەرموویەتی: *(من قتل دون ماله فهو شهيد، ومن قتل دون عرضه فهو شهيد، ومن قتل دون دينه فهو شهيد)*. ئایا ئەم فەرموودە راستترە یان قسەکەی ئەوان؟ جگە لەوە ئایا بەعس دەهات بۆ ئەوەی شەرەفو ماڵو ئاینی گەلەکەمان بەتاڵان بەرێ؟

من پێم وایە بەهۆی سەرەکی نەجوڵانی ئەم دوو حزبەو دژایەتی نەکردنی ٣١ ی ئابو بەپێچەوانەوە هاوکاریکردنی حکومەتەکەی ١ ٣ی ئاب وەرگرتنی دوو وەزارەت، لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کەئەمانە پیاوی بیگانەنو بەفیتی ئەوان

دەجولێنەوە و،هیچ کات بەلایانەوە گرنگ نییە گەلی کورد چی بەسەردێ. گرنگ ئەوەیە مەسعودیەکان پێیان بلێن خوا پاداشتتان بداتەوەو پارەیان لێ نەبڕن. ئەگەرنا بۆچی لەسەر لەشکرکێشیی سربیا بۆ سەر بۆسنەو، روسیا بۆ سەر چیچان دەیکەن بەهەراو رۆژانە لەرادیۆو تەلەفزیۆن و رۆژنامەکانیاندا ئیدانەی دەکەن و داوادەکەن لێرەوە کوردی موسلمان بچێ بۆ ئەوێ بۆ بەرگریکردن لەو گەلە موسلمانانە، لەکاتێکدا هیچیان بەئەندازەی بەعس درندەو کافر نین، هیچ لەوگەلانەش وەکو کورد زولم و تاوانی بەرامبەر نەکراوە. بۆیە من دلنیام ئەوان لەرۆژێکدا بۆیان دەرکەوێ کەچەند هەلەبوون پاش ئەوەی کە لەدەستیان دەردەچێ ئەو هەلەیە راست بکەنەوە. نەوەی داهاتووش کاتێك لاپەرەکانی مێژووی پێش خۆی هەلدەداتەوە بەچاوی رق و بێ بەزەییەوە سەیریان دەکا.

٣-حزبی شیوعی، ئەم حزبە مێژووی لەگەل بەعسدا هەمووکات هەر شەرو کوشتار بووە. هەرکاتێکیش بەعس بەناوی رێککەوتنەوە لەگەلیاندا دانیشتبێ، ئەوا لەپشتەوە خەنجەری لێوەشاندوون، بۆیە ئەوان زۆر لەحزبەکانیتر زیاتر بەعس دەناسن و ئازاریان بەدەستییەوە چەشتووە. بەلام لەگەل ئەوەشدا رووداوی ٣١ ئاب یان بەکارێکی سیاسی داناو وایان دەربری کەبەشێکە لەشەری ناوخۆی یەکێتی و پارتی. هەر بۆیە زوو خۆیان کوتایە ناو حکومەتەکەی پارتی. مامۆستا کەمال شاکر بوو بەوەزیری تەندروستی کوردیش لەمێژە گوتویەتی ئەگەر کەچەل دکتۆربێ چارەی سەری خۆی دەکا. حزبی

شیوعیش لەبری ئەوەی بیر لەتەندروستی نەتەوەیی گەل و نیشتمان بکاتەوە، لەبری ئەوەی وەفای هەبێ بۆ شەهیدەکانی و لەسەر ریبازی هاورێ فەهد کار بکا بۆ نەهیشتنی چەوساندنەوە، لەبری هەموو ئەوانە بوون بەداردەستی بنەمالە. جاریکیان کادریکی ناسراوی حزبی شیوعیم بینی و لیم پرسی: دوای ئەم کارەساتە بۆ هەولیرتان جیٚنەهیشت؟ لەوەلامدا وتی: مەبەستت ئیمەش لەگەڵ یەکیتی ئاوارەی ئەودیوی ئیران بین؟

## بەرقەراربوونی ئاشتی و چارەسەرکردنی کیشەکان لە ریگەی وتوویژەوە

لەسالی ١٩٨٥-١٩٨٦ لەکاتی هاتوچۆکردنم لەنیوان یەکیتی و پارتی بەخزمەتی مامۆستا کەریم ئەحمەدو ابو حکمت گەیشتم: مامۆستا عەزیز محەمەد ویستی بم بینێ بەلام بۆم نەکرا، لەوکاتەدا کادرانی شیوعی بەئاشکرا هاتوچۆی ئیرانیان دەکرد لەریگای سوریاوەو دەهاتنە مەکتەبی سیاسی پارتی لەراژان. بۆئەوکاتەئاوارەیی‌شۆرشگیری بوو،بەلام ئیستاعەیبەیە؟ بێدەنگی ئەم حزبانەو کۆمەککردنیان بەبنەمالە سەرخستنی حکومەتە دەسکردەکەی، هۆیەکی‌تری روونەدانی جیابوونەوە بو لەناو پارتی. ئەوحزبانە بەم کارەیان پشتی ئەو بنەمالەیان قایم کردوو دەستیانگرت، پاش ئەوەی بەعس گەراندنیەوە بۆ هەولیرو ناوچەکانی‌تر. لەدوای ئەم کارەساتە وەکو وتمان شەری ناوخۆوە قۆناغیکی نوێوە، برینەکان قولتربوون و شەرەکانیش فراوانتر. بنەمالە پاش ئەوەی ئەم خیانەتەی بۆ

چوە سەر زیاتر لەجاران پێی داگرت لەسەر ئاشتی نەکردن لەگەڵ یەکێتیو هێزە هاوپەیمانەکانو غروریکی سەیر چووە کەللەیانەوەو، وای لێهات تورکیا لەڕێگای هێزی P.M.Fەوە وئەمریکا لەڕێگای دەسەڵاتی سیاسیو موخابەراتی لەناوچەکەو کۆماری ئیسلامیو سوریا پێش هەمووشیان عێراق بەئاشکرا دەست لەکاروباری ناوخۆی کوردستان وەربدەن بەناوی ئاشتییەوە هەڵەیەکی‌تری مام جەلالیش ئەوەبوو کەدەستی کرد بەگفتوگۆ لەگەڵ بنەمالەدا بەنیازی گەڕاندنەوەی ئاشتی بۆ مالی کورد. ئەم کارەی مام جەلال جگەلەوەی کەدەنگی نارەزای بەرامبەر هاتنی دەبابەکانی ڕژێمی لەناو پارتی کپ کردەوە، لەهەمان کاتدا لەگەورەی خیانەتی ۳۱ ئابی کەمکردەوە، بۆ نمونە لەدوای گفتوگۆکان یەکسەر لەڕاگەیاندنەکانی یەکێتی دەسکرایەوە بەڕێزگرتن لەوبنەمالەو بێدەنگی لەسەر خیانەتەکە، کەئەمە بۆ خۆی سەرکەوتنێکی‌تری بنەمالە بوو. هەروەکو پێشتر باسمانکرد هەرچوار دەولەتە ئیقلیمیەکە بەئاگاداری ئەمریکا دەستیان هەبوو لەسەر خستنی پلانەکە، کە لەلایەن کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانیەوە بۆ زیاتر کۆکردنەوەی سەرمایە داڕێژرابوو. پارتیش لەلایەن هەرچوار دەولەت پەسندترە لەیەکێتی، هەربویە ئێران کەپارتی هێرشی بۆ ناوچە سنووریەکانی هێنا هیچ دەنگی نەکرد، دووساڵ بەر لەو ڕۆژە لەکاتێکدا پارتیو بزوتنەوە لەناوچە شاخاویەکاندا لەسەر سنووری ئێران خۆیان مەڵاسدا بوو، هەر کاتێ یەکێتی هێرشی بکردبا یان ئەوان پەلاماری یەکێتییان دابا ئەوا تۆپخانەو

ڕاجمەی ئیرانی ئەوپەری پارمەتی دەریانبوو. هەروەك چۆن ـەقەلادزێ روویدا، کەبووە هۆی بنەماڵەیەکی ٧ کەسی تەنها پیاوەکەیان رزگاری بیت. هەلویستی ئەوکاتی ئەمریکا بەرامبەر ئەو هیرشەی ئیران و دواتر هیرشەکەی رژیمی عیراق کەهەردووکیان لەبەرژەوەندی بنەماڵەو دوژمنانی گەلی کورددا بوو، لەخۆکرکردن و خۆ دزینەوە زیاتر نەبوو. سەبارەت بەئاشتی و پاراستنی مافی مرۆڤیش لەکوردستان لەلایەن ئەمریکاوە من وای دەبینم، چونکە ئاشتی کەمەرجی یەکەمی پاراستنی مافی مرۆڤە لەکوردستاندا لەلایەن ئەمریکاوە هەرگیز کاری جدی بۆنەکراوە. مام جەلالو مەسعود کاتیك لەواشنتۆن بەئامادەیی وەزیری دەرەوە مادلین ئۆلبرایت کۆبوونەوەو دەستیان خستەوە ناو دەستی یەکترو وایان راگەیاند - کەریککەوتون، دوای ئەوە پارتی دەستی کردەوە بەفرتوفیڵ و خۆدزینەوە لەجێبەجیکردنی خالی تایبەت بەداهاتی ئیبراهیم خەلیل بەبیانوی خالی PKK. لەکاتیکدا ئەمریکا گەرمەبەستیبا ئاشتی بۆ ناوچەکە بگەرێتەوە دەتوانێ لەماوەی بیستوچوار سەعاتدا جێبەجیی بکا. نەك هەر لەو رۆژە، بەلکو لە١٩٩٦/٨/٣٠ کاتیك لەبالویزخانەی ئەمریکی لەلەندەن وەفدی هەردوولا بەئامادەبوونی ئەمریکیەکان کۆبوونەوە، هەر ئەوکاتە ئەمریکا دەیتوانی ریگە لەو کارەساتە بگرێ، لەکاتیکدا ئەوان سێ مانگ پیش ئەم رووداوە ئاگاداری هەموو شتیك بوون. بل کلنتۆن پاش ئەم خیانەتە بەوەندە کۆتایی هینا کەوتی: کورد دە بیت میللەت نەبیت، ئەگەر من روس بینم واشنتۆن تەسلیم بکەم،

پاسەوانەکەی خۆم دەبێ بمکوژێ. ئەم قسەیەی کلنتۆن لەپروپاگەندەیەکی سیاسی بۆ حزبەکەی زیاتر نەبوو، چونکە ئەو ئەگەر راستی دەکردو ئەم کارەی بەخیانەتی گەورە دەزانیو بەرژەوەندی کوردی دەویست، ئەوا دەبوو لانیکەم پەیمانەکانی خوی جیبەجی کردبا بەرامبەر بەکورد، لەکاتیکدا هیچ لەسەر ئەمریکا نەدەکەوت، بەلکو بەپیچەوانەوە دەیتوانی بیکاتە پروپاگەندەیەکی سیاسیو لەهەمان کاتدا مرۆیی. لەمیژووی سیاسی ئەمریکادا پلانو بروپاگەندەی ئاوامان ئەوەندە زۆرە کەوامان لی بکا دلنیابین لەوەی ئەم قسەیە لەپروپاگەندە زیاتر نییە، بەلکو هەولە بۆ خودزینەوەی لەرای گشتی گەلی ئەمریکی کەبەلینی پیدابوو نەهیلێ سەدام پەلاماری کورد بداتەوە ودریژە بەسیاسەتی دژ بەمرۆڤایەتیەکانی بدات لەم ناوچەیە.

بۆ نمونە: بەکریگیراوەکانی کوبی بەیارمەتی ئەمریکا بەفرۆکەو کەشتی لەجزیرەی أم الخنازیر هاتنە خوارێ بەنیازی داگیرکردنو ئینقلاب لەکوبابو لەناوبردنی کاسترۆ. بەلام هیزەکە تیکوپیك چوو بەجۆریکی خراپ شکان، بەشی زۆری بەدیل گیران، یا خنکان، یاکوژران. ئەمە سەرکەوتنیکی گەورە بوو بۆ گەلی کوبا بەتایبەتی بۆ سەرۆك فیدل کاسترۆ، کەبووە هۆی مانەوەو پیلانەکانی ئەمریکا سەرکەوتوو نەبوون تاکو ئیستاکە. جون کەنەدیکە ئەو کاتە سەرۆك کۆماری ئەمریکا بوو وتاریکی میژووی پیشکەش بەگەلی ئەمریکی کرد دەربارەی ئەو روداوە لەسەران سەری جیهاندا بلاوبوەوە، دەستی کرد بەپاکانەکردنو پارانەوە بۆ بەرژەوەندی ولاتەکەیو حزبەکەی کەبەهیچ جۆریك

ئاگاداری ئەم بریارە نەبووە کەC.I.A پێهەستاوەو یارمەتی ئەو خەلکە کوبیانەی داوە، بۆیە بریارم داوە لەم مەسئەلەیە بکۆلمەوە. دالاس کەچواردە سال و چوار مانگ بەرپرسی گشتی C.I.A بوو لەبیرەوەریەکانی خۆی کەماموستا عبدالمعتصم تەرجەمەی کردوە سەر زمانی عەرەبی. رونی کردۆتەوەو بەئاشکرا دەلیت: ئەم جۆرە رووداوە گرنگانە دەبیت بریاری سەرۆك کۆماری لەگەلدا بیت بۆ ئەوەی جیبەجی بکریت، من وا دوای ئەو هەموو ماوەیەی سەرپەشتی C.I.A م کرد خۆم لەو مسئولیەتە کیشایەوە، چونکە بۆم نییە لەسەر ئەم کیشەیە هیچ شتیك بلاوکەمەوە تاکو راستیەکان ئاشکرا کەم.

وشەکانی دالاس ئاشکرای دەکات کەچون کەنەدی درۆ دەکات، منیش بۆم هەیە رای خۆم دەربرم و بلیم جەنابی بل کلنتۆن راستی نەکرد ئەگەر بێئەدەبی نەبیت لەرووی جەنابت درۆت فەرموو لە ۱۰۰٪ ئاگاداری هەلویست و رەفتاری مەسعود و سەدام بویت. بۆ خاتری سەلامەتی بیرە نەوتەکان و هەلبژاردنەکەو بەرژەوەندی حزبەکەتە ئەم فەرمانەی بەریزتان C.I.A چەسپاندیی بەسەر بنەمالەو سەدام دوا رۆژیش کش مەلیکی تیدایە.

ئیستعماری ئەمریکی سیاسەت و پیلانی لەجیهاندا بۆ بەرژەوەندی خۆی دادەریژی، سەرپەرشتی لەریگای کۆمپانیای نەوتی جیهانی ئەمریکی بکریت و هەروەها بازاری چەك فرۆشتن زال بیت بەهۆی ئاژاوەو ناکۆکیی و شەر بوو ئەوی لەهەموو شتیك گرنگتر ئەوەیە کەهەرچی سەروەت وسامانی جیهانی هەیە

بخريته ناو بانكەكانى ئەمريكا بەردەوامە لەم پيلانەو سياستەى هەيە ئەوەيە هەر وڵاتيك حكومەتيك نزيك بيتەوە خۆى تەسليمى ئەمريكا بكات، هەميشە ژيرخانى بەتاڵ دەبيت. جا ميللەت برسى دەبن يان نەخۆش، يان دەكوژرين گرنگ نييە.

ئەوەى باسى ئەكەم مەسئەلەيەك نييە هيچ حسابيكى بۆ بكات، تەنها هەر پيى‌ەبەرزبيت‌و خۆش بيت ئەمريكا.

دەستيكى باڵاى هەيە لەئينقلاب لەسەران سەرى جيهاندا، چ دوور خستنەوە يا هينانەوەى سەرۆك وڵاتەكان، هەروەها دەست بخاتە ناو جەرگەى گروپە سياسيەكان المعارضة فەرمانيان بەسەردا پەسەند بكات، هەر سەركردەيەكى گەورەى وڵاتيك يا گروپيك كەبە فەرمانى ئەو بجوليتەوە تيرۆركردنى يا گرتن‌و فراندن يەكيك لەم سييانە بەرەنگارى دەبيتەوە.

بۆ نمونە: كاتيك دكتۆر محەمەد موسەدەقى سەرۆك وەزيرانى ئيران لە سالى ١٩٥٣دا نەوتى ئيرانى خۆماڵى كرد، چلكاوخۆرەكانى ئيران لەگەل شادا قوچانديان‌و رۆيشتە دەرەوەى وڵات بەفەرمان‌و پيلانى ئەمريكا، ئەوەبوو ژەنەراڵ زاهيدى، كودەتاى كرد بەسەر حكومەتى دكتۆر محەمەد موسەدەقداو شا گەرايەوەو حوكمرانى ئيرانى گرتەوە دەست.

بەلام ئيستعمارى ئەمريكى جێى پێلەق كردو لەسالى ١٩٧٩ لەئيران رۆيشتە دەرێ بەيەكجارى، بەهەمان شيوە ئيستعمارى ئەمريكى بەعسى هينايە سەر حوكم‌و لەناو ئەو هەموو رۆشنبيرو سياسەتمەدارانە سەدام حسەينى هەلبژارد تاكو ببێ بەسەرۆك كۆمار. ئينجا شەرى ئيرانى پيكردو دواى هەشت

ــان کەجەنگ راوەستا، ئینجا کویتی پی داگیرکردو ئەو
ـیرۆخەی ئیستای هینایە کایەوە کە لەسایەیدا هەموو
ـدۆلەتەکانی کەنداوی تووشی قەرزاری کرد، لەلایەکەوە بازاری
ـرۆشتنی چەك بردویکی گەورەی هەیە لەلایەکی‌تریشەوە کرینی
ـەوت و فرۆشتنی هاتە ژیر کۆنترۆلی کۆمپانیای نەوتی جیهانی
ـەمریکی.

یەکیك لەچالاکیەکانی دەزگای CIAی ئەمریکایی پلاندانانە
بـۆ فراندنی سەرکردەیەکی ناسروای سیاسیی کورد، ئەمەش
بـەئاگاداری دەزگای میتی تورکیی و دەزگای موسادی
ئیسرائیلی و لەبەرچاوی هەموو جیهاندا کرا، ئەوە بوو عەبدوڵا
ئۆجەلانی سەرۆکی PKK فریندراو درایە دەستی تورکیا،
دوژمنی کورد.

ئەم هەلویستەی ئەمەریکا ئەوە دەگەیەنیت کەئەمریکا،
هەرگیز ریگا بەکورد نادات لەبەریوەبردنی کاروباری خۆیاندا
ئازادبن، یان دەولەتیکی سەربەخۆو یەکگرتوویان هەبیت،
هەروەها ئەم هەنگاوەی ئەمەریکا ئەوەش دەگەیەنیت کەهەر
پارت یان سەرکردەیەکی کورد، ئەگەر ملکەچی رینماییەکانی
ئەمریکا بەتایبەتی لەکوردستاندا، نەبیت ئەوا چارەنووسی
بەچارەنووسی دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملو، دکتۆر
شەرەفکەندی و عەبدوڵا ئۆجەلان دەگات. هەروەها ئەو سەرۆك و
سەرکردەیەی فەرمانەکانی ئەمەریکا جیبەجی دەکات و
گویرایەلی رینماییەکانی دەبیت ئەوا وەکو بنەمالەی بارزانی

دەبێتە خاوەن ماڵو سامانو پارەی زۆرو هێزێکی چەکداری گەورەشی دەبێت.

بەڵام لەراستیدا خیانەتی نەتەوەیی و نیشتمانی مایەی سەرشۆڕی و قوربەسەرییە، ئەوەتا وەکو دەبینین بنەماڵەی بارزانی بڕوای گەلی کوردیان لەدەست داوەو نزیکەی ٩٠٪ی کۆمەڵانی خەلکی کوردستان ددانی خێریان پیدا نانێن، هەرچی ڕێژەی ١٠٪ی کەماوەتەوە لەژمارەیەکی بەکرێگیراوی میتو موسادو دامودەزگا داپڵۆسینەرەکانی بەعس زیاتر نین.

## دیگۆل کردی، ئەدی ئێوە بۆچی نایکەن

*تێبینی/*

*لەبەرگی دووەم کورد دوژمنی خۆت بناسەلاپەرە ٣٤٢-٣٤٣-٣٤٤*

لەو سەرچاوەیەی سەرەوەدا باسی ئەوەم کردووە کەسەرۆکی هەردووك حزب پێویستە بۆ چارەسەری شەری ناوخۆ دەست لەکار بکێشنەوە. هەروەها وتبووم کەپێشنیاریکی ئاوا بەو ئەندازەیەی لەسەر شانی مەسعود بارزانی قورسە (تارادەی مستحیل) ئەوا لەبەرامبەر پیاویکی شۆرشگێری وەك جەلال تالەبانی دڵنیام کاریکی ئاساییە بەمەرجیك دڵنیا بێت لەوەی کەکێشەکان بەو ڕیگایە چارەسەر دەکرێ و بنەبر دەبێ. من خۆم گومانم نییە لەوەی بەرێز جەلال تالەبانی لەبەر ئەوەی خۆی خۆی دروست کردووەو بەرەنج و لیهاتوویی خۆی سەرکردایەتی یەکێتی گرتۆتە دەست، بەدەست کیشانەوەی لەسەرکردایەتی حزبەکەشی لەدلی خەلك و جەماوەری کوردستانو ولاتانی

جیهانیشدا هەر جێی ریزو خۆشەویستی دەبێ، بەڵام کەسیکی وەکو مەسعود کەدەسەڵاتەکەی میراتی باپیەتیو بەپیی یاساکانی خیڵ کەوتۆتە دەستی هیچ کات نەیتوانیوە ئەو دەسەڵاتە بەئاقاری خزمەتکردنی نەتەوەی کورددا ئاراستە بکا، بەڵکە هەردەم هەموو کوردو پارتی کردووە بەقوربانی بنەماڵەو خواستەکانیان. بۆیە ناویرێ بیر لەو کارە بکاتەوە.

لەمیژووی سیاسی زۆر لەگەلانی جیهاندا سەرکردەی راستگۆو شۆرشگیری وامان بینیوە کە لەپیناوی جەماوەردا دەستیان لەکار کیشاوەتەوەو پۆستی سەرکردایەتیو سەرۆکایەتییان بۆ نەوەی نوێو گەل چۆلکردووە. دیگۆلی فەرەنسی نمونەیەکی بەرچاوی ئەو حالەتەیە، کە لەکاتی داگیرکردنی پاریسدا ئەو تاکە سەرکردەی سەربازی بوو کەئامادە نەبو مل بۆ ئەو واقعە بدا، بۆیە لەبەریتانیاوە دەستی کردبە سەرلەنوی ریکخستنەوەی خەلکی فەرەنسا تا توانی دواجار نازییەکان بەسەرشۆری لەوڵاتەکەیدا بەدەرنێ. دیگۆل بەم کارەی بوو بەسەرۆك کۆماری فەرەنساو بەرەمزی نەتەوەیی فەرەنسا ناوزەد کرا. بەڵام لە١٩٦٨دا پاش ئەوەی خویندکارانو لاوانی فەرەنسا لەچوارچیوەی ئەو پەشیویو ئالۆزییەی هەموو رۆژئاوای گرتەوە (١٩٦٤ لەواشنتۆن، ١٩٦٨ لەپاریس)، پاش ئەوەی ئەو خویندکارو لاوە فەرەنسییانە رژانە سەر شەقامو خۆپیشاندانی گەورەیان سازدا بێ ئەوەی هیچ داوایەکی ئاشکراو رەوایان هەبێ، دیگۆل دەستی لەکار کیشایەوەو خۆی خانەنشین کرد.

جگە لەوەش گیڤارا نمونەی هەرە گەورەی ئەم هەلویستە خەمخۆرەی گەلە.

بەهەر حاڵ.. بەرای من سەرەکیترین هۆ کەپیشنیاریکی ئاوا بنەمالە بنەبر دەکاتو نەکراوە، جگە لەهۆکاری خیلەکی، هۆکاری خیانەتە. چونکە پاش ١٩٧٥و ئاشبەتالی بنەمالە بەشۆرشی کورد، دوژمنان بۆیان دەرکەوت کەدەکرێ لەریگای ئەو بنەمالەیەوە گورزی کوشندە لەناوەوە لەکورد بوەشینرێ، بەتایبەتی پاش ئاشبەتال کەخەلکی شۆرشگیرو کوردپەروەر لەدەرەوەی بنەمالە کۆبوونەوەو دەستیان بەدامەزراندنو ریکخستنی حزبی نویی کوردی کرد، بۆ دریژەدان بەخەباتی رزگاری نەتەوەیی. لیرەوە بنەمالە وەکو بۆمبی کاتی دووبارە خرایەوە ناو شۆرش. ئەگەر نا ئەوا دەبوو ٢٣سال پیش ئیستا مەسعود بەقسەی برای بەریز پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەجیدی کردبا کەرووبەروو داوای دەست لەکارکیشانەوەی خۆیو باوکیو سەرکردایەتی پارتی کردبوو لەپارتی بەمەبەستی خزمەتکردنی کورد، کە لەخوارەوە دەقی ئەم قسەیە بۆ خوینەری بەریز دەگوازمەوە، بەو هیوایەی زیاتر بۆی رۆشن بیت دوژمنی کورد کییە، کە لەکتیبی *(النفط والاکراد- بقلم کمال مجید، بروفسور في جامعة کاردین في بریطانیا، ١٩٩٧، ص١٥٢)* کە دەلیت: *(في اجتماع مع مەسعود البارزاني في برنهام مع العضو سردار حمه ئاغا وجمال علمدار والدکتور جمال الصالحي مع عدد اخر من الاکراد سنة ١٩٧٧ شرح لنا مسعود تفصیل العلاقات الکردیة – الامریکیة وبعد ان انهی حدیثة اقترحت علیه*

بأن يقوم كافة اعضاء اللجنة المركزية للحزب الديمقراطي الكردستاني بمن ذلك هو والده مصطفى بتقديم استقالتهم من الحزب ثم الاعتزال عن السياسة كليا لكي يفسحوا المجال للكوادر الجديدة في حزبهم لقيادته. واكدت له بأن القيادة القائمة قد فشلت في مهمتها وانفضحت عمالتها. ولو سمع مسعود كلامي وحاول أن يستفيد ولو قليلا من اقتراحي هذا في ذلك الحين لكان بالأمكان التخلص من القتال الدموي الذي استمر بين حزبه وحزب جةلال الطالباني. إلا أن مسعود اعتقد خطأ بأنني اقصد تحقيره وتحقير والده وقيادة حزبه. لقد حاولت مدة ساعة كاملة لكي اقنعه بأن اقتراحي وجيه وضروري لإنقاذ الشعب الكردي من المصائب التي جلبها الحزبان الكرديان. ولو سمع مسعود نصيحتي وحاول ان يجد فائدة واحدة من اقتراحي لكان الشعب الكردي في حالة أحسن بكثير مما هو عليه الآن. ولكن القاتل يبقي قاتلا كما تؤكد البحوث العلمية في الجرائم. ومنذ ذلك الحين اشعر بالفخر لأنني تجنبت هؤلاء القتلة ورفضت الكلام معهم بل قضيت معظم وقتي اعمل مع ابناء شعبي لفضحهم وفضح علاقاتهم بالمخابرات المركزية حاشا ابناء الشعب الكردي المنكوب على مقاطتهم وعزلهم واعتبارهم اعداء هذا الشعب).

بەم شیوەیە ئەو بنەماڵەیە، بوونەتە بەردی ناوکانی، نەخۆیان ئاودەخۆنەوەو نەریگا دەدەن خەڵك ئاو بخواتەوە. بەتایبەت دوای ئاشبەتاڵ، چونکە تا ئەوکاتە پارتی گەورەترین حزب بوو، بەڵام دوای ئەو کارەساتەو هەڵاتنی بنەماڵە لەبەرپرسیاری میژوویی خۆی، خەڵکی کوردستانی باشوور بەخۆیاندا

چونەوەو بیریان لەریگای حزبیکی تازەکردەوە بۆ رزگاری. ئەو گۆرانکارییە وای کرد ئەندامانی پارتی دابنیشن‌و لەسیاسەت دوور بکەونەوە لەسەر شیوەی مەلا مستەفا کەچووە کەرەج‌و خۆی گۆشەنی دەستی کرد بەخوداپەرستی! یان لەریگای یەکیتی‌و حزبە تازەکان دریژە بەشۆرشی نوێ‌و خەباتەکەی بدەن.

بۆیە بنەمالەو پارتی بەمەبەستی ریگرتن لەسەرکەوتنی شۆرش‌و بەدیهاتنی ئامانجەکانی ناچار پەیوەندییانکرد بەخەلکانی جاش‌و دژە شۆرش بۆ دووبارە خۆدامەزراندنەوەو پێ گرتنەوەیان. بەتایبەتی دوای راپەرینی بەهاری ١٩٩١کە جەماوەر بەپالپشتی هیزی پیشمەرگە، توانییان کوردستانی باشوور لەژیر چنگی داگیرکەران دەربینن. لەدوای ئەو وەرچەرخانە گەورەیە لەبزاڤی رزگاریی نەتەوەکەماندا پارتی بەبەرنامە دەستی کرد بەپارە رشتن بۆ پیاوانی پیشوی رژیم‌و پاریزگاری کردنیان. تا رادەی گرتنەخۆی چەندین کەسی وا کەهیشتا دەستیان سووربوو بەخوینی پیشمەرگەو خەلکی رەش‌ورووتی کوردستان، لەوانە تەحسین شاوەیسی لەگەرمیان‌و عەباس بایز بالۆ لەپشدەرو حمە خانی حاجی دارا لە زەرایەن‌و چەندین دوژمنیتری کوردو کوردستان.

ئەو حالەتی کۆبوونەوەی کۆنەجاش‌و بەعسی لەپارتی وەنەبیت هەر بریاریکی سیاسی سەرکردایەتی پارتی‌و بنەمالە بووبێ، بەلکو دوورنییە ئەمە نەخشەیەکی گەورەتر بێ‌و لەلایەن

ڕژێمی عێراقەوە داڕێژرابێ بۆ پارێزگاریکردنی پیاوەکانی خۆی لەدەست جەماوەری ڕاپەڕیوو حزبە تێکۆشەرەکان.

بۆیە بەعس لەیاداشتی ئەمەدا هەرگیز کۆمەکی ماددیو مەعنەوی لەپارتی نەبڕیوە، کەئاشکراترینو زەقترینیان خیانەتی ٣١ی ئاب بوو، کەئەگەر تا ئەو کاتە پەیوەندی نێوان بنەماڵەو ڕژێم بەنهێنی بوو بێ، ئەوا لەو ڕۆژەوە ئاشکرا بوو کەبەعس ئامادەیە بەهێزترینو باشترین سوپای خۆی بەکاربێنێ بۆ پاراستنی دەسەڵاتی بنەماڵە کەدرێژبوونەوەی ناڕاستەوخۆی دەسەڵاتی بەعسە.

بەکورتی دەمەوێ ئەوە بڵێم خودی پێکهاتەی پارتی لەدوای ئاشبەتانو بەتایبەت دوای ڕاپەڕین ناچێتە خانەی حزبی شۆڕشگێڕی کوردییەوە، بەڵکو دروستکراوێکی دەستی بێگانەیە کە لە١٩٧٤ەوە لەکاری تێکدەرانە زیاتر هیچیتری نەکردووە. بۆیە دڵنیام ئەگەر لەکوردستاندا هەڵبژاردنێکی ئازاد بکرێ، ئەوا جگە لەپیاوانی ڕژێمو ئەڵقەلەگوێکانی داگیرکەران کەسیتر دەنگ بەو بنەماڵەیە نادا. بەپێچەوانەی حزبە شۆڕشگێڕە کوردییەکان، کەلایەنگرو ئەندامەکانیان کوڕانی ڕۆژانی سەختو شۆڕشن. لایەنگرانی بنەماڵە وەنەبێ هەر لەکوردستانی خۆماندا خەڵکانی کوردپەروەر نەبن، بەڵکە لەهەر چوار پارچەدا لەبەر مێژووی پیسیان بوونەتە دوژمنی کورد لەهەر جێیەك بن، وەکو لەخوارەوە باسی دەکەم:

١- کوردستانی باکوور/ بنەماڵە بەهۆی هەڵوێستی دوژمنکارانەی بەرامبەر دانیشتوانی ئەم ناوچەیەو بەهاندانی

رژێمـــی تورکـــی، ئەمـــە وای کـــردووە پـــارتی بـــەردەوام وەك لەشکرێکی تورکی تەماشا بکرێ کە لەئەستەمبوڵەوە رێنمـایی دەکرێ. بۆیـە P.K.K هـەر لـەرۆژی دامەزراندنیـەوە تـا ئـەمڕۆ لەلایـەن پارتیـەوە سەرسـەختانە دوژمنایـەتی دەکـرێ، لـەو چواچێوەیـەدا چـەندین جـار پێـش لەشـکری تـورك کـەوتوون. هەموو ئەوانە وای کرد کوردەکانی تورکیا ئەو بنەماڵەیە نەفرەت بکەن و دژایـەتی حزبەکـەیان رابگەیـەنن. لایـەنگرانی پـارتی لـەو بەشـە گـەورەی کوردسـتاندا تەنـها ئەوانـەن کـەپیاوی رژێمـی تورکـن. بۆیـە دلنیـام ٥٪ زیـاتری خـەلکی کوردسـتانی بـاکور لایەنگری پارتی نین.

٢- کوردسـتانی رۆژئـاوا سـوریا / بـەهۆی دەسـتی تێکـەڵی و هاوکـاری بنەماڵـە لەگـەڵ میـت و موسـاد و موخابـەراتی عـیراق و وەستانیان دژی خەباتی رەوای گەلی کـورد لەسوریا و، بەتایبـەت پاش هەولە زۆرەکانی حافز ئەسـەد بـۆ دوورخسـتنەوەی پـارتی لەبـەعس و دواجار بێهیوابوونیـان لـەپارتی لـەپاش ٣١ی ئابـەوە، جگـە لەدژایـەتیکردنیان بـۆ P.K.K. هـەموو ئەوانـە وای کـرد کـەپارتی لـەو ناوچەیـەدا لایـەنگری بەشـیوەیەکی بـەرچاو روو لەکەمی بکات.

٣- کوردســـتانی رۆژهـــەڵات (ئـــیران) / لـــەدوای ١٩٦٣وە نزیکبوونـەوەی بنەماڵـەی بارزانی لەبنەماڵـەی شاهەنشـای ئـیران، بەشیوەیەکی ئاشکرا بنەماڵە دەستی کرد بەدژایـەتیکردنی حزبـە کوردییەکانی ئیران. ئەوە بوو مەلا ئاوارەو فایەق کەدوو کادری ناسراوی حزبی دیموکرات بوون شـەهید کران. بەهاتنی کۆماری

ئیسلامی بۆ سەر کار پارتی گورجتر نەخشەکانی تارانی جێبەجێ دەکردبۆ لەناو بردنی حزبی دیموکرات و کۆمەلە، بۆ ئەم مەبەستە هەموو هێزو تواناکانی خۆی خستە خزمەتی چەسپاندنی دەسەلاتی کۆماری نوێ لەئیران، ئەو شوێنانەی حکومەتی ئیران دەستی پێی نەدەگەیی لەبەر سەختی یان دووری لەناوەندی دەسەلات، ئەوا پارتی لەشکرکێشی دەکردە سەرو وەك هێلکەی پاککراو دەیبەخشیە دەستی رژێمی ئیرانی.

خەلکی ئیران هەرگیز ناتوانن ئەو رۆژانە لەبیر بکەن کەخودی مەسعود بارزانی سەرپەرشتی ئەو هێرشانەی دەکرد دژی گەلی کورد لەئیران و هەرەشەی لێدەکردن کەدەبێ گوێرایەلی فەرمانەکانی بنەمالە بن، کە لەراستیدا فەرمانی تاران بوو. لەکاتێکدا یەکێتی پەیوەندی کوردانەی توندوتۆلی لەگەل حزبەکانی ئیراندا هەبووەو، چەندین جار کۆمەکی کردوون بەتایبەت حزبی دیموکرات. خودی شەهید دکتۆر قاسملۆش هاورێ و هاوخەباتێکی نزیکی مام جەلال بوو. لەشۆرشی ئیراندا دژی شا، یەکێتی هاوشانی برا کوردەکانی لەو ناوچەیە راپەری و بەشداری کاریگەری کرد لەبەشی کوردستاندا. تاکە گلەیی و گازندەی کوردەکانی ئیران لەیەکێتی، ئەوەیە کە لە١٩٩٦دا ئیران لەژێر دەسەلاتی ئەواندا هێرشی کردە سەر سەرکردایەتی حزبی دیموکرات لەکۆیە. لەراستیدا ئەم هێرشە نەك هەر لەسەر خواستی یەکیەتی نەبووە بەلکو یەکیەتی هەولی زۆریدا بۆ ئەوەی ئیران لەکارێکی ئاوا پەشیمان بکاتەوە. بەلام پاش ئەوەی یەکیەتی دلنیابوو لەوەی ئیران ئەو بریارەی خۆی

دەباتەسەرو گوێ بەهیچ نادا، ناچار لەریگای دکتۆر فوئاد مەعسومەوە ئاگاداری دەفتەری سیاسی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران کرایەوە کەهیرشیان دەکریتە سەرو بۆردومان دەکرین. بۆیە حزبی دیموکرات هەرزوو فریای خۆیان کەوتن و خۆیان پاراست، لەئەنجامی ئەو هیرشە گەورەیەی ئیران تەنها دوو مریشك و سێ خانوو زیانیان بەرکەوت !! نابێ ئەوەشمان بیربچێ کەپارتی لەو ماوەیەدا بەجۆریك دەستی لەگەڵ رژیمە داگیرکەرەکاندا تیکەلکردبوو کەیەکیەتی خستبووە باریکی ناهەموارەوە.

ئیرانیش لەباریکی ئاوادا توانی پەستانی زیاتر بخاتەسەر یەکیەتی تا نەسیلێ ریگای لێ بگیرێ. ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کەسەرکردایەتی حزبی دیموکرات ئەو راستییە دەزانن کەیەکیەتی ئاگاداری کردوونەوە لەو هیرشە، بەلام تاکو ئیستا خۆیانی لێ بیدەنگ دەکەن و بۆ کوردی رۆژهەلاتی راناگەیەنن کەیەکیەتی چۆن هەولی داوە بیانپاریزێ. بەلام هەرچی پارتییە ئەوە چەندین جارو لەچەندین کات و شوینی جیاوازدا گورزی جەرگبری لەبزاقی کوردی ئیران داوە، کەخەلکی کوردستانی ئیران هەرهەمووی دەزانیت.

٤- کوردستانی باشوور/ لەپاش راپەرینەوە خەلکی کوردستانی باشور بەهای پارتییان بۆ دەرکەوت، بەلام بەهۆی کۆمەکی ماددی رژیمەکانی عیراق و تورکیاو نەیارانی کورد، بنەمالە توانییان خۆیان لەگۆرەپانەکەدا بسەپینن. ئیستا پاش شەری ناوخۆی دووردودریژ کوردستانی ئازاد بەسەر دوو رژیمی

سەرەکیدا دابەشبووە، هەریمی یەکیەتی کەئەگەرچی لەپاش ٣١ی ئابەوە لەرووی جوگرافییەوە لەهەریمی پارتی بچووکترە، بەلام ئیدارەیەکی دیموکراتیو کوردانەی تیدایە، کە لەسایەیدا هەموو حزبو ریکخراوە شۆرشگیرەکان ئازادانە کارە سیاسیەکانی خۆیان ئەنجام دەدەنو زۆرجار لەو سنوورەدا هەلبژاردنی فراوان ئەنجام دراوە کەدواترینیان هەلبژاردنی شارەوانی بوو. کەخەلك بەو پەری ئازادییەوە متمانەی خۆیان بەنوینەرانی یەکیەتی بەخشی لەهەرە زۆری ناوچە جیاجیاکاندا.

هەرچی هەریمی پارتییە، ئەوا زەبروزەنگی دەسەلاتو کۆمەکە ئاشکراکانی لەشکری تورکو عیراق وای کردووە خەلکی لە ترسانا نەویرن نارەزایی دەرببرنو بلین نا. بەتایبەت پاش ئەوەی لە٣١ ئابدا تانکەکانی گاردی کۆماری عیراق بەئاشکرا لەهەولیردا هاتوچۆیان دەکرد بیئەوەی ئەمریکا هیچ هەلویستیکی جددی وەربگری. ئەوە وای کرد کەخەلك پارتی وەك ئەمری واقیع وەربگرنو نەویرن رووبەرووی بوەستن. بەلام لەناخیاندا لەپارتیو بنەمالەی بارزانی دەبیزنو خەون بەو رۆژەوە دەبینن کەئەو بارە قورسە لەسەر شانی میللەتەکەیان لادەچیو بۆیەکجاری لەکۆلیان دەبیتەوە، هەر بۆیە پارتی بەردەوام خۆی لەهەلبژاردنەکان دەدزیتەوەو ناویری خۆی بداتە دەست خەلك. چونکە دلنیایە لەهەلبژاردنیکی وەك شارەوانیدا ٢٠٪ ی دەنگەکان زیاتر ناهینی، ئەگەر نوینەری هەموو حزبە کوردیەکان بەیەکیتییەوە تییدا بەشداربن.

## راستیی ڕووداوەکانی ساڵانی ١٩٦٣ تا ١٩٨٤

شۆڕشی تەمووزی سالی ١٩٥٨ ڕودایکی گرنگ بوو لەمێژووی گەلەکەماندا، چونکە بووە هۆی ئەوەی خۆشی و شادی بچێتە ناو مالی هەموو کوردپەروەرێکەو، هەموو کوردیك بروای وابوو کەکوردستانی باشور ڕزگاری دەبێ و، دەبێتە نمونە بۆ پارچە داگیرکراوەکانی‌تری کوردستان. هەر بۆیە پەنابەرانی کورد لەهەرسێ بەشەکەی‌تری کوردستان گەرانەوە کوردستانی باشورو ڕوویانکردە حزبەکەیان پارتی دیموکراتی کوردستان. پارتیش بەگەرمی پیشوازی و بەخیرهاتنی‌کردن و ڕیزی زۆری لینان، لەو بەریزانەی من پەیوەندیم پیوەکردن و دۆستایەتیم لەگەلدا دروستکردن، خوالیخۆشبوو دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملوو شاعری گەورەی کورد جگەرخوین بوو. بەلام مەلا مستەفاو بنەمالەکەی ئەو دەرفەتە گرنگەشیان لەکورد بەبادا و نەیانتوانی کەلکی لیوەربگرن بۆ بەرژەوەندی گەلەکەمان.

من لەبەرگی دووەمدا لاپەرە ١٨٦ و ل ١٩٠ تاکو ل ٢١٥ بەکورتی باسی ئەم ڕووداوەم کردووەو، لە ل ٢١٦ ئامارژەم بەوەداوە کەماوەی نیوان سالی ١٩٦٣ تا ١٩٨٤ دەپچرم، بۆیە لەم بەشە بەدواوە بەپیویستی دەزانم ئەو ماوەیە دووبارە بخەمە بەر باس و نوسین تاخوینەری خۆم زیاتر ئاگادار بێ بەرووداوە گرنگەکانی ئەو کاتەو هەلەو کەم و کورتی هەموو لایەك.

هەمووشمان دەزانین ئەو ماوەیە بۆ گەلی کورد زۆر گرنگ و پر

بایەخەو، لە بەرئەوەی زۆر لەکادرە ناسراوەکان ناو پارتی، ئەوانەی بەخەم راستیی گەلەکەیانەوەن داوایان لێ کردم کەچی دەزانم لەسەر ئەو ماوەیە ئاشکرای کەم. منیش هەر وەك بەلینم داوە ئینشائەللا دریغی ناکەم لەئاشکراکردنی هەمووی ئەو نهێنییانەی لەسەر مێژووی خەباتی گەلەکەمان دەیزانم. تا بتوانین بەهەموومان هاوکاری بکەین لەرزگاربوون لەدوژمنەکانمان.

پاش شۆرشی تەمموز، خودی مەلا مستەفا فەرمانی بەسەرۆك هۆزەکان کرد چەك دژی شۆرش هەلبگرن، چەند سەرۆك هۆزیك ئەم فەرمانەی بارزانییان جێبەجێ کردوو، رووبەرووی لەشکری عەبدولکەریم قاسم وەستانەوە. لەئەنجامدا چەکداری هۆزەکان شکان و بلاوەیان لێ کرد، مەلا مستەفا پاش ئەم تێکشکانە لەناوچەی بەرواری بالا لەسەر سنووری تورکیا خۆی شاردەوەو، خۆی خستە بارودۆخیکی تاریك و نادیار چونکە هیچ حکومەتیك ئامادە نەبوو بەپەنابەر وەریبگرێ و، ئەمریکا، ئێران، تورکیا و سوریا هیچ کامیکیان وەلامی نامەکەیان نەدایەوە. بۆیە ناچار هاواری لێهەلسا و پەنای بردە بەر عومەر دەبابەو مەلا ماتۆرو عەلی عەسکری و مام جەلال، یەکەیەکە چاوی پێیان کەوت و گفتوگۆی لەگەلداکردن و، لەئەنجامدا توانی پشتگیری ئەمانە بۆلای خۆی رابکێشێ.ئەوەبوو ئەم چوار شۆرەسوارە بوون بەکەوا سپی بەر لەشکرو، توانییان بەتیکرایی برادەرانی لیژنەی مەرکەزی

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بۆلای خۆیان رایکیشن، لەدوای بریاری شۆرشی ئەیلول لە١١ی ئەیلولی ١٩٦١دا درا.

لەو کاتەدا مامۆستای مەزنو رۆشنبیرو نووسەرو ئەدیبو سیاسەتمەداری بەناوبانگ ئیبراهیم ئەحمەد کەسکرتیری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو سەرپەرشتیبەشی زۆری ناوچەی سۆرانی دەکرد. پلانو پرۆگرامی بۆ دەکیشاو بەخودی سەرپەرشتی هەموو کۆبوونەوەو بلاوکراوەو ئیستگەی دەکرد. کادرو پیشمەرگەکانی پارتی بەگیانیکی فیداکاریو پر لەشۆرشگیرییەوە دەستیان کرد بەجیبەجیکردنی بەرنامەکانی، تا وایلیهات لەسەر فیداکاریو ماندوو نەبوون پیشبرکێ کەوتە ناویان. هەموو ئەوانە وایانکرد گۆرانی چاکی بەسەر کوردستانی باشووردا بێ بەتایبەت ئەو ناوچانەی حزب سەرپەرشتی دەکرد. کوردەکانی ناوچەی دیالە، کەرکوك، سلیمانی، هەولیرو هەموو ناوچە کوردنشینەکانیترو هەتا کوردەکانی بەغداش هەموویان لەگەڵ ئەم بالەی حزبدا هاوکاربوون.

مەکتەبی سیاسی کەبارەگاکەی لەماوەت بوو هەر فەرمانیکی دەرکردبا ١٠٠٪ جیبەجی دەبوو. جەماوەر بەگشتی ئاغا، شیخ، مەلا، مامۆستا، قوتابی، ئەفسەر، سەرباز، جوتیار، کریکار، کاسبو کارمەند هەر هەموویان فیداکاری شۆرش بوون. ئەوەی لەهەموو ئەوانە دلسۆزتر بوو پۆلیس بوو، کەگەورەترین دەوریان هەبوو لەریکخستنو سەرخستنی شۆرشداو، ٩٠٪یان پەیوەندییان بەشۆرشەوە کردووو بەشی هەرە زۆری

مەخفەرەکانیان بەچەك و هەموو كەل وپەلەكانیانەوە تەسلیم بەشۆڕش كرد. پارتی لەسایەی ئەو فیداكارییەی گەلی كورد نواندی هەموو جولەیەكی حكومی ئاگادار بوو، و هیچ شتێكی لێ ون نەدەبوو. هەموو هاولاتییەكی خۆی بەپێشمەرگە دەزانی و ئەم ناوەیان بەردەوام لەسەر زاربوو.

هەر كاتێ پێشمەرگە روویان كردبا گوندێك ئەوا بەگەرمی پێشوازی دەكران و میوانداریان دەكردن. ئەم بارودۆخە دوژمنی ترساند. چونكە یەكەم جاربوو ئەم ناوچەی كوردستانە بەو جۆرە ئاسایش و ئارامی بەخۆیەوە ببینێ و رژێم نەتوانێ دەستی تێ وەربداو تێكی بدا. هەرچەندە پێشینان وتویانە چەم بێ چەقەڵ نابێ بەلام لەگەڵ ئەوەشدا رژێم نەیتوانی لەبەرامبەر ئەم شۆڕشە هیچ هۆزێكی كوردی تیژ بكاو دژی شۆڕش چەكداری بكا. ئەو بارودۆخەی ناوچەی سۆران بەشێكی زۆری بۆ لێنهاتوویی ئیدارەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو مەكتەبی سیاسی دەگەڕێتەوە.. هەرچی ناوچەی بادینانە ئەوا لەلایەن خودی مەلا مستەفاو بەفەرمانی تایبەتی خۆی بەڕیوە دەچوو. حزب لەو دەڤەرە دەسەلاتی نەبوو، بەلكو بنەمالە ئیدارەی ئەم ناوچەیەیان دەكردو كردبوویانە مولكی خۆیان. هەر وەك لە *(الحزب الديموقراطي الكردستاني، اللجنة التحضيرية، أوائل كانون الثاني، ١٩٧٧)* دا هاتووە: *( من المعلوم ان البارزاني كان رئيسا للبارتي منذ تأسيسه، إلا أن الذين عملوا بالقرب منه في الحزب يعرفون أنه لا يؤمن بالعمل الحزبي الصحيح، وأبرز دليل على ذلك هو منعه لأي نشاط حزبي في منطقة بارزان دوما، وكان*

*يعتبر الحزب قوة ثانوية ويحاول التقليل من دوره القيادي ويستفيد منه فقط لأغراض معينة).*

لەهەموو دەڤەری بادینانندا چوار ئاغا حوکمیان دەکردو هەموو شتێکیان لەژێر دەستدا بووو هەموو دارایی لەژێر کۆنترۆلی خۆیاندا بوو، هیچ یاسایەك نەیدەتوانی سنوور بۆ دەسەلاتیان دابنێ. بۆیە دەتوانم بلێم حزبایەتی لەو کاتەدا لەو ناوچەیە قەدەغە بوو.

ناوچەکانی بادینان بەو جۆرە دابەش کرابوون:

١- ناوچەی زاخۆ/ عیسا سوار حوکمی دەکرد.

٢- ناوچەی دهۆك / عەلی خەلیل.

٣- ئاکرێو شیخان/ حەسۆ میرخان.

٤- ئامێدی/ سەعد حاجی شەعبان.

ئیدارەو دەسەلاتی ئەم ناوچەیە لەهەموو روویەکەوە بە بەراورد لەگەڵ ناوچەی سۆرانی ژێر ئیدارەو دەسەلاتی ئیبراهیم ئەحمەد جیاوازبوو. خەلکی بادینان سەدەها جار دەهاتنە لای مەلا مستەفاو شکاتیان لەدەسەلاتداران دەکرد بەلام بێ سوودبوو چونکە دەسەلاتی ئەو ئاغایانە لەراستیدا لەلایەن خودی بارزانیەوە بەخشرابووو، بارزانی هەر خۆی خاوەنی بریارو فەرمان بوو، هەموو توانای خۆی بۆ کۆکردنەوەی سامانو دەسەلاتی زیاتر بوو. هەمان سەرچاوەی سەرەوە دەلێت: *(لم تؤمن قيادة البارزاني يوما بالقيادة الجماعية بمعنى الكلمة، بالرغم من تحدثها عنها. ومن الغريب ان هذة القيادة احتفظت بهذا الرأي حتى بعد النكسة، لقد وضعت هذه القيادة*

*كل الامكانيات المالية والعسكرية وغيرها دونما في يديها واعتبرتها ملكا شخصيا لها واخذت تتصرف بها دون رقابة)* بروانە: *الحزب الديمقراطي الكردستاني، مصدر سابق، ص ٣٦).*

لەگەل هەموو ئەمەشدا دوژمنانى كورد ناچاربوون حساب بۆ شۆرشى ئەيلولى ١٩٦١ بكەن چونكە شۆرشەكە سەرنجى ناوەوەو دەرەوەى بەلاى خۆيدا راكيشاو لەدۆستو دوژمنى گەياند كەگەلى كورد چەند شۆرشگيرو فيداكارە. بۆيە هەموو لايەك دژى ئەم شۆرشە بەخۆكەوت، رژيمى عيراق ئەو حزبانەى نيازى گرتنە دەسەلاتيان هەبوو تا دەولەتە ئيقليمييەكان، ئيسرائيليش هەولیدا بۆ بەرژەوەندييە تايبەتييەكانى خۆى كەلك لەم شۆرشە وەربگرێ. هەر چەندە شۆرشەكە بەناوى پارتىو بەسەرۆكايەتى مەلا مستەفا ناوى دەركرد بوو، بەلام لەراستيدا كاروبارى دەسەلات دوو سەركردە دەيانبرد بەريوە؛ ناوچەى بادينان كە لەلايەن خودى مەلا مستەفاوە سەرپەرشتى دەكرا سۆران كە لەلايەن مەكتەبى سياسىو مامۆستا ئيبراهيم ئەحمەد بەريوە دەچوو.

شۆرش هەر دەهات و بەهيزوترو فراوانتر دەبوو، تا سەرەنجام بەهۆى ئەو پلانەى دانرابوو حكومەتى عەبدولكەريم روخا سەعاتى يەكەم ئيستگەيان كۆنترۆلكردو لەو ريگايەوە داواى نوينەرى شۆرشيان كرد بۆ گفتوگۆ، پاش گفتوگۆيەكى دووروودريژ نوينەرايەتى شۆرشو بەعس نەگەيشتنەيەك، بۆيە شەر لەنيوانياندا هەلگيرسايەوە.

سەردتا حکومەتی مەرکەزی لەناو خۆیاندا بوون بەدوو بەشەوە، بەشیکیان بەسەرۆکایەتی عەبدولسەلام عارف توانی دەسەلات لەعیراق بگریتە دەست، هەروەها بەعسیەکان کەمیشیل عەفلەق سەرۆکایەتی دەکردن. لەئەنجامدا حزبی بەعس دوورخرایەوەو عەبدولسەلام عارف بوو بەسەرۆك کۆمار. عەبدولسەلام عارف دوای ماوەیەك کەزانی بەهیچ جۆریك ناتوانیت بەسەر شۆرشی کوردا زال بیت، بەفیل پەنای بۆ گفتوگۆ برد تا بتوانێ لەو ریگەیەوە پشتی شۆرش لەزەوی بدا. بۆ ئەو مەبەستە کاك (ك)[1] لەلایەن عەبدولسەلامەوە نیردرایە مەکتەبی سیاسی لەماوەت، پیی وتن: من لەلایەن خودی عەبدولسەلامەوە نیردراوم، دەمەویت رووبەروو پیتان رابگەیەنم کەسەرۆك ئامادەیە کیشەی کورد جیبەجی بکات بەمەرجیك مەلا مستەفا دوور بخریتەوە لەسەرکردایەتی شۆرش.

وەلامی مەکتەبی سیاسی و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ئەوە بوو پیی وتن بەکاك (ك) بلین جاریکیتر بەم نیازە گلاوەوە روو بکاتە ئەم ناوچەیە، خراپی بەسەر دیت و هەموو ژیانی لەبەندیخانە دەباتە سەر، ئیمە یەك حزبمان هەیە ئەویش پارتییە

---

[1] کاك ك لەسالی ١٩٩٩ دووبارە ئەم باسەی بەووردی بۆ گیرامەوە، بەداخەوە هەرلە هەمان سالدا کۆچی دوای کرد بەنەخۆشی زەبحە کەماوەی دوو سالبو واتا لەسالی ١٩٩٧ەوە لەسەر جیگا کەو تبوو. ئەوەی بۆ گیراومەوەو منیش سویندم بۆ خوارد لەکتیبەکەم ناوی نەهینم. خەلکیکی زۆریش ناوی ئەو کابرایە دەزانن و ئاگاداری ئەم رووداوەن کەی ناویان هیناوو باسیان کرد منیش دەلیم راستە؟؟.

كـه لەسەراسـەری كوردسـتاندا بەسـەرۆكايەتی مـەلا مسـتەفا بارزانی سەرپەرشتی ئەم شۆرشەمان دەكات.

دوابـە دوای ئـەوە حكومـەتی مەركـەزی، نوینـەری تایبـەتی عەبدولسەلام عارف كاك (ك)ی نارده لای خودی مەلا مستەفا بۆ هـەمان مەبەست، سـەرەتا گفتوگۆكـان بەنـهینی بـوو پاشـان ئاشكرا، بەبارزانییان راگەیاند كەعەبدولسەلام ئامادەیە كیشەی كـورد لەسـەر مـیزی دانوسـتان چارەسـەر بكـات بەمـەرجیك بەتـەواوی بـاكوری عـیراق بخەنـە ژیـر دەسـەلاتی خـۆت، بەواتایەكی‌تر حكومەتی مەركـەزی دەیویست دەسـەلاتی پـارتی نەمینیو تەنیا بارزانی ببیتە هەموو شتیك لەكوردستاندا.

سالی ١٩٦٧ لیپرسراویكی ئەمنی بەغدا ئەمەی بۆ باسكردم، بەلام لەبەر ئەوەی هیشتا لەژیاندا ماوە ناوی ناهینم. بەمەبەستی جیبەجیكردنی مەرجی رژیم مەلا مستەفا هاتە ناوچەی سۆران و لەگەل حاجی عەبدولرەزاق، پاریزگاری ئەوسای سلیمانی كەوتە گفتوگۆكردنی ئاشكرا (لە بەرگی دووەم لاپەرە ١٨٦–١٩٠–٢١٥ بەدوورودیرژی باسی ئەمەم كردووە).

مـەلا مسـتەفا لـەچوارچیوەی خـۆ سـەپاندنی بەسـەر پـارتیداو بنـەبركردنی هـەموو نـەیارەكانیدا، زۆر بـەوردی دەسـتی كـرد بەنەخشەكیشـان بـۆ ئـەم كـارە، بـۆ ئـەوەی بتوانـیٚ بەهـەموو كەسیكی رابگەیـەنیٚ كـەپارتی، واتـا بـارزانیو بـەس. هـەر لـەو ماوەیـەدا حكومـەتی ئیران مەكتـەبی سیاسـیی ئاگـادار دەكاتـەوە لەوەی كەچـەند چـەكداریك تەقـە لەمەخفـەریكی سـوپیی ئیرانی دەكـەن، هـەر چـەندە ئـەم كـارە هیـچ زیـانی لی نەكەوتـەوە، بـەلام

ئیران بەرپرسیارییەتی ڕوودانی ئەم کارەی خستە ئەستۆی مەکتەبی سیاسی چونکە لەسنووری ئەوان رووی دابوو. مامۆستا سدیق ئەفەندی بەفەرمانی مەکتەبی سیاسی دەچێت بۆ لیکۆلینەوەو بەدواداچوونی ئەم کارە لەئەنجامدا ئەوانەی بەم کارە هەستاون دەسگیر دەکرین کەژمارەیان ١٢ کەسەو لیپرسراوەکەیان کاك ئەحمەد تۆفیقە کەخەلکی کوردستانی رۆژهەلاتەو کادریکی ناسراوی حزبی دیموکراتی ئیرانە. ئەم کابرایە پاش دەسگیرکردنی یەکسەر دان بەوەدا دەنیت کەئەم کارەی بەفەرمانی خودی مەلا مستەفا ئەنجام داوە. ئەم رووداوە لەراستیدا زۆر ترسناکە چونکە بەئاشکرا دەرکەوت کەبارزانی دەیەوێ مەکتەبی سیاسی توشی گرفتی گەورە بکا لەگەل حکومەتی ئیران کەخۆی لەو کاتەدا هیچ پەیوەندیەکی پتەوی لەگەل ئیراندا نەبوو، بەلام دوور بەدوور ئاگاداری ٩٠٪ ی هەموو پەیوەندی و هاتوچۆکانی مەکتەبی سیاسی و حکوتی ئیران بوو، مەلا مستەفا بەم کارە ویستی لەئیران بگەیەنێ کەمەکتەبی سیاسی ناتوانێ سنوورەکان بپارێزن و ئەم جۆرە کارانە بەبی بارزانی کۆتاییان نایەت.

دوا بەدوای ئەم رووداوە مەکتەبی سیاسی، گرووپی ئیبراهیم ئەحمەد دەست دەکەن بەکۆبوونەوەو ئەم رووداوە بەزەنگیکی ترسناك دادەنین، چونکە مەلا مستەفا بەم کارە دەیەوێ سەرنجی ئیران بۆ لای خۆی رابکیشێ و لەو ریگایە ئابلۆقە بخاتە سەر مەکتەبی سیاسی ئەویش بەداخستنی سنووری ئیران بەروویاندا. بۆیە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بۆ خۆی دەست

دەكا بەلێكۆڵینەوە لەگەڵ ئەحمەد تۆفیق و بۆ ئەم مەبەستە چەندین پرسیارو گفتوگۆی لەگەڵدا ساز دەداو، پێی گوت: (تاكە ریگامان كەهەبێت هاتوچۆی لیوە بكەین بۆ دەرەوەی ولات ئیرانە، وەكو دەزانی ئیمە گەمارۆمان لەسەرە، ئازوقەو خۆراك بەپارە بۆمان دیت ئەگەر سنوورمان لی داخەن تووشی تەنگوچەلەمەی گەورە دەبین، ئەوەی تۆ كردووتە دژی شۆرشەكەمان زیانیكی گەورە دەبەخشیت).

دەنگوباسی ئەحمەد تۆفیق بەهەموو كوردستاندا بلاوبۆوە، ئەوانەی لەدەوروپشتي مەلا مستەفا بوون داوایان لی دەكرد كەبەریزی وەكو سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان پیویستە بریار دەربكا بۆ دەستگیركردنی هەموو ئەوانەی ئەحمەد تۆفیقیان گرتووەو چەكدارەكانیان چەك كردووە. هەرچی پیاوە نیشتمانپەروەرو مەزنەكان بوو وەكو كاكەزیاد ئاغا، عەباس ئاغای مەمەد ئاغا، جەنابی شیخ لەتیف شیخ مەحمودو مامۆستای نووسەرو سیاسەتمەدار مەسعود محەمەد ئەمانە هەموویان داوایان لەبارزانی دەكرد كەبریاری بەپەلە نەداو ئاگاداری بارودۆخە بێ كە لەچ باریكی ناسكدایەو، پییان دەگوت بەدلنیاییەوە ئەحمەد تۆفیق و چەكدارەكانی لەخۆرا نەگیراون، بۆیە پیویستە لەگەڵ مەكتەبی سیاسیدا گفتوگۆ بكەی تا راستی رووداوەكەمان بۆ دەردەكەوێ.

جەنابی عەباس ئاغا پیشنیاری ئەوەی كرد كەخۆی بچێ بۆ لایان بۆ لیكۆڵینەوە لەو رووداوە بەلام مەلا مستەفا بەپیی ئەوەی سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستانە بەقسەی كەسی نەكرد،

هۆی سەرەکی ئەم هەلویستەی بارزانی ئەوە بوو لەوە دە ترسا دوای لیکۆلینەوە بۆ هەموو خەلك ئاشکرا بێ کەبارزانی دەستی لەم کارەدا هەبوو، بیجگە لەوەی ئەمە هەلیکی باش بوو بۆ ئەوەی دەسەلاتی خۆی بەتەواوی بەسەر مەکتەبی سیاسیدا بسەپینێ، هەر بۆیە سێ پیشمەرگەی لەگەل راسپاردەیەك بەرەوە مەکتەبی سیاسی بەریکرد بۆ ئەوەی هەموو ئەوانەی لەگرتن و چەککردنی ئەحمەد تۆفیق و چەکدارەکانی بەشدار بوون بنیرنە لای بارزانی تا زیندانیان بکات.

سێ پیشمەرگەکە کەپاسەوانی خودی مەلا مستەفا بوون بۆ ئەم کارە کەوتنە رێ، کاتیك دەگەنە گوندی مالومە بۆ پشوو و حەسانەوە، شەو روودەکەنە مالە جوتیاریك، خاوەنی مالەکەش ریزیکی زۆر لەمیوانە ئازیزەکانی دەنی، چونکە ئەمان پاسەوانی خودی بارزانین و بەکاری تایبەتی جەنابیان هاتوون و میزەری سوریان بەستووە. پاش ئەوەی خواردن ئامادە بوو فەرموویان لێ دەکا، کەدینە سەر سفرە سەرنجی خواردنەکە دەدەن سوکایەتی زۆر بەخاوەنی مالەکە دەکەن و دارکاریەکی باشی دەکەن و پیی دەلین: کەزانیت ئیمە بارزانین بۆچی چیشتی ساوەرمان بۆ دادەنییت، لەبری ئەوەی حەیوانمان بۆ سەر بری و برنجمان بۆ لینییت. خاوەن مالەکە روو دەکاتە دادگای شۆرش و سکالای خۆی بۆیان دەکا و پییان دەلی: من جوتیاریکی هەژارم، لەوە زیاتر توانام نەبووە.

ئەم سێ پیشمەرگەیە لەبەر ئەوەی ئاگاداری ناوەرۆکی نوسراوەکە بوون وایان دەزانی کەس ناتوانێ لەقسەیان

دەربچێ و چییان ویست دەبێ بۆیان بکرێ. پاش ئەوەی سێ پێشمەرگەکە دەگەنە مەکتەبی سیاسی نوسراوەکە دەدەنە دەستیان، کەتییدا هاتووە: (بەپێی ئەوەی کەمن سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانم بریارمدا هەر هەموو ئەوانەی کەکاك ئەحمەد تۆفیقیان چەك کردووەو دەستگرییان کردووە، لەحزب دور بخرێنەوەو دەربکرێن، چونکە ئەوانەی بێ بریاری من بەو کارە هەلساون منیان ئاگادار نەکردۆتەوەو، دەبێ سدیق ئەفەندی بەبەندکراوی بێتە لام بۆ لیکۆلینەوەو سزادانی، بۆ ئەم مەبەستە ئەوا سێ پێشمەرگەی تایبەتی بارەگای خۆم نارد لەبەر گرنگی رووداوەکە هەتا فەرمانەکە وەکو خۆی جیبەجی بکرێ بەبێ دواکەوتن، ئەگینا بەرپرسیار دەبن).

مەکتەبی سیاسی یەکەم هەنگاوی لەسەر سکالای جوتیارەکەی گوندی مالومە کەئازارو ئەشکەنجە درابوو هەرسێ پێشمەرگەکەیان خستە بەندیخانەوە، پاشان لەسەر داواکەی مەلا مستەفا کۆبوونەوەیان کردو دەستیان کرد بەگفتوگۆ. رۆژ بەرۆژ بارودۆخەکە توندتر دەبوو بەهۆی بریارە توندو ناپەسندەکانی مەلا مستەفا کەچەندین کەسی بەبێ هۆیەك کەپێویست بکا بەند کردبوو، بۆ نمونە دکتۆر عەزیز شەمزینی ماوەیەك بوو لەسەنگەرسەر بەند کرابوو، عەلی حەمدی لەکاتیکدا یەکەم کۆبوونەوەی پارتی لەمالی ئەواندا ئەنجام درابوو بەلام لەبەندیخانە بوو لیپرسراوی گەلالە بەفەرمانی بارزانی لەئاودەست بەندکرابوو و هەر ئاغاو کویخایەك سکالایەکی لەکادریکی حزبی کردبیت یەکسەر گیراوە یان دوورخراوەتەوە.

بەهەر حاڵ نامەکەی بارزانی بۆ مەکتەبی سیاسی ئەم خاڵانەی بەئاشکرا تیدابوو:-

١- بارزانی دەیەوێ سدیق ئەفەندی لەبارەگای خۆیزیندانی بکا.

٢- هەموو ئەوانەی کەبریاری گرتنی ئەحمەد تۆفیقیان داوە دەبیت دوور بخرینەوە لەحزب، واتا ئەندامەکانی مەکتەبی سیاسی.

٣-نوسراوەکە ئاشکرای دەکا کە بەبریاری بارزانی، ئەحمەد تۆفیق تەقەی لەمەخفەری ئیران کردووە، بەمەبەستی ئەوەی مەکتەبی سیاسی لەگەل ئیران تووشی کیشە بکاو خۆی لەئیران نزیك بکاتەوە.دوای ئەم روداوە مەکتەبی سیاسی گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەتەنیا دوو ریگای لەبەردەمدایە لەئاست ئەو داخوازییەی بارزانی: یەکەمیان جیبەجیکردنی فەرمانەکانی سەرۆك و بنەماڵەکەی، کەبەزیانی شۆرشی گەلەکەمان کۆتایی دیت. دووەمیان: رەتکردنەوەی نوسراوەکە، کەئەمە بەواتای پارچەپارچەبوونی شۆرش دیت بۆ دوو بەش، کەلایەکیان سەرۆك هۆزیکی نەزان بەریوەی دەبات، لاکەی تریان مەکتەبی سیاسیی حزب. مەکتەبی سیاسی بەپیی ئەوراپۆرتانەی بۆی بەرزدەکرایەوە لەریکخستنەوەیان بەهۆی سەردانی خودی کادرانی مەکتەبی سیاسی بۆناو خەلك بۆیان دەر کەوتبوو کەزۆرینەی خەلك بەتایبەتی لەناوچەی سۆران لەگەل ئەواندان و پشتگیرییان لی دەکەن، هەروەها ئەوەشیان بۆ ئاشکرا بوو کەناکۆکیی نیوان مەلا مستەفاو مەکتەبی سیاسی لەناو خەلکیدا

بڵاو بۆتەوەو جەماوەر پێی ئاگادارە. لەلایەکی تر مەلا مستەفا بەهۆی وتوێژی لەگەل عەبدولسەلام عارف دیکتاتۆرو شۆڤینی و دوژمن بەگەلی کورد توانی خۆی لەرژیم نزیك بکاتەوەو دەسەڵاتی حکومەت بەهۆی ئەوەوە لەناوچەکەدا قایمتر بوو، خەلکی ئەمەیان بەتاوانی خودی مەلا مستەفا دەزانی چونکە عەبدولسەلام بەرادەیەك شۆڤینی بوو دەیگوت کوردیش لەبنچینەدا عەرەبن و هەموو عەشرەتەکانی جاف، سورچی، هەرکی، زیباری، دزەیی و هەمەوەند ...هتد هەرهەموویان عەرەبن! هەر ئەو دکتاتۆرە بوو بریاری ژمارە ۱۳ی دژی حزبی شیوعی دەرکرد، کەبەپێی ئەم بریارە کوشتنی خەلکی شیوعی حەلاڵ کراو هیچ یاسایەك لەسەر کوشتنیان نەما.

مەکتەبی سیاسی لەئەنجامی گفتوگۆو چاوپێکەوتنی خەلك گەیشتنە ئەو باوەرەی کەهێز و توانای ئەوان بەرامبەر خودی مەلا مستەفا و بنەماڵەکەی بەم جۆرەیە:

١- جەماوەر بەگشتی لەسەرانسەری کوردستان بەهەموو چین و توێژەکانییەوە پشتیوانیی مەکتەبی سیاسی دەکەن.

٢- هەموو ریکخراوەکانی پارتی لەناوچەی سۆران و لەبەشیکی بادینان و شارە عەرەب نشینەکانی وەکو بەغدا، ٩٠٪ بۆچوونیان لەگەل مەکتەبی سیاسییە.

٣- هـيزى پيشـمەرگە لەناوچـەى سـۆران ٩٠٪ى بۆچوونيـان لەگەل مەكتەبى سياسييە*.

هەموو ئەمانە واى لەمەكتەبى سياسى كرد بەخۆيدا بچيتەوەو دان بـەوەدا بنـێ كەئـەوان بارزانييـان دروسـتكردوەو گـەورەيان كردووە.

مـەلا مسـتەفا بەمەبەسـتى كۆنـترۆلكردنى زيـاترى ناوچـەى سـۆران‌و كەمكردنـەوەى دەسـەلاتى حـزب‌و بـەهيزكردنى توانـاى خـۆى، هاتـە ناوچـەى سـۆران‌و بارەگاكـەى لەحـەوزى دوكـان دانـا. لەيەكەم رۆژى چاوپيكەوتنى لەگەڵ حـاجى عـەبدولرەزاق لـەريگاى سـليمانى رووبەروو پيـى وت: (مـن مرۆڤيكـى موسـلمانم‌و نـازانم حزبايـەتى چييـە، خـوا رازى نـابيت هيچى‌تر موسـلمان بكوژريـت، من هەرگيز بەوە رازى نەبووم، ئەمە تاوانى حزبيەكانە...).

لەدووەم چاوپيكەوتنى حاجى عـەبدولرەزاق ئاگـادارى خـودى مەلا مستەفاى كرد كەسـەرۆك كۆمـار عەبدولسەلام عـارف بەهـەموو توانايـەكى پشـتگيرى دەكـات‌و يارمـەتى دەدا. بۆيـە رۆژ بـەرۆژ نيـوان مـەلا مستەفاو دكتـاتۆر عەبدولسەلام عـارف خۆشـتر بـۆوە، پەيوەنديـيە نـهينى‌و ئاشـكراكانى نيوانيـان هـەردەهات‌و پتـەوتر دەبـوو. بـارزانى توانـى ئـەو پەيوەنديـيە بـۆ بـەرژەوەندى خـۆى‌و كەمكردنـەوەى دەسـەلاتى مەكتـەبى سياسـى گرووپـى ئيـبراهيم ئەحمـەد بـەكار بـهينى. بـارزانى لەهـەموو كۆروكۆبوونەوەيـەكى

---

* مەلا مـستەفا بەهيچ جۆريك نەيدەتوانى هيز بەرامبەر مەكتەبى سياسى بەكاربينێ، هەرچەندە ئەوە ئامانجى عەبدولسەلام بوو.

جەماوەریدا و بەئاشکرا هاواری دەکردو وەکو کاسێت دووبارەی دەکردەوەو دەیگوت: هیچ کیشەیەك بەشەر کۆتایی نایەت، ئیمە موسولمانین و بەئاشتی دەکەوینە گفتوگۆو کیشەی کورد چارەسەر دەکەین لەگەڵ حکومەت. شەر هەتا هەتایە نابیتەوە.

دەربارەی شۆرشی ئەیلولیش دەیگوت: من ئاگادار نەبووم جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد ئەم شەرەیان هەلگیرساند، ئەمە کاری حزب بوو. هەر بۆیە بەناوی پارتی دووبەردکییان دروستکردووە لەناو ئاغاو جوتیارو شیخ و مەلا و چەندەها هیرشیان بردۆتە سەر ناموسی خەلك. مەلا مستەفا دەستی دەکرد بەناو هینانیان بەم جۆرە: عومەر تەنەکە: بلەی ئەحەرەش، حلمی عەلی ناشەریف [٢]، جەلۆ مەلۆ، حەمە ئەمین، ئەمین قەرەج. لەژیرەوەش دەستی کرد بەبوختانکردن بۆ

[٢] حلمی عەلی شەریف: دەرچووی کۆلیژی ...... زانکۆی موستەنسەریەی بەغدایە؛ پیاویکی رۆشنبیرو سیاسەتمەداریکی ناسراو بوو. چەندین کتیبی میژوویی و ئەدەبیی خستۆتە کتیبخانەی کوردییەوە، هەروەها رۆژنامەنووسیکی بەتواناو کەم وینە بوو. دەتوانم بلیم ئەو مامۆستایە چەندەها کەسی لەبوارەکانی سیاسەت و رۆشنبیریدا پیگەیاندووە. ئەو کاتەی پیکەوە پیشمەرگەبووین سەلماندی، کەپیاویکی زۆر ئازاو فیداکارە. یەکەمین کەس بوو لەکۆنگرەی بەغدا ماهیەتی خودی مەلا مستەفای ناسی، لەو کۆبوونەوەیەدا وتی: کابرایەك ئیهانەی ئیمە بکاو توانجمان تیبگری و جوینمان پیبدا چۆن بەسەرۆك هەلی دەبژیرم. ئەگەر هەموو ئەندامانی کۆنگرە بەقسەی ئەویان کردبایە، ئیستا نە مەلامستەفا دەبوو بەئەفسانەو نە بنەمالەش دەسەلاتیان دەبوو. هەروەها کوردیش تووشی ئاشبەتال نەدەبوو نە بەخیانەتی ٣١ی ئابیش جەرگی دەبرا. خوالیخۆشبوو لەسالی ١٩٩٨دا کۆچی دوایی کرد، هەزار رەحمەتی لیبی.

کادرانی پارتی ئەوانەی لەگەڵ مەکتەبی سیاسیدا بوون و، هەر کەسیك هاتبا لای لە ٥ - ٥٠ دیناری دەدایە، کاتیك لەگەڵ شیوعیەکان دادەنیشتن پیی دەگووتن ئاگاداری ئەو شتە ناریکوپیکانە نیم کە لەبەرامبەرتان کراوە، بەلکو ئەمانە هەمووی کاری ئیبراهیم ئەحمەدو جەماعەتەکەیەتی. لەگەڵ لیپرسراوانی حزبە سیاسیەکانی ئیران دەیوت: جماعەتی ابرهیم ئەحمەد ناهیلن هیچ جۆرە چالاکیەکتان دژی ئیران هەبیت. ئەگەر هەوڵ و دەسەلاتی من نەبا ئەوا ئیوە یان زیندانی دەکران یان تیرۆر کرابوون، یان تەسلیم بەئیران کرابوونەوە. لەکاتیکدا مەلا مستەفا نەك هەر خەلکی شۆرشگیرو کوردپەروەری زیندانی دەکرد، بەلکو زۆر ناشیرین رەفتاری لەگەلدا دەخردن، بۆ نموونە دکتۆر عەزیز شەمزینیی میژوونووس لەزیندانی بارزانیدا زۆر رەفتاری ناشیاوی لەبەرامبەردا کرابووو، هەر کاتێ لەگەڵ سەرۆك هۆزو کویخاکاندا کۆببایەوە پیی رادەگەیاندن کەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد جوتیارەکانتان لی هاندەدەن و دەیانەوێ زەویەکانتان لەدەست دەربینن. ئیمە چەند کادریکمان لەسەر ئەو بیروباوە رانەگرتووەو لەسیدارەیان دەدەین، بۆ ئیمە شۆرشمان کرد تا مالی خەلك داگیرکەین؟

لەدریژی بوختانەکانیدا بۆ مەکتەبی سیاسی دەیوت: من سەرۆکی پارتیم و بەهەموو شیوەیەك پشتگیری لەئیوە دەکەم. ئەوانیش لەبەرامبەر ئەوەدا کەبارزانی ریگە لەکادرانی پارتی دەگرێ دەست لەکیشەی زەویوزار وەربدا کە لەگەڵ جوتیارەکاندا هەیانە، بەلینیان پیدا لەگەلیدا بن و ئەلقەلەگویی

بن و گۆچانی دەستی بن بۆ پشتی هەر کەسێك کەدژایەتی بکا. لەهەمان کاتدا هەر ئاغاو سەرۆك هۆزو خاوەن زەوییەك لەگەڵیدا نەبا دوژمنایەتی دەکردو گرفتی بۆ دەنایەوەو، زۆریانی ناچار کرد زەوییوزارەکانیان جێ بێڵن و بەرەو ئێران و وڵاتە ئیقلیمیەکان هەڵێن و زەوییوزارەکانیشیان بەسەر کادرانی پاراستندا دابەشکرا. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك سەرۆك هۆز خۆیان تەسلیمی بارزانی نەکرد، لەوانە حەمە رەشید خانی بانەو عەباس ئاغای سەرۆك هۆزی ئاکۆ. لەگەڵ ئەوەشدا کەبارزانی هەوڵیدا بەنهێنی کێشەی زەوییان بۆ دروست بکا هەر سەرکەوتوو نەبوو. لەو ماوەیەدا بارزانی و بنەماڵە چەندین تاوانی گەورەیان دەرهەق بەگەلی کورد ئەنجام دا، لەهەموویان ئاشکراترو بەناوبانگتر ئەو دادگایە بوو کەبەناوی قەسابخانەی کانی ماسی* دایان نا. مەلا مستەفا بۆ کۆنترۆڵکردنی شاری سلێمانی و ترساندنی خەڵك و دواجار ملکەچ پێکردنی مەکتەبی سیاسی ئەم کارەیان کرد کە لەڕووداوەکەی زەعیم سدیق کەمتر نەبوو، هەرچەندە ئەم کارەساتە ئێستا ٣٧ ساڵی بەسەردا ڕۆیشتووە، بەلام ئەمە یەکێکە لەتاوانە گەورەکانی مەلا مستەفا و بنەماڵە دەرهەق بەگەلی کورد. بەداخەوە لەلایەن نووسەرو سیاسەتمەدارانی کورد وەك پێویست ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە. ئەم تاوانە گەورەیە بەفەرمانی خودی بارزانی بوو، دادگاکە لەلایەن عەریف جەبار

---

* کانی ماسی: کانیوئاوێکە لەگوندی قەرەتۆغان کەدەکەوێتە باشووری ڕۆژهەلاتی شاری سلێمانیو چوار کیلۆمەتر دوورە.

ئامەی حەمەی دەروێش نادر، ساڵە پیر، ئەحمەد شەر، حسەین ئیبراهیم دەروێش، حسەین فارس، عوسمان ئامە، مستەفا بایەگەورەو بایز شێخ محەمەد حوسە جێبەجێ کرا کەپەلاماری ناوچەی سلێمانیان داو دادگایەکیان لەگوندی کانی ماسیدا دانا کەزیاتر لە١٠٠ هاوڵاتی لەم تاوانەدا کوژراو بریندار بوون.

من بەداخەوە تەنها وێنەو ناوی ١٢ کەسیانم لایە، وا لەخوارەوە بۆ خوێنەری خۆمی دەخەمە بەردەست.


عبدالرحمان صالح


صالح أمين قادر


نوری حمدی علی


صالح عرب


عبدالله


حمدی خسرو


ملا علی


سعيد لاله


عارف حسن


ملا محمد أمين


عمر مام أمين


عمر مام علی

ئەم کارەی بارزانی و بنەماڵەکەی دژی هەموو بەهاو پێوانە ئایینی و کوردیەکان بوو، ئەمە تەنها لەرژێمە داگیرکەرو دوژمن بەگەلی کورد دەوەشایەوە، بگرە ئەم کارەساتە لەو کاتەدا هیچ رژێمێکی داگیرکەری کوردستان نەیتوانیوە بەو ئاشکراییەو بەو جۆرە ئەنجامی بدا. بۆیە ئەم بنەماڵەیە هەر دەبوو لەو رۆژەوە دوژمنایەتییان بۆ گەلی کورد ئاشکرا بوایەو خەڵکی بیانزانیایە کەئەم بنەماڵەیە ئەگەر دەسەلاتیان بێ چی دەکەن.

ئەم تاوانە لەلایەن پیاوەکانی بنەماڵەوە بەجۆرێکی وا ئەنجام درا کە لەمرۆڤ ناوەشێتەوە، بۆ نموونە ئەورەحمان سالح خلەبنجوو کەکادرێکی ناسراوی حزبی شیوعی بوو پاش ئێشکەنجەدان و ئازاردانێکی زۆرو سوکایەتی پێکردن، بەنزین کرا بەدەموو گیانیداو سوتێنرا. محەمەد سەید عەلی کەتا ئەو رۆژە زیندانیی خۆیان بوو هەر لەهەمان ئەو رۆژەی ئازاد کرابوو، نەمانەوە لەکاتی ریشتاشیندا لەبەر چاوی ماڵ و منالەکەی رایانکێشاو هێنایانە دەرەوە بۆ کوشتن، خێزانەکەی قورئانی بەرەو پیریان بردو لەبەریان پاڕایەوە کە لەبەر خاتری خواو منداڵەکانی نەیکوژن، بەلام فەرمانی مەلا مستەفا بوو کەدەبێ بکوژرێت، هەر بۆیە بێبەزییانە لەبەر چاوی خێزانەکەی شەهیدیان کرد. مەلا محەمەد ئەمین هێلەکی کەچوار تاوانباری کانی ماسی دێنە لای و بەبیانووی ئەوەی شارەزایی لەباش و خراپی برنج هەیە داوای لێ دەکەن لەگەڵیاندا بچێ بۆ بازاڕ بۆ کرینی برنج. ئەویش

لەدڵسافی خۆی لەگەڵیاندا دەچێت، کاتێك دەگەنە مەیدانی برنج فرۆشەکان لەدواوە چوار گوللەی پێوە دەنێن و شەهیدی دەکەن. عومەری مام عەلی دوای کوشتنی بەبێویژدانانە پەنجەی دەبڕنەوە تا ئەنگوستیلەکەی لەدەست دەربێنن.

هەر لەو کارەساتەدا چەندین کەس بریندار بوو کەئەمە ناوی هەندێکیانە کەمن بیرم ماون: کەریمی عەبە خڕە، ئیسماعیل ئیبراهیم ناسراو بەئیسماعیل پاکدان، عەلی حسەین ناسراو بەعەلی سەعید چاوەش.

## کۆنفرانسی ماوەت، بە مردوویی لەدایك بوو

مەلامستەفا لەیەکەم رۆژی کە لەگەڵ پاریزگاری سلیمانی حاجی عەبدولرەزاقی نوینەری دکتاتۆر عەبدولسەلام عارف کۆبۆوە، وەکو باسمان کرد دەستی کرد بەپلاندانان دژی مەکتەبی سیاسی و حزبەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان، بەجۆریك کەهەموو خەلك بەناکۆکییەکان ئاگاداربوون. بۆیە زۆر مرۆڤی نیشتمانپەروەرو خیرخواز هەولیاندا لەو نیوانەدا قسەیەکی خیر بکەن، بەلام بێ سوود بوو. ناچار مەکتەبی سیاسی بریاری کۆنفرانسیکیدا لەماوەت. کۆنفراسەکە بەسەرپەرشتیی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو کاك نوری شاوەیسی بەریوەچوو. هەردووکیان لەکۆبوونەوەکەدا زۆر توند بوون، بەگشتی بەشداربوانی کۆنفراسەکەی ماوەت بریاریان دا کەخودی مەلا مستەفا لەسەرۆکایەتی حزب دوور بخریتەوە. بەلام ١٣ ئەندام لەوانە رایان وابوو کەئەم کارە گرژییەکە زیاتر دەکاو دوور نییە لەئەنجامدا چەك بەکاربهینرێ.

بۆ ئەم مەبەستە چەند کەسیکی بەشداری نای کۆنفراسەکە پیشنیاری ئەوەیانکرد کەبچنە لای مەلا مستەفاو چاویان پیی بکەویت بۆ چارەسەرکردنی کیشەکان بەئاشتی، لەوانەی ئەم ئەرکەیان خستە سەر شانی خۆیان حەبیب محەمەد کەریم دکتۆر فوئاد جەلال، عەلی سنجاری، یەدوڵا فەیلی و عەبدولرەحمان گۆمەشینی بەلام ئەم کۆمەلەیە لەم کارەیاند

سەرکەوتوو نەبوون و، لەئەنجامی کۆبوونەوە بەکۆمەڵ و دوو بەدوو لەگەڵ مەلا مستەفا هەر هەموویان بوونە لایەنگرو پیاوی ئەو. لەکاتێکدا مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کاتێك پێی وتن: مەلا مستەفا چاوی میللەتە، ئەی کەچاو تووشی شیر پەنجە بوو چی لێ دەکەن، بەگشتی وەڵامیان دایەوە: ئەو کاتە ناچار دەبین چاوەکە دەربێنین.

سەرەتا بەشداربوانی کۆنفراسەکە بڕیاریان دابوو ناوەڕۆکی کۆنفراسەکە ئاشکرا نەکرێ تاکو هەڤاڵانی ڕۆیشتوو بۆ لای مەلا مستەفا دەگەڕێنەوە. بەڵام کاتێك هەواڵی ئەوە بڵاوبۆوە کەبوونەتە پیاوی بارزانی، ناوەڕۆکەکە بۆ هەموو خەڵك ئاشکرا کرا. بەڵام بارزانی بەهیچ جۆرێك بایەخی بەبڕیاری کۆنفراسەکە نەداو زۆر بەساردی وەریگرت و، ئامادەیی خۆی نیشاندا کەبۆ ئەوە هێرش بکاتە سەر ئیمپراتۆریەتی ماوەت، هەروەها بەئاشکرا وتاری لەسەردەدان و باسی دەکردن.

بەرای من ئەو بڕیارەی مەکتەبی سیاسی گرنگ و ڕاست بوو، بەڵام بەداخەوە ئەو بڕیارە دەبوو ئەو کاتە بدرایە کەمەلا مستەفا لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا کۆبۆوەو پێی وت: (من سەربازی تۆم). ئەگەر لەو کاتەدا ئەو بڕیارە درابا ئەوا کورد لەبنەماڵە رزگاری دەبووو تووشی ئەو هەموو ئاشبەتاڵ و تەسلیم بوونەوە نەدەبووو، کورد نەدەبوو بەدار دەستی بنەماڵە بەئارەزووی خۆیان ئەم لاولای پێ بکەن و بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بەکاری بێنن. بۆیە هەموو ئەوانەی بڕیاری شۆڕشی ئەیلولیاندا تووشی هەڵەی گەورە بوون.

من لەو کاتەدا خۆم لەو ناکۆکیە پاراستو نەمویست ببمە ئارد لەنیوان ئەو دوو بەرداشەداو، (لەبەرگی دووەمی ئەم کتیبەدا، ل١٩٨)دا رای خۆم دەربارەی مەلا مستەفا رونکردۆتەوە، چونکە من لەوکاتەدا هیچ لایەکیانم بەراست نەدەزانی. کوردی هەژاریش کە لەنیوان ئەو هەموو ئاژاوەو شەرەدا ببوو بەقوربانی، هیچ ریگایەکی لەبەردەمدا نەمابوو رزگاری بکا، بەجۆریك کەحالی کورد ئاوابوو (البحر امامکم والعدو وراءکم). ئەگەر نا ئەوا دەبوو روو بکەیتە هەندەرانو لەو بارودۆخە ناهەموارە خۆت رزگار بکەیو هەلیی.

جەماوەری کوردستان سەریان سورمابوو چەندەها پرسیارین دەربارەی بارودۆخی کوردستان دەکرد، دەیانگوت ئایا دەکری ئەوانەی بریاری شۆرشی ئەیلولیانداو مەلا مستەفایان کردە سەرکردە ئەمرۆ لیی جیاببنەوەو ناکۆکی بکەویتە نیوانیان؟ ئەمەیان لەچیو ئەوەیان بۆچی؟ -

خەلکی هەمووی قسەو باسیان هەر ئەوەبوو ئایا ئەم شەرە روودەدا؟ ئایا رۆلی حکومەت چی دەبی؟ ئەم پرسیارانە عەرەبەکانیش لەکوردەکانیان دەکرد، بەجۆریك کەباریکی ناهەمواری دروستکردبوو. چونکە ئەو پیشمەرگەانەی دوینی لەیەك سەنگەردا دژی دوژمن وەستابوون ئەمرۆ لولەی تفەنگەکانیان ئاراستەی یەکتر کردووەو دەستیان خستۆتە ئیخەی یەکتر. مەلا مستەفا دەیووت: شەر لەگەل حکومەتی دکتاتۆریو دژ بەکورد نابیتەوەو جاریکیتر من تەقە لەرژیم ناکەم، بەلام فەرمانی کوشتو برو شەری لەگەل مەکتەبی

سیاسیدا رادەگەیاند. کەسوکاری شەهیدانی شۆرشی ئەیلول پرسیاریان دەکرد مادام وەکو دەلێن کیشەکانمان بەگفتوگۆ نەبێ چارەسەر ناکرێ ئەی ئەو هەموو شەهیدە بۆ؟ ئەی ئەوانەی مالیان تالان کرا، گوندەکانیان بۆمباران کراو رووخاو زەویەکانیان سوتینراو دەربەدەرییان بینی چیبکەن؟

مەلا مستەفا لەچوارچیوەی پاکتاوکردنی مەکتەبی سیاسی دەستیکرد بەخۆ ئامادەکردن بۆ کۆنگرەی شەشەم لەقەلادزێو، بیری لەوە دەکردەوە بەهەر ریگایەك بێ چینی رۆشنبیران و نیشتمانپەروەرانو سیاسەتمەدارانو ئەفسەران بولای خۆی رابکیشێو تییان بگەیەنێ کەپارتی بەبێ بارزانی ناتوانێ هیچ هەنگاویك بنێو لەکارەکانیدا سەرکەوتوو نابێ.

هەر لەو چوارچیوەیەدا مەلا مستەفا کەزانی ناتوانیت بەو ئاسانییە بەسەر بالی مەکتەبی سیاسی بەتایبەت خودی ئیبراهیم ئەحمەد زال بیت، کە ٩٥٪ی ریکخراوی پارتی هەلویستی سیاسیان بەراست دەزانی، ناچار کەوتە هەولدان لەگەل خودی مام جەلال خۆیو، دەستی کرد بەنزیکبوونەوە لێو پیی ئەوت: تۆ لەلوقمان دلسۆزتری بۆ منو جێی باوەری لام، من بێ تۆ هیچ بریاریك نادەم.

بارزانی ئەم وشانەی لەچەندین دانیشتندا بۆ ماستاوچیەکانی چواردەوری خۆی دەکرد. مەلا مستەفا وایزانی بەتەواوی لەمام جەلال نزیك بۆتەوە، بۆیە داوای لیکرد کەببیتە سکرتیری پارتی دیموکراتی کوردستان. بۆ هەمان مەبەست حکومەتی عیراقی

بەسەرۆکایەتی عەبدولسەلام داوایان لەمەلا مستەفا کرد بەهەرجۆریك بێت شتێکی وابکات جەلال رازی بێت.

چونکە دەیانزانی بەبێ مام جەلال بەتەواوی زاڵ نابێت بەسەر ریکخراوی پارتی دا، لەهەمان کاتدا حکومەتی عەبدالسەلام عارف لەچەند ریگایەك داوایان لەمام جەلال کرد بۆ ئەم مەبەستەو، ئەوەی من لەزمانی خوالیخۆشبوو کەریم قەرەنییم بیست، کەیەکیك بوو لەوانەی بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ مام جەلال هەولی داوە، ئەوە بوو مام جەلال بەهیچ شێوەیەك ئەمەی قبولنەکردووە. هەمان سیاسەت و پلان لەگەڵ مامۆستاو سیاسەتمەدارو زانا عەبدالرەحمن زەبیحی پیادەکرا، بەلام ئەویش سەری نەگرت.

## کۆنگرەی قەلادزێ سەرکەوتنی بارزانی بوو

لەهەمان کاتدا نەخشەی بۆ پیاوەکانی خۆی دادەنا کەچۆن دەتوانن خەلکی بولای خۆیان رابکیشن و کاریان تێ بکەن و ئامادەیان بکەن بۆ کۆنگرەو پەلاماردانی بالی مەکتەبی سیاسی. ئەو کارە بەشیخ محەمەد هەرسین و اسماعیل عارف سپیردرا بۆ دەرکردنی بریاریکی توند دژی بالی مەکتەبی سیاسیی گروپی ئیبراهیم ئەحمەد. بۆ چەواشەکردنی جەماوەریش پیی وتن دەبێ هەلویستیکی توند بەرامبەر رژیمی عەبدولسەلام عارف وەربگرن.

ریورەسمی شەشەمین کۆنگرەی پارتی لەقەلآدزێ لەمانگی تەمووزی سالی ١٩٦٤.

سەرەتا خودی مەلا مستەفا وتاری پیشکەش کرد، لەوتارەکەیدا بەتوندی هیرشی بردە سەر بالی مەکتەبی سیاسیو بەتاوانباری سەرەکیی دانان لەهەموو روویەکەوەو، وتی ئەوان بوونەتە هۆی ئەوەی کیشەی کورد بەم قۆناغە خراپەی بگاو دووبەرەکی بکەویتە ناوی. هەروەها وتی: من ئامادەییم تیدایە هەموو فەرمانەکانتان جیبەجی بکەم ئنجا نارەزایی خۆی نیشاندا دەربارەی هەلویستی رژیمی دکتاتۆری عیراق کەهیچ هەنگاویك نایەتە پیش بۆ چارەسەری کیشەی کورد. بەگشتی لەناو ئەندامانی کۆنگرە دوو بۆچوون هەبوو:-

١- بەشیکی زۆریان هەلویستو بۆچوونیان میانرەوبوو، لەسەر خۆبوونو نیازی چارەسەرکردنیان هەبووو، دەیانویست نەهیلن هیچ لایەك هیز بەکاربینێ دژی ئەویتر. دەیانگوت دەبێ لیژنەی مەرکەزی تازە پیك بهینریت لەمەکتەبی سیاسیو ئەندامانی کۆنگرەی شەشەم. بۆ ئەم کارە زۆریك لەئەندامانی کۆنگرە ئامادەگیری ئەم پیشنیارەیان تیدابوو، لەوانە د. مەحمود عەلی عوسمان، د. فوئاد جەلال، یەدوللا فەیلی، عەلی سنجاری، عەبدولرەحمان گۆمەشینی، محەمەد مەلا قادر، عەلی هەژار، مەلا مەجید، مەلا بەهرام. شایەنی باسە چەندین هۆی جیاواز وای کردبوو ئەم کەسانە لەسەر ئەم رایە کۆببنەوەو یەکبگرن.

٢- بەشی دووەمی ئەندامانی کۆنگرە هەلویستیان زۆر توند بوو لەوانە شێخ محەمەدی هەرسین و ئیسماعیل عارف کە پیلانەکانی مەلا مستەفایان وەکو خۆی جێبەجێ دەکردو بەموو لییان لانەدەدا. لەناو ئەم کۆمەلەیەدا هاشم عەقراوی، عەزیز عەقراوی، ئیسماعیل مەلا عەزیزو رەمەزان عەقراوی ئەمانە دەیانویست بالی مەکتەبی سیاسیی گروپی ئیبراهیم ئەحمەد لەحزب دوور بخرینەوەو هەر هەموویان گەورەترین سزا بدرین. لەکۆتایی کۆنگرەدا بەپێی بریاری خودی مەلا مستەفا سەرکردایەتی پارتی پاش پاکتاوکردنی بالی مەکتەبی سیاسی لەکۆنگرەی شەشەم لەقەلادزێ لەمانگی تەمموزی سالی ١٩٦٤ بەم جۆرەی خواردوە دانرا:-

| | |
|---|---|
| ١- حەبیب محەمەد کەریم* | سکرتێری پارتی |
| ٢- د. مەحمود عوسمان. | ئەندامی مەکتەبی سیاسی. |
| ٣- مستەفا قەرەداغی | ئەندامی مەکتەبی سیاسی. |
| ٤- ئیسماعیل عارف | ئەندامی مەکتەبی سیاسی. |
| ٥- هاشم عەقراوی | ئەندامی مەکتەبی سیاسی. |
| ٦- سالح یوسفی | ئەندامی لیژنەی مەرکەزی |
| ٧- عەزیز عەقراوی | ئەندامی لیژنەی مەرکەزی |
| ٨- د. فوئاد جەلال | |

* ئەم کابرایە پێش کۆنگرە تەنانەت ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیش نەبوو.

٩- یەدوللا کەریم فەیلی
١٠- عەلی سنجاری ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
١١- نوعمان عیسی ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
١٢- ئیسماعیل مەلا عەزیز ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
١٣- شیخ عومەر هەرسین ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
١٤- محەمەد ئەمین بەگ ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
١٥- عومەر شەریف ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
١٦- رەمەزان عەقراوی ئەندامی مەکتەبی سیاسی.

بەم کارە بەشی زۆری کادرانی پارتی وایان دەزانی ناکۆکی و دوبەرەکی کۆتایی هات و بەهیچ شیوەیەك بالی مەکتەبی سیاسی ئیبراهیم ئەحمەد ناتوانن خۆیان بگرنەوەو، ئەم کۆمەلەی کەبارزانی لەسەرکردایەتی پارتی داینان وایاندەزانی کەئەمان جیی بالی مەکتەبی سیاسی دەگرنەوە. بەلام مەلا مستەفا دوای ئەودی بۆی دەرکەوت ناتوانی بەو ئاسانییە بالی مەکتەبی سیاسی و بەتایبەتی خودی ئیبراهیم ئەحمەد بشکینی، کەوتە پەیوەندیکردن بەمام جەلالەوە بۆ راکیشانی بۆ ریزی خۆی و دوور خستنەوەی لەهیل و سەنگەری ئیبراهیم ئەحمەد. ئەوەبوو دەستی کرد بەخۆ نزیکخستنەوە لەمام جەلال و پیی دەووت: تۆ لەلوقمانی کورم دلسۆزتریت بۆم و بریارم داوە هەتا پرست پی نەکەم دەست نەدەمە هیچ کاریك.

بارزانی هەمیشە لەبەردەمی ژمارەیەکی زۆری کاسەلیسەکانی خۆی ئەم قسانەی دووبارە دەکردەوەو وایدەزانی توانیویتی مام جەلال راکیشیتە لای خۆی بۆیە داوای لیکرد کەببیتە سکرتیری

پارتى. شايانى باسه كەعەبدولسەلام عارف هەر بۆ ئەم مەبەستە بوو داواى لەمەلا مستەفا دەكرد مام جەلال رازى بكات، چونكە دەيزانى مەلا مستەفا بەبێ پارمەتى و هاوكاريى مام جەلال، پارتى بۆ كۆنترۆڵ ناكريت. جگە لەمە حكومەتى عەبدولسەلام عارف لەريگەى هەندى كەسىترەوە داواى كردبوو كەمام جەلال رازى بكەن ببيتە سكرتيرى پارتى، لەگەل پارتى و مەلا مستەفادا تيكەڵ بيت. خودى خۆم گويم لەخواليخۆشبوو كەريم قەرەنى بووە كەوتوويەتى ئەم كارەى پى راسپيردراوەو پەيوەندى بەمام جەلالەوە كردووە، بەڵام ئەو، واتە مام جەلال رازى نەبووە. هەروەها بۆ ئەم مەبەستە مامۆستاى سياسەتمەدارى ناسراو، خواليخۆشبوو عەبدولرەحمانى زەبيحى راسپيردرابوو بەڵام نەچووبووە ژير ئەو بارەو راسپاردەكەى بەمام جەلال نەگەياندبوو. بەڵام لەكۆنگرەى قەڵادزێ كۆمەليك رووداو روويدا كەجيى خۆيەتى بەخاڵ ديارى بكەين:-

١- د. مستەفا قەرەداغى و محەمەد ئەمين بەگ و عومەر شەريف بەبێ هەلبژاردن لەلايەن مەلا مستەفاوە دانران ! دكتۆر مستەفا قەرەداغى بەهۆى ئەوەى لەدەرەوەى وڵات بالويزى عيراق بووە، پەيوەنديى تايبەتى هەبوو بەوڵاتە بيگانەكان، بۆ بەرژەوەنديى تايبەتى خۆى و بنەماڵە جيى بايەخ بوو.

٢- مامۆستا سالح يوسفى لەكۆنفراسى ماوەت و كۆنگرەى شەشى قەڵادزێ بەشدارى نەكرد.

٣- ئيسماعيل عارف بەهۆى خزمايەتى لەگەڵ هاوسەرەكەى ئيدريس بارزانى بەناچارى بوو بەئەلقەلەگويى بنەماڵە، هەر بۆيە

کەوتە بەربەرەکانیکردنی بالی مەکتەبی سیاسیو گروپەکەی ئیبراهیم ئەحمەد.

٤- شیخ محەمەدی هەرسین دوای ئاش بەتاڵ بەداخەوە ئینجا ماهیەتی مەلا مستەفای زانی، لەئاوارەیی لەتاران تیرۆر کرا.

٥- عەزیز عەقراوی شۆرشی بەجیهیشتو پالیدا بەبەعەس، ئەوە بوو کرا بەوەزیر، پاشان لەدەست بەعس رایکردوو چووە بارەگای مەکتەبی سیاسی لەراژان، کاتیك زانی تیرۆر دەکریّ بەرەو تورکیا هەلات.

٦-ئیسماعیل مەلا عەزیز شۆرشی جیّ هیشتو هاتە پاڵ حکومەتی بەعس.

٧- دکتۆر مەحمود عەلی عوسمان دوای ئاشبەتاڵ ئەم بنەمالەیەی ناسی، ئەوەبوو لەسالی ١٩٧٧دا کتیبیکی دەرکردو هەموو راستیەکانی خستە روو، بەناونیشانی (*الحزب الديمقراطي الكردستاني – اللجنة التحضيرية – تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها*).

٨- حەبیب محەمەد کەریم دوای ئاشبەتاڵ هاتە پاڵ رژیمو چەند کەسیکی بەگرت دا کەدران بەدادگای (الثورة)ی بەعس، بەندە یەکیك بوو لەوانە، لەبەرگی دووەمی کورد دوژمنی خۆت بناسە لاپەرە ١٢١ باسم کردووە. ئەم کابرایە دوای راپەرینی بەهاری ١٩٩١ هاتەوە خزمەت بنەمالەو بوو بەئەندامی لیژنەی (*المراقبه والتفتيش*) !

٩- هاشم عەقراوی شۆرشی بەجیّ هیشتو هاتە پاڵ رژیمی بەعس، کرا بەپاریزەر ئینجا وەزیر. ئەم کابرایە لەو رۆژەوەی

کەبارزانی چاوی بەنوینەری عەبدولسەلام عارف کەوت، لەژێرەوە پەیوەندی لەگەڵ حکومەتدا هەبوو.

١٠- مامۆستا عەبدولرەحمان گۆمەشینی کە لەراستیەکان بەتەواوی گەیشت و لەهەلویست و پلانی بنەماڵە شارەزابوو بەیەکجاری پارتی جێ هیشت و هاتە پاڵ یەکیتی.

کۆنگرەی شەش لەئەنجامدا بەو بریارە کۆتایی پێ هات کەبالی مەکتەبی سیاسی، گروپی ئیبراهیم ئەحمەد دوور بخرینەوەو هەموو سەروەت و سامانی حزب تەسلیم بەئەندامانی مەکتەبی سیاسی تازە بکریت کە لەمانگی تەمووزی سالی ١٩٦٤ لەکۆنگرەی شەش هەلبژیردران، لەلایەکی تر کۆنگرەکە داوای لەرژیمی عیراق کرد کەحالەتی نەشەر نە ئاشتی نەهیلێ و بەزووترین کات دان بەمافەکانی کورددا بنیت و، لەو باردیەوە پیویستە هەلویستی روون بیت.

بەشی زۆری ئەو خەلکانەی لەشۆرشدا بوون، لەهەلویست و بریارداندا بوون بەسێ بەشەوە: بەشی یەکەمیان ئەو ئەفسەرانە بوون کەکەوتنە ژیر کاریگەریی بارزانی. لەبەر ئەوەی بارزانی لەزۆر رووەوە بارودۆخی باشتر بوو کەوتە پلان دانان و بەراشکاوی گفتوگۆی لەگەڵ ئەندامانی کۆنگرەدا دەکردو دەیگوت بەهیچ جۆریک چۆك بۆ رژیمی عەبدولسەلام دانادەم. زۆر لەئەفسەرەکان چوونە پاڵ مەلا مستەفا تەنها هەندیکیان نەبێ کەدانیشتن، ئەمەش قۆڵ و بازووی بارزانی بەهیزتر کرد.

هەندیکی‌تر لەئەفسەرەکان خودی مەلا مستەفا پەیوەندی پیوەکردن، بەڵام رازی نەبوون لەگەڵیدا ئیش بکەن، لەوانە عەقید نامق حەویزی.

بەشی دووەمی خەڵك کەکاسبو کارمەندو مامۆستاو قوتابی بوو چوونە ناو ماڵو مندالی خۆیانو سەری خۆیان کزکردو پالیان نەدا بەهیچ لایەك.

بەشی سیهەمی خەڵك: ئەوانەی لەناو پارتی بوون بەتیکرایی چوونە پاڵ باڵی مەکتەبی سیاسی گروپی ئیبراهیم ئەحمەد، لەناویاندا چەند ئەفسەریك هەبوون کەپیشتر بەفەرمانی حزب هاتبوونە شاخ، لەوانە کاك کەمال موفتیو کاك نەوشیروان مەستی. لەدواجاردا کۆنگرەی شەش شەری لیکەوتەوەو چەت کەوتە نیوان باڵەکانی ناو پارتی. بەتایبەتی لەلایەن سەرپەرشتیارانی کۆنگرەکە وەك کاك نوری شاوەیسی کەرۆلیکی سەرەکی هەبوو لەدەرچوونی ئەو بریارە خویناوییە.

من زوو زوو سەردانی برادەرانی مەکتەبی تەنفیزیم دەکرد کە بارەگاکەیان لەگوندی هەلشۆ بوو، رۆژیکیان ئاگاداریان کردم کەکاك نوری شاوەیسیو کاك عەلی عەبدوللا لیرەن، لەدووری پانزە ١٥ دەقیقە لەبارەگای مەکتەبی تەنفیزی، بەلام لەلایەن پاراستنەوە لەژیر چاودیریدا بوون. منیش چوومە خزمەتیان لەژیر کەپریك دانیشتبوون، لەئەنجامی گفتوگۆکردن پییان راگەیاندم کەچوونەتە خزمەت مەلا مستەفا وپییان وتووە کەئیمە لەریگای رەفیق پشدەرییەوە وەلاممان بۆ ناردووی کەئیمە دژی ئەم دووبەرەکیەینو بەم هەلویستە رازی نین، وتیان لەکاتی

گفتوگۆماندا لەگەڵ مەلا مستەفا کەباسی تۆ هات، یەکسەر پرسیاری لێ کردین و وتی: هۆی چییە رەفیق دیار نییە، بۆیە بۆمان دەرکەوت کەریزی تۆ زۆر دەگرێ، بۆچی ناچیتە لای سەردانی بکەیت؟، ئەوێ بۆ تۆ گەلێك لێرە باشترە لەپاڵ مەکتەبی تەنفیزی. وتم: نەخێر نیازی چوونم نییەو، ئەگەر بشچم بەراشکاوی ئاگاداری دەکەمەوە کەکاك نوری و کاك عەلی بەهیچ جۆریك ئاگاداری منیان نەکردووە کەمن بیمە خزمەتت تا پێت رابگەیەنم ئەوان دژی ئەم دووبەرەکییەن و لەگەڵ بۆچوونی بالی مەکتەبی سیاسیدا نین.

لێرەدا دوو پرسیار دیتە پێشەوە، گەر لەمام جەلال بپرسین ئایا نوری شاوەیسی کەهەولی لادانی مەلا مستەفای دا لەپارتی. ئایا لەسەر بریاری مەکتەبی سیاسی چووە لای مەلا مستەفا؟ هەرچەندە مامۆستا عەلی عەبدوللا لەسەر بریاری گشتی لێرە مابۆوەو نەچوو بۆ ئیران وبەنهێنی و کاروباری حزبی بەریوە دەبرد، ئایا ئەمیان بەفەرمانی حزب و مەکتەبی سیاسی لەگەڵ نوریدا چووە پاڵ بالی مەلا مستەفا یان بەرای خۆی؟

مەلا مستەفا دەستیکرد بەپلاندانان بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆی، بۆیە فەرمانی دەرکرد کەدەبێ هێزی پیشمەرگە، ئەوانەی جامانەی سووریان لەسەرە جل وبەرگی هێزی پیشمەرگە بکەنە بەریان تا لەم ریگایەوە بنەماڵەو کەسوکاریان لەبەرگی پیشمەرگەدا فەرمانەکانی بنەماڵە جیبەجێ بکەن. ئیدریس و مەسعود ئەم فەرمانەیان یەکسەر جیبەجی کرد. ئەم کارەی بارزانی بۆ ئەوەبوو کەجیاوازی لەنیوان بارزانییەکان و

خەڵکانی تردا نەهێڵێ و، لەلایەکی تر خۆی بەهێز بکا لەرێگای ڕێکخستنی زیاتری هێزی پێشمەرگەوە، هەروەها ئەمە بکا بەنامەیەك و بۆ هەموو دۆست و دوژمنی خۆی بنێرێ، بۆ ئەوەی تێبگەن کەبارزانی خاوەنی دەسەڵاتێکی گەورەیە لەسەرکردایەتی کردنی پارتیدا. کوردیش دەڵێ: گورگە و لەبەرگی مەردایە.

## دەستپێکردنی پەیوەندییەکانی بارزانی

مەلا مستەفا لەساڵی ١٩٦١دا کاتێك لەسنوور بوو هیچ حکومەتێك بەپەنابەر وەری نەگرت و، دوای ئەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی چوونە ئێران توانی بەسەر کوردستاندا زاڵبێت، هەر لەو ماوەیەدا بەناوی پشووودان بۆ راوکردن چوو بۆ دۆڵەرەقە. کاکەزیاد ئاغا و عەباس ئاغا و شێخ لەتیف بۆ ماوەی پانزە رۆژ جێگری بوون.

یەکەم حکومەت کەپەیوەندی پێوەکرد رژێمی ئێران بوو، لەگەڵ نوێنەری خودی رژێمی شا بەنهێنی دوو بەدوو کۆ بۆوە، پاشان لەرێگەی چەند سیاسەتمەدارێکی کورد لەدەرەوەی وڵات پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی ئیسرائیل پەیدا کرد.

بارودۆخی ئەم رۆژە و ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵ ئیسرائیلدا وای کرد شەر دەست پێبکاتەوە لەگەڵ رژێمی عەبدولسەلام عارف.

خرۆپی ئیبراهیم ئەحمەد هەرچەندە لەئێران بوون بەڵام بەهۆی ڕێکخستنەوە ئەو گۆڕانکاریەی کەڕویدا لەنێوان مەلا مستەفاو ڕژێمی عەبدولسەلام عارف ئاگادار بوون، ناچار بوون لەبەر بارودۆخی ئەو ڕۆژە بڕیار بدەن لەگەڵ هەموو چەکدارەکانیان بۆ کوردستان بگەڕێنەوەو تەنها خودی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد مایەوە.

پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت ئەگەر برا لەپشت برابێ، مەگەر قەزا لای خودا بێت. هەر بۆیە پشتی بارزانیو شۆڕشەکەیان گرت. پێکەوە ڕوو بەڕووی سوپای ڕژێمی عەبدولسەلام عارف بوونو چەند هێرشێکیان بردە سەری، کەدەنگی دایەوە بەجۆرێك دوژمن شکاو ئەم شەڕانە بوونە داستان.

## کاکەزیاد ئاغای کوڕی ئاغای کۆیسنجاق

یەکێکە لەبنەماڵە بەریزەکانی کورد، بەناوبانگو ناسراون لەکوردستانی باشوورو باکوور، هەر چەندە سەرمایەدار بوون بەڵام لای هەموو چینەکانی کوردستان ڕێزیان لێگیراوە، خودی کاکەزیاد ئاغا مرۆڤێکی ڕۆشنبیرو نیشتمانپەروەرو سیاسەتمەداری کورد بوو، هەروەها کۆمەکی کۆماری مهابادی کردووە، ڕێزێکی تایبەتی هەبووە لای خودی پێشەوا قازی محەمەد، هەر بۆیە نامەی تایبەتی بۆ نوسیبوو کەمەلا مستەفا وەربگرێت. دوای ئاش بەتاڵ هاتە لەندەن، یەکێك لەکوردەکانی

ناردە لام وپێی ڕاگەیاندم کەتەشریفی دەیەویت بگەڕیتەوە، بۆ ئەم مەبەستە لێپرسراوانی بەعسم بینی و کارەکەم بۆ ڕاپەراند.

ڕۆژی دیاریکراو کەبەریزی گەڕایەوە بەغدا لەفرۆکەخانە هۆلی شەرەفیان بۆ کردەوە، زۆر زۆر ریزیان لیگرت لەبەر خاتری خودی خۆی نەك لەبەر بەندە، چونکە لەخزمەتیدا بووم و بەرەو پیریەوە چووبووم. منیشیان ئاگادار کردەوە کەپیویست ناکات ئەم پیاوە مەزن و نیشتمانپەروەرە بیتە ئاسایشی گشتی تاکو راپۆرت بنوسیت وەکو هەمو کوردیك کەشۆرشی بەجی هیشتووەو گەراوەتەوە. چونکە لەهەموو ژیانیدا هیچ پەیوەندی بەبیگانەوە نەبووە.

بەندە زۆر نزیك بووم لیی، بەهۆی ئەوەوە زۆر لەنهینییەکانی خۆی ئاگاداری کردووم، یەکیك لەمانە کەوا ئاشکرای دەکەم ئەوەیە: قازی محەمەد ئاگاداری دەکاتەوە کەمەلا مستەفا دەچیتە تەوریز بەناوی چارەسەرکردن، لەوی بەنهینی چاوی بەسەرۆك کۆماری ئازاربایجان دەکەوێ، لەدوای گفتوگۆ بەلینیان پیدەدا کەهەموو ئەو هیزەی لەگەلیدا بوو بۆ پالپشتی کۆماری مهاباد تەسلیم بەکۆماری ئازەربایجانی بکات بۆ ئەوەی کۆماری مهاباد لاواز بیت.

پیشەوا بەمە دەزانیت خودی خۆی دەچیتە تەوریز لەگەل نوینەری حکومەتی روسیا کۆدەبیتەوەو گفتوگۆی لەگەلدا دەکات، کەئەمە چ زیانیکی گەورە بەکۆماری مهاباد و ئازربایجان دەبەخشی، دووبەرەکییەکی وشك لەنیوانیاندا پەیدا دەکات و، پیشەوا تاوانەکەی دەخاتە پال سەرۆکی کۆماری ئازەربایجان

نەك مەلا مستەفا. نوینەری حکومەتی روسیا یەکسەر هەلویست وەردەگریت و نارەزایی نیشان دەداو ناهیلیت ئەم پیلانە سەر بگریت.

جەنابی سەعیدخان هومایۆنی کەخوشکەزای قازی محەمەدەو لەیاوەرانی پیشەوا بوو ئەمەی بۆ گیرامەوە لەسالی ١٩٨٧دا وتی: دوای ئەو هەلویستەی مەلا مستەفا کەویستی پیرەوی بکات، پیشەوا کەوتە گومان لەمەلا مستەفا بۆیە نەیهیشت ئاگاداری هەموو شتیك ببیت بۆ ئەوەی کۆمارە ساواکەیان لی تیك نەدات.

## عەباس ئاغای مامەندئاغای سەرەك هۆزی ئاکۆ:-

سەرۆك هۆزیکی نیشتمانیەروەرە، هەموو ژیانی خۆی تەرخان کردبوو لەپیناوی خزمەتی نەتەوەی کورد، ئامادەگیری و فیداکاری هەمیشە تیدا بوو. لە سەردەمی پاشایەتیدا بۆ رزگارکردنی کوردستان، مال و، هۆزەکەی بارەگای سەرەکی بوو بۆ هەموو حزبە سیاسییەکانی کوردستانی باشوورو کوردستانی رۆژهەلات بەتایبەتی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان.

دوای گەرانەوەی مەلا مستەفا بۆ عیراق نزیکترین سەرۆك هۆز جەنابی عەباس ئاغا بوو لای خودی خۆی، بەجۆریك کاتیك بەنهینی لەگەل مەلا ماتۆر کۆدەبیتەوە پیی رادەگەیەنی کەهەموو هیرشیك بۆ سەر عەباس ئاغا یەعنی بۆ سەر شیخ ئەحمەدی بارزان *(سبحان من یغیر الاحوال)* بەلام مەلا مستەفا لەو رۆژەی

هاتە حەوزی دوکان بەزۆری میوانی خودی عەباس ئاغا بوو کە لەسەرکەپکان بوو، کەوتە باسی عەباس ئاغا دەیوت: هەولی لەناوبردنی بالی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد دەدات. وایزانی عەباس ئاغا پشتگیریان دەکات، ئەوە بوو هەلویستی بەئاشکرا پی نیشاندا کەئەمە دەبیتە هۆی دووبەرەکی لەناو شۆرش و زیانیکی گەورە بەکورد دەگەیەنی لەسەران سەری کوردستان. هەر بۆیە عەباس ئاغا لایەنگری حەقی گرتەبەر ئەویش بالی مەکتەبی سیاسی گروپی ئیبراهیم ئەحمەد بووو پشتگیری‌کردن.

مەلا مستەفا لەبەر چاوی خەلك بەئاشكرايی پیشانیدا کەعەباس ئاغا ریزی تایبەتی هەیە، بەلام پیلانی بۆ دانا بوو، هەر چەندە ویستی لە پایەی ئەم زاتە نیشتمانپەروەرە کەم بکاتەوە هیچی بۆ نەکراو نەچووە سەر، بەلام بارزانی هەر بەردەوام بوو بەتایبەتی دوای ئەوەی مام و برادەرەکانی بەیارمەتی عەباس ئاغا هەلاتن، بۆیە ویستی بەئاشکرا بەربەرەکانیی بکات و سووکی بکات، بەلام سوپاس بۆ یەزدانی مەزن هیچی لەگەل بۆ نەکرا.

بەندە بەهۆی ئەوەی کە بەئاشکرا لەدامودەزگا ئەمنییەکانی حکومەت بووم ئەم شایەتیە دەدەم کەبەهیچ جۆریك پەیوەندی بەحکومەتەوە نەبووو، کەتەشریفی هاتە بەغدا لە نەخۆشخانەی سوپا لەسەربازگەی رەشید وەرگیرا بەهۆی خودی من بوو، حکومەت ریزی لە خودی خۆی دەگرت .چونکە پیاوی بیگانە نەبوو.

## شيخ لەتيفى شيخ مەحموودى حەفيد:-

هەر چەندە ناميلكەو كتيب لەسەر ئەم كەلەميردە بنووسريت هيشتا كەمە، لەهەموو رويەكەوە، ئازا، دلئاواو سادەوساكار لەگەل گەورەو بچووك، دەولەمەندو هەژارو شاو گەدا، هەر هەموويانى بەيەك چاو تەماشا دەكردن.

مالەكەى چ لەسليمانى يا لەگوندى داريكەلى جىنژەرگەو بارەگاى سەرەكيى هەموو حزبە سياسيەكان بوو چ لەكوردستانى باشوور يا كوردستانى رۆژهەلات بەتايبەتى بۆ پارتى ديموكراتى كوردستان و ئەوو نيشتمانپەروەرو هەژارو هەناسەساردێك، دەرگاكەى هەميشە لەسەرپشت ئاوالە بوو، پەيوەندى بەخودى خواليخۆشبوو سەرۆك كۆمارى مەهابادەوە هەبوو، جگە لەوەى ئەندامى كاراى پارتى ديموكراتى كوردستان بووە.

كاتيك مەلا مستەفا دوور خراوەتەوە بۆ شارى سليمانى شيخ لەتيف يارمەتيەكى زۆرى دا، هەر ئەويش يارمەتى‌دا بۆ ئەوەى لەسليمانيەوە هەليت. خواليخۆش بوو مەليكى كوردستان فەرمووبووى لەتيفى كورم تاجى مەلەكيى لەسەرى خۆى كردەوەو خستيە سەرى مەلا مستەفا.

دواى ئەوەى كەدووبەرەكيەكە رۆژ بەرۆژ لەنيوانياندا زياتر پەرەى سەند خۆى نەدا بەهيچ لايەكداو پشتگيرى خودى مەلا مستەفاى نەكرد. بەلام بارزانى دەسەلاتى بەتەواوى بەسەر

کوردستاندا گرت و بالی مەکتەبی سیاسی دوورخستەوە، ئەو کاتە بەئاشکرا کەوتە بەربەرەکانیکردنی خودی شیخ لەتیف سوکایەتی پی کرد. شیخ لەتیف کاتیك لەبەغدا لەگەرەکی یەرموك خانووی گرتبوو، رژیم دوو کلاشنکۆفیان دابوویە بۆ بەرگریکردن لەخۆی، بەلام بەبێ فیشەك ! من فیشەکم بۆ بردوو یارمەتیم دا. لەلایەن رژیمەوە خرابووە ژیر چاودیری توندەوەو، کاتیك لەنەخۆشخانە کەوتبوو، لەلایەن بنەمالەوە هیچ بایەخی پینەدراو، بەو شیوە شکۆدارەی کە لەبەغداوە هینرایەوە بۆ سلیمانی لەئەنجامی هەولّ و کۆششی خودی خۆم بوو کەتوانیم لەسەردەمی نازم گزاردا ئۆتۆمبیلی پۆلیسی فریاکەوتن و چەند لیپرسراویکی ئاسایش لەگەلّ تەرمەکەیدا بینم. لەگەلّ ئەوەشدا کەئەم کەلەپیاوە هیچ پەیوەندییەکی بەرژیمەوە نەبوو هیشتا بەدۆستیان دانەدەناو بەچاوی دوژمن تەماشایان دەکرد. ئەو گرنگی پی نەدان و دوژمنایەتییەکەی مەلا مستەفا بەرامبەر ئەم زاتە لەبەر ئەوە بوو کەدەترسا جیی بگریتەوە.[٣]

---

[٣] ریزم هەیە بۆ ئەو سی سەرکردە ناسراوەی کە لەسەرەوە زۆر بەکورتی باسمکردن. کاکەزیاد ئاغا دوای ئاش بەتالّ و گەرانەوەی بۆ بەغدا ئینجا ماهیەتی خودی مەلا مستەفا ناسی لەگەلّ ئەوەشدا نامیلکەیەکی بلاوکردنەوە لەسەر ئەو نهینییانەی کەدەیزانین، هەروەها خولیخۆش بوو عەباس ئاغا لەکارستانی بوو ئینجا دلی خۆی کردەوە، شیخ لەتیف لەکارستانی راهیبات بوو ئەویش لەداخی دلی خۆی چەند قسەیەکی دەکرد.

## سەرکەوتنەکانی بەتالیۆنی ٩ی هێزی قەرەداغ بەسەر سوپای عەبدولسەلام عارفدا

لەبەرگی دووەم (لەلاپەرە ١٨٩)دا، بەدوورودرێژی باسی ئەوەم کردووە کەهەولیکی زۆرم دا تاشیخ ئەحمەد بارزانی نەهیلیت مەلا مستەفا هیرش بباتە سەر بالی مەکتەبی سیاسی ئەماوەت. کاتیک گەیشتینە خزمەت مەلا مستەفا لەگەل نوینەرەکەی شیخ ئەحمەد، دوای ئەو هەموو سوکایەتییەی کەبارزانی پیی کردم و جوینی زۆر ناشیرین و هیرشی بردە سەر کەسوکارم، لەگەل ئەوەشدا پشتم لەشۆرش نەکرد، ئەوە بوو کەشەر دەستی پیکردەوە چومە خزمەت برادەرانی مکتب تنفیزی[4] کەبارەگاکەیان لەگوندی هەلشۆ بوو، ئاگادارم کردن

---

ئیرەدا هێش دەلیم: بەریزان ئیوە زاتی مەلا مستەفاتان ناسی لەیەکەم رۆژەوە بۆچی یەکیکتان هەولتان نەدا جیی ئەو بگرنەوە ئەگەر هەولتان دابا و راستییەکانی ئەم پیاوەتان دەرخستایەو پالتان بەبالی مەکتەبی سیاسییەوە بدایە ئیستا کوردستانی سەربەخۆمان دەبوو. راستە ئیوە هەولیکی ئیجگار زۆرتان دا کەئەم دووبەرەکییە دروست نەبیت تەنها ئیوەی بەریز لەیەکەم رۆژەوە رووبەرووی مەلا مستەفا راوەستان بەلام لەهەمان کات پشتتان بەرنەدا، کاتیکیش هەموو شتیکی کۆنترۆل کرد ئیتر هیچ بایەخیکی بەئیوە نەدا.

[4] مەکتەبی تەنفیزی بەفەرمانی خودی مەلا مستەفا دانرابوو، بەو نیازەی کەجیگای بالی مەکتەبی سیاسیی گروپی ئیبراهیم ئەحمەدی دەگرتەوەو شۆرش بەهیز ئەکەن لەئاستی پیشمەرگەی ریزی ریکخستن. بەلام بەداخەوە لەبەر چەند هۆیەك سەرنەکەوتن، نەك هەر جیگای ئەوانیانی نەگرتەوە بەلکو بەجۆریك شیرازەی پیشمەرگەو ریکخراوەکان تیکچوو، چونکە بەفەرمانی ئەمانە بوون بەئەندام لەکۆنگرەی شەشەمی قەلادزیو پیشمەرگەو ریکخراو بایەخیان پی نەدان و لە ئەنجامدا ٢٪ی ئەندامەکانی چوونە پالیان.

کەئامادەگیریم تیدایە وەکو پیشمەرگە لەخزمەت شۆرشدا گیانی خۆم بەخت کەم. برادەرانی مەکتەبی سیاسی ئەم هەوالەیان بیستبوو کەهەموو بریاریك دەبوو خودی مەلا مستەفا لیی ئاگادار بیت، بەجۆریك مەکتەبی تەنفیزی بۆیان نەبوو هیچ بریاریك بدەن و لەژیر چاودیری چەند جامانە سوریکدا بوون. بۆیە شیرازەی پیشمەرگە تیکچوو، بۆ نموونە عەزیز عەقراوی دانرا بەئامر هیزی قەرەداغ بەلام نەیتوانی سەرپەرشتی هیزەکە بکات، چونکە بەشی زۆری پیشمەرگە ریکخراو بوون و ئەو بارودۆخەی ئیستایان باش هەلسەنگاندبوو وایان زانیبوو ئەمە سوپایەکی نیزانییە فەرمان جیبەجی دەکات. هەروەها حسابی بۆ ئەوە نەکردبوو خاوەن بیروباوەرو کۆیلەی ئەو نین !!

هەرچی بەکاك عەلی و کاك نوری وتبوو دەربارەی من، بوو بەپالپشتیك بۆم. کاك نوری مەلا مەعروفیان دانا بەئامر هیزی قەرەداغ لەجیاتی کاك عەزیز عەقراوی. منیشیان ئاگادار کرد کە لەگەل کاك نوری دەبیت بەپیشمەرگە، دوایی بریاریکی لەسەر دەدەین.

وتم: لەئەنجامی ئەو رووداوەی کەروویدا لەنیوان بارزانی و بالی مەکتەبی سیاسیی جەماعەتی ئیبراهیم بەشیکی زۆر لەپیشمەرگە ئازاکان ئیستا لەمالی خۆیان دانیشتون. ناسیاویەکم لەگەلیاندا هەیە کاتیك کە لەبەدۆ بووم، ئەتوانم یەکەیەکە پەیوەندیان پیوە بکەم بۆ ئەوەی بیتەوە ریزی پیشمەرگە، ئەمەش سودیکی گەورەی دەبیت، بەلام باش بزانن

ئەمانە بەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد ناسراون دوایی راپۆرتی زۆرم لەسەر دیت.

دکتۆر مەحموود عوسمان وتی:- ئەمە سوود بەشۆرشەکەمان دەبەخشیت، زۆرمان پێ باشەو پشتت دەگرین و چاومان لیت دەبیت.

ریگامان گرتە بەر بەرەو جیی دیاریکراو، کاك نوری ئامر هیزو عەقید عەبدوللا ناسراو بەعەبە کەلەك جیگری ئامرهیز، ئەوە بوو هاتینە خزمەت شیخ لەتیفی شیخ مەحموود لەداریکەلی. لەو کاتەدا سوپای رژیمی عەبدولسەلام نیازی،هیرش بردنی هەبوو. بۆیە دەستی کرد بەتۆپ بارانکردنی ئەزمەر، کاك نوری و بەندە کەوتینە ریگا گەیشتینە ناو پیشمەرگە لەقەرەداغ.

کاك تاهر شیخ رەئووف جیگری هیزی قەرەداغ بوو، ژمارەی هیزەکە ١١٥٠ پیشمەرگە دەبوو، ناوچەکەی خۆیان بەجی هیشتبوو بەتیکرایی لەقەرەداغ کۆبنبوونەوە، لەشکریکی بی‌سەرووبەربوو، رۆژانە ژمارەی ١٠ پیشمەرگە زیاتر دەچووە مالەوەو دادەنیشتن. کاك عەزیز عەقراوی کەناسراو بوو بەعەزیز بارزانی و ئامر بتالیۆنی٩ بوو، وایزانیبوو هەروا بەئاسانی جیگای کاك کەمال مفتی دەگریتەوە، ئینجا لەجیاتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتیری پارتی دیموکراتی کوردستان کاك حەبیب عەبدولکەریم بەفەرمان دەکریتە سکرتیر. هەموو ئەو هۆیانە کۆبوونەوەو بەم شیوەیە شیرازەی هیزەکە تیکچوو.

خودی کاك تاهر شیخ رەئووف هەولیکی زۆری دابوو کەچارەسەریك بدۆزیتەوە بۆ ئەم گیروگرفتانەی، رۆژانە لەهەولدا

بووەو دریغی نەکردووە. بەلام کێشەکە گەلێك گەورەتر بووەو باری زۆر قورس بوو.

ئەم بارودۆخە کە لەسەرەوە باسم کردووە بووە هۆی ئەوەی جێگرەکانی کاك نوری لەداریکەلی بميننەوەو نەیەن. بەندەی بچووکتان جێگای جێگرەکان و لێپرسراویەتیی دارایيم گرتە دەست. پێشمەرگەکانی بەتالیۆنی ٩ بەتیکرایی مانیان گرت، دەیان وت دەبێت دکتۆر رەفیق بکریتە ئامر بتالیۆنی ٩، هەندێك پێشمەرگەی گەرمیان وەك کاك نوری و د.مەحموود عەلی عوسمان داوایان لێکردم ئەم ئەرکە وەربگرم، بۆیە بووم بەئامر بەتالیۆنی٩. بەندە پەیوەندی کرد بەهەموو ئەو برا پێشمەرگە کۆنانەی کە لەیەکەم رۆژی شۆرشەوە خەباتیان دەست پێکردبوو بەلام بەهۆی ئەو دووبەرەکیيە دانیشتبوون. ئەوانیش بەدەنگمەوە هاتن و یەکسەر هاتنەوە لەوانە: عەزەی حەمە خەنان و عەزەی ئەوردحیم. راستە هێزی قەرەداغ بەژمارە زۆر بوو، بەلام ئەم ١٢ پێشمەرگەیەی کەهاتن ورەی هەموو هێزەکەیان بەرز کردەوە، چونکە بەجۆری ناسرابوون کەپێویستە هەر یەکێك لەمانە پەیکەریکی بۆ دروست بکریت. هەر چەندە تەنها عەزەی حەمە خەنان ماوە بەلاّم نانی شەوی نییە، منیش لەو هەژارترم! کەچاوم پیکەوت خۆم شاردەوە چونکە گیرفانم بەتالّ بوو!

بەمەبەستی خۆریکخستن و خۆ ئامادەکردن بۆ رووبەرووبوونەوەی دوژمن کاك نوری مەلا مەعروف ئامر هێزی قەرەداغ کۆبوونەوەیەکی بەهەموو لێپرسراوەکان کرد، دەستی

كرد بەقسەكردن دەربارەی باروودۆخی ئەوەی كە بە چ جۆریك دەتوانین زال بین بەسەر سوپای رژیمدا. لەئەنجامی ئەم كۆبوونەوەیە دوو بۆچوون هاتە كایەوە، یەكەمیان ئەوە بوو كەپیوستە هەموو هیزەكە بچیتە شاخی بەمۆو پاشەكشی بكەین، ماوەیەك لەوی بین و بحەسیینەوە ئینجا بەتەواوتی خۆمان ریك خەینەوەو بگەرییینەوەو هیرش بەرینە سەر دوژمن.

كاك نوری رووی كردە من پرسیاری لیكردم ئایا تۆ دەلییت چی؟

وتم: من ئامادەییم تیدانیە بۆ جیبەجیكردنی ئەو بریارە، بۆیە ئەگەر ریگام پی بدەیت دەچمەوە بەغدا، هاوسەرەكەم دەوڵەمەندە، كەی ئیوە گەرانەوە بۆ قەرەداغ منیش دیمەوە. من بەم ماوەیە شارەزای برا پیشمەرگەكان بووم، كەموكورییەكی زۆریان هەیە بەشیوەیەك زۆریان پیلاویان لەپیدانیە، رووت و برسین، بە ٥٠٠ دینار كیشەكانیان جیبەجی دەكەم، بەلینتان پی دەدەم دوای چەند رۆژیك هیرش دەبەینە سەر سوپای دوژمن، ئیتر یا بەتیكرایی هەر هەمووومان شەهید دەبین چونكە خۆم لەپیشتانەوە دەرۆم و، بەجۆریك هیرش دەبەینە سەر دوژمن ئینشاللا جیی دەستمان دیار دەبیت.

ئینجا كاك نوری پرسیاری لەكاك ئەحمەد بانیخیلانی كرد كەرای ئیوە چییە؟

مامۆستا ئەحمەد بانیخیلانی وتی:- من لەگەڵ رای دووەمم بری ١٠٠٠ دینارم لایە هی مەكتەبی سیاسییە كەهەندیك شتی

تایبەتیان بۆ بکرم، دەتوانم ئەوەی لەو پارەیە ماوەتەوە بیدەمە دەست جەنابتان.

پاشان پرسیاری لەکاک حەمید بەرواری کرد کەئامر بەتالیۆنی ٥ بوو ئایا رای تۆ چییە؟ وتی: من راناکەم، دەچمەوە سنووری ناوچەی خۆم کەزەنگەنەو بەشێك لەناوچەی داودەیە، من کەهاتوومەتە ئێرە رام نەکردووە بەلام عەزیز عەقراوی بەزۆر هێنامی.

کاك نوری وتی: زۆر جار سەربازێك دەبێتە هۆی سەرکەوتنی لەشکرێکی روخاو ئینجا سوپاسی بەندەی بچوکتانی کردو وتی منیش لەگەڵ بۆچوونی تۆم کاك رەفیق، ئینشاللا سەرکەوتوو دەبێت، ئینجا بری ٥٠٠ دیناریان دامی.

یەکەم شت ٢٨٠ پیلاوی لاستیکم کری بەنرخی (ماشان) بە٢٧٥ فلس، بری١٥دینارمان دا بەسابوون، بایی ٥٠ دینار کراسمان کری. سێ رۆژ گۆشت و نانمان خوارد، رۆژی ٦ گیسکمان سەر دەبری و کەگیسکی بە٥ دینار بوو.

پێشمەرگەکانم کۆکردەوە وتاریکم پێشکەشکردن و وتم: سێ رۆژە ئێوە بەگشتی هەر هەمووتان خەریکی خۆشتن و خواردن و پشودانن، ئایا پرسیارم لێ ناکەن ئەمە چییە؟ ئەمە نەمەولودی پێغەمبەرە صلی علیە وسلم و نە ژنم هێناوە و جەژنیش نییە، ئەگەر میوانداریش بێت یەك رۆژە، بوونمان لێرە بۆتە هۆی ئەوەی دانیشتوانی گوندی سیوسینان و گوندی ئالیاوە توانجمان لێ بگرن، ١٥ رۆژ پێش ئێستا لەمالیك بووم کاتی

نانخواردن زۆر باش گویم لی بوو هاوسەرەکەی وتی دکتۆر رەفیق سەر خۆی قەلەو دەکات کەی ئەمانە پیشمەرگەن، عەرەبی حەویجە لەقۆپین رۆژ نیە ٧ تاکو ١٠ پیشمەرگە ریزی پیشمەرگە بەجێ نەهیلیت‌و روونەکاتەوە مالی خۆی، زۆرتان لەبەمۆوە دەناسم، بەیەکەوە بووین لەجەولەی ناوچەی هەلەبجەو گەرمیان، بیرتانە بەچ جۆریك جەماودر بەپیرمانەوە دەهاتن، ئیستا کەدانیشتوانی ناوچەکە پشتمان تێ ددکەن، ئامادەییتان تیدایە کەبۆیان بسەلمینن ئیمە پیشمەرگەی کوردستانین؟ یان یا بەیەکجاری چەك دابنیین‌و رووبکەینەوە ناو مال‌و منالی خۆمان؟ چ ریگایەك بگرینە بەر، روو بەرووی دوژمن بوەستین یا پشتی تیبکەین‌و کوردستانیان تەسلیم کەین، بەیەك دەنگ هەموویان کەژمارەیان لە ٣٨٠ پیشمەرگە زیاتر بوو هاواریان کرد یا کوردستان یان نەمان.

بۆیە یەکسەر لیپرسراوانی بەتالیۆنی ٩ و بەندەی خزمەتکاری کوردو کوردستان‌و حسەینی حاجی محیدین یاریدەدەری ئامر بەتالیۆن‌و، هەر سێ سەرلق عەزەی حەوا، حسەینی خەلیفە مالك، کامیلی مەلا وەیسی و هەموو سەرپەل‌و سەردەستەکان کۆبوینەوە، لەگەڵ برا پیشمەرگەکان بەسەر کردایەتی عەزەی حەمەی خەنان. یەکەم کارمان لەسەعات چواری شەو بۆسەیەکمان دانا لەنزیك گوندی تەکیەی قەرەداغ ، بەیانیەکەی کە رۆژ هەلات لەگەڵ ٣٥ پیشمەرگە کەوتینە بۆسەی سوپاوەو هەر چوار دەورمان گیرابوو جیگا بەرزەکان بەدەست ئەوانەوە بوون. هەرچەندە لەکاتی بۆسەدانانداا ئیمە ٣٨٠

پیشمەرگە بووین، بەڵام تەنها منو ٣٥ پیشمەرگە کەوتینە ناو ئەم بۆسەیەوە. لەهەمان کاتدا فرۆکە هات بۆردمانی کردین، بەڵام لەجیاتی ئەوەی راکەین ئیمە هیرشمان بردە سەریان بۆیە شکانو قوچاندیان، شەر چەند سەعاتیك بەردەوام بوو، نوسراویکم ئاراستەی ئامرهیز عەقید نوری کرد کەئامر بەتالیۆنی ٩ بوو، پیم راگەیاند کەیەك پیشمەرگە زامدارەو فیشەکیك بەر بەلەکی کەوتووە، زامەکەی زۆر سووکە هەر زوو چارەسەرم کرد، لەو شەرەدا ٢٣٥ فیشەك مان بەدوژمنەوە ناوە.

دەستکەوتمان چەند تەنکەرو دوو فەردە برنجو فەردەیەك شەکرو چەند کیلۆیەك چا لەگەڵ دوو تاوە کوللەی لەرۆن سورکراو. دوژمن هەرچی کوژراوو زامداریان هەبووە لەگەڵ خۆیان بردیان، هەندیك فیشەکی کلاشنیکۆف بەدەسکەوت لەرژیم جیما. بەجۆریك نزیکبووینەوە لەیەکتر کەخەلکی گوندی ئەم ناوە بەتایبەتی گوندی سیوسینان وایان زانیوە کەئیمە کەسمان نەماوە، چونکە فرۆکەکان هیرشیکی زۆریان هینایە سەرمان، کاتیك شەر تەواو بوو چامان لینابوو نانمان دەخوراد، کەپیاو ژنو منالی گوند بەگریانەوە هاتنە سەرمان کەدیتیان ئیمە سەرکەوتنمان بەدەست هیناوە گریان بوو بەگۆرانیو هەلپەرکێ.

ئەو کاتە کەچوومە خزمەت کاك نوری زۆر ریزی لی گرتم شەرمەزاری کردم، منیش وتم: سوپاس بۆ یەزدانی مەزنو پیشمەرگەو دانیشتوانی ناوچەکە، من تەنها پینج فیشەکم تەقاندوە. دوای ئەم هیرشە بەچەند رۆژیك سوپای دوژمن

هێرشی هێنایەوە بۆ سەرمان، دووبارە پێشمەرگەکانی بەتالیۆن ٩ بەرامبەریان راوەستان، ئەم جارەشیان لەسایەی خوای گەورە سەرکەوتین.

## دوو روداوی گرنگ لەکاتی ئەو شەرەدا :

کاتیك بەرەورووی دوژمن دەرۆیشتین سەعات ٨ی شەو بوو جارێ دوژمن هەر تۆپ بارانی دەکردین، نەفەریك هاتە لام وتی: دکتۆر رەفیق کاری تایبەتیم پیتە ، من توانای ئەوەم نیە بەرامبەری ئەم شەرە راوەستم چونکە نەخۆشم رەوانەم بکەوە بۆ هەلشۆ، دەچمە لای مەکتەبی تەنفیزی فیشەکت بۆ پەیدا دەکەم، تکام وایە دوو پێشمەرگەم لەگەڵ بنێریت و ئەم خەبەرە بڵاو نەکریتەوە، منیش یارمەتیم دا.

دوای تەواوبوونی شەر برایەکی جوتیار هاتە لام، وتی:– من بیستانی کالەکم هەیە، گویدریژەکەمم برد بریك لیکەمەوە بچمە شار بیفرۆشم، کاتیك سەرنجمدا بیستانەکەم هەمووی رندراوە ماوەی دوو سەعات گەرام یەك کالەکم دۆزیەوە.

ووتم: خۆت باش دەزانی ئەم شاخە ئاوی نییە، دوژمن بەتۆپباران ئاگری تیبەرداوە، ئیمە نزیکەی ٤٠٠ پێشمەرگە بووین زمانمان وشك بوو لەتینوویان ئاو نەبوو بخۆینەوە، کاتیك بیستانەکەی تۆمان چاوپیکەوت دەستمان کرد بەخواردنی ئیمە رزگار کرد، ئەگینا، بەشی زۆرمان دەخنکاین، هەرچی تۆ

دڵنیبیت بەسەر چاو، بڕی ٣٠ دینارم پێیە هەر هەمووی بۆ تۆ بێت.

وتی: من سالی بایی ٢٥ تا ٣٥ دینارم دەفرۆشت، لەگەڵ ئەوەشدا فەقیر حالم، بەڵام مادام ئێوە بەم جۆرە ئازان پارە وەرناگرم.

وابزانم دارایی بەتالیۆنەکە هەمووی ٣٠ دینار بوو، ١٥ دینارم پێ دا. حزب فەقیر، میللەت دەولەمەند.

ئینجا ئێمە لەهەموو لایەکەوە دەستمان کرد بەهێرش بردنەسەر سوپا، تەنها دوو لەو شەڕانە باس دەکەم، ئێوارەیەکیان ٥٠ پێشمەرگە بووین هاتینە سەر قەرەداغ لەکاتێك کەسەربازەکان نانی ئێوارەیان دەخوارد، ژمارەی ١٥ کەسمان بەجۆرێك نزیك بوینەوە لییان، دەمانچەی حەوت تیر دەگەیشتە ناویان، کەدەستریژمان لێکردن قوچاندیان هەر یەکە بەلایەك، زاڵنەبووین کەبتوانین دەست گیریان بکەین. لە دادگای شۆڕشی بەعس یەکی لەتاوانەکانی من ئەوە بوو کەدەیانوت تۆ ئەو سەربازانەت کوشتووە. لەبەر ئەم شەڕو نەبەردییانەی هێزی پێشمەرگە دانیشتوانی ناوچەکە بەتیکرایی بەرامبەر پێشمەرگە گۆران، کەروومان تێ دەکردن بەجۆرێك بەپیرمانەوە دەهاتن خزمەتیکی زۆریان دەکردین، بەشی زۆری ئەو برا پێشمەرگانە کەدانیشتبوون هاتنەوە ریزی براکانیان رووبەرووی دوژمن راوەستان، ئەوەبوو دەستپێشخەری کەوتە دەست ئێمەو بەردەوام لەچالاکیدا بووین و، لقی مامۆستا ئەحمەد بانیخێلانی ئەویش بەردەوام بوو لەهێرش بردنە سەر سوپای دوژمن.

ئێمە یەکەم کەس بووین کەتوانیمان بچینە ناو نەخۆشخانەی سویا لەدەربەندیخان کەمەبەستمان لەو چوونەماندا دەستگیرکردنی خۆفرۆش ئامر فەوج عەقید فایەق بوو، چونکە ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری هاوڵاتیانی دەدا.

بۆ دەستگیرکردنی عەقید فایەق ئەوەی یارمەتی داین کەبچینە ناو نەخۆشخانەکە هاووڵاتیی نیشتمانپەروەر کاکە حەمەی حاجی مەحمودی (پونگلە) هاروونی بوو، کە لەگەلماندا هات و هەموو فیداکارییەکی بەکارهینا، بەڵام بەداخەوە دوو رۆژ پیش هیرشەکەمان عەقید فایەق نەخۆشخانەکەی بەجێ هیشتبوو، بۆیە بەناچاری و بەسەلامەتی گەراینەوە.

لەگەڵ ئامر هیز کۆبوینەوە ئاگادارم کرد وتم: گەورەترین وگرنگترین ناوچەی گەرمیان کەسنووری بەتالیۆنی ٩ یە سنوورەکەی جبل حەمرینە. بەشی زۆری ئەم ناوچەیە چۆلکراوە، چلکاوخۆرەکانی میری لەنیوان کفری و کەلارو نزیک جەلەولا هاتوچۆ دەکەن ، بەشی زۆری پیشمەرگە خەلکی ئەم ناوچانەن وا سێ مانگە بەفەرمانی عەزیز عەقراوی هاتوینەتە قەرەداغ، بەڵام ئیستا کەپیویست ناکات چونکە بارودۆخ لەناوچەکەدا ئارامە، بەریزتان بارەگاکەتان لیرەیە، تکام وایە لەبەر بەرژەوەندی گشتی ریگامان پێ بدەیت تاکو هیزی بەتالیۆنی ٩ بگەریتەوە شوینی دیاریکراوی خۆی.

ووتی: رازیم بەڵام دەبیت چالاکی و فیداکاریتان وەك ئیستا هەر لەبەرچاوبیت، چۆن کاك کەمال موفتی شەمنەفەریکی گرت تۆش کاری لەمە گەورەتر بکەیت و جێ دەستتان دیار بیت،

ئیمەش بەڵینمان پێدا کەهەرچی لەتواناماندایە بۆ شۆرش دریغی نەکەین، بۆیە بۆ مەبەستی گەرانەوەمان لەگەڵ برایانی سەرلق و سەرپەل و سەردستەو ئامری یاریدەدەری بەتالیۆن کۆبوونەوەمان کرد، لەسەر رای گشتی بۆ بەرژەوەندی ولاتەکەمان نەخشەمان دارشت و، بیرمان لەوە کردەوە هەلویست و پلانمان هەبیت لەبەرامبەر دوژمن و چلکاوخۆرەکانی. دانیشتوانی ناوچەکەو سێ لق هەریەکە شوینیان بۆ دیاری کراو، ئەوانەی بۆ بۆسە دانرابوون کەوتنە رێ، بەبێ ئەوەی لەیەك گوند لابدەن. چونکە دوژمنانمان ئەوەندە بەبێ ترس هاتوچۆ دەکەن هەرچی مەترسی هەبیت لەپیشمەرگە نەیانماوە، ئیوە کەزۆرتان خەلکی ناوچەکەن بەشیکتان بارودۆخی ئابوریتان باش نیە، وا ئەو پارەیەی هەمانە کەبری ٢٤٠ دینارە ٢٠ دیناری بۆ بارەگای بەتالیۆن دەگیرمەوە، ئەوەی تری تەسلیم بەکاك حسەینی حاجی محیدین دەکەم کەدابەشی بکات بەسەر ئەو برا پیشمەرگانە. حزب فەقیر، میللەت دەولەمەند. کامیلی مەلا وەیسی و عەزەی حەواو عەریف کازم هەر یەکە لەگەڵ ١٢ پیشمەرگە لەلقەکەی خۆیان کەوتنە ریگا بۆمەبەستی بۆسەدانان.

قەرەداغمان بەجێ هیشت، بەیانیەکەی بەرەو گوندی دەرواز دەهاتین، تازە خوشکان خەریکی مانگاو مەرو بزن دۆشین بوون، هاوار هاوارو هەلهەلە دەستی پیکرد لەخۆشی ئەوەی پیشمەرگە بەرەو ئاوایی دیت، دانیشتوانی گوند بەتیکرایی بەپیرمانەوە هاتن لەپیش هەموویانەوە جەنابی کاك حمەی توفیق راوگەل

كويخاو خاوەنی گوندەكە دەستی خستە ناو دەستم وتی:-
دكتۆر رەفيق دەمێكە چاوەروانی ئەو رۆژەم دەكرد.

بەجۆرێك پیشوازی لی كردين نانوسريت ريزوو سەخاوەتی ئەم پياوە مەزنە ريگای پێ نەدايين دابەش ببين بەسەر مالأنەوە كەژمارەمان نزيكەی ٣٢٠ پيشمەرگە ئەبوو. شەوو رۆژێك ماينەوە، بۆ نانخواردن پيكەوە بووين، بەلأم بۆ كاتی پشودان دابەش دەكراين، لەو ماوەيەدا مانگايەك‌و چوار مەرو گيسكيان بۆ سەر برين حزب فەقير مللەت دەولەمەند. بەلأم بەداخەوە تۆفيق ٢٦ كەسی لەهيرشە بەدناوەكانی ئەنفال ون بوو، ئيستا خۆی‌و هاوسەرەكەی لەمحموديیەی بازيان ژيانيكی سەخت بەسەر دەبەن، بەهۆی ئەوەی گيرفانم بەتاله نەم توانيوە سەردانی بكەم، دياره بارودۆخی خراپە وەكو من چونكە سەر بەهيچ حزبيك نييە! لەگوندەكە پيشوازيم لەخەلك دەكرد، بەلأم چاوەروانی ئەوەم دەكرد كەدەنگی سەركەوتنی پيشمەرگەم بۆ بيت. كاتيك پيشمەرگەيەك لەلقی كامل وەيسی زەنگەنە هەوالی سەركەوتنی بلأوكردەوە، داوام لەكاك محەمەد تۆفيق كرد كەدوای نان خواردن دەمەويت وتاريك پيشكەش بەدانيشتوانی ئەم گوندە بەريزە بكەم. لەوتارەكەدا بەدووورودريژی باسی دلسۆزی‌و فيداكاری وەخۆبەختكردنی پيشمەرگەم بۆكردن لەهەمان كات پيم وتن ئەگەر ئيوە بەم شيوەيە پيشتوانی لەئيمە نەكەن، بە هيچ جۆريك سەركەوتن بەدەست نايەو، لەدريژەی قسەكانمدا ئاماژەم بەسەركەوتنی هيزی پيشمەرگە داو وتم:-

نقی کامل وەیسی زەنگەنە بۆسەیەکی لەتاقەکانی کفری داناوە چلکاوخۆرەکانی دوژمن کەوتونەتە ناوی و کەسیان لی رزگار نەبووە، کوژراو زامدارو دیلی زۆریان هەیە، ئەمە یەکەم سەرکەوتنمانە ئینشائەللا چاوەروانی سەرکەوتنی گەورەتر بن.

دوای ئەمە بروسکەیەکم بۆ ئامر هیزی قەرەداغ رەوانە کرد، کەئەمە کورتەکەیەتی:

***بۆ ئامر هیزی قەرەداغ: عقید نوری مەلا مەعروف***

***لە رەفیق پشدەری، ئامر بەتالیۆنی -٩-ەوە.***

***راپۆرتیك دەربارەی بارودۆخی ناوچەکەو هەوالی ئیمە:***

دوای سلاو ..... سەرەتا پیویستە لەوە ئاگادارت بکەمەوە کەئیمە ئەوپەری برایەتیمان بەهیزە لەگەڵ یەکداو سویند بەسەری یەك دەخۆین، تەنها موشکلەی ئیمە فیشەکە، بەجۆریك پەیوەندیمان بەجەماوەر بەهیزە ٩٩٪ ی دانیشتوانی ناوچەکە بەتیکرایی لەخزمەتی شۆرشدان، ژمارەمان گەیشتۆتە ٤٥٠ کەس، کاتیك رۆژی تەنگانە بیتە پیشێ ٢٠٠٠ هاولاتی پشتگیریمان ئەکەن، پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە ریزمان لی دەگرن و یارمەتیمان ئەدەن بەتیکرایی، لەوانە جەنابی مستەفا بەگی جاف وەبەشی زۆری کۆیخاکانیان بەتایبەتی هی رۆغزایی و تەرخانی و هارونی و میکائیلی و باشتی و کەملی و ویسوجانی و نەورۆلی و کیلەکۆیی و، حاجی ئیبراهیم شاتری بری ٥٠٠ دیناری بۆ هینام بەنهینی و، ئاغاکانی زەنگەنە شایانی باسکردنن. بەتایبەتی رۆستەم ئاغا کەسەروەت و سامان و توانای هەموو تەرخان کردووە لەپیناوی کوردو کوردستان و،

ئاغاكانی ناودەشت خراپ نین، ئیستاكە لەسەرانسەری ناوچەكە دەگەڕێن بەدوای پیاوی خراپدا كە ئەوەندە كەمن بەنووكی دەرزی نادۆزرینەوە، پیاو خراپەكان كونە مشكیان لی بۆتە قەیسەری، بەرەو ئەوە ئەڕوا ئەم ناوچەیە سەرانسەری (مقفل) داخراو بێت بەرامبەر پیاوانی میری و چلكاوخۆرەكانی. هەروەها پەیوەندیم بەریكخراوی كفری و سەرقەلا كرد، ئیستا ئاگاداری یەكترین و، چەند پیشمەرگە كەسەر بەجەماعەتی ماموستا ئیبراهیم ئەحمەد بوون دانشتبوون پەیوەندیم پیوەكردن چەند كەسیكیان هاتنەوە ریزی پیشمەرگە. بەلام ٦ پیشمەرگە لەهیزی خەبات بوون رایان كردو هاتنە لای ئیمە. ناچار بووین وەریان بگرین، ئیمە نە دەزگای ئاسایشین و نە پۆلیس، ئیمە پیشمەرگەین و رووبەرووی دوژمن راوەستاوین.

تیبینی/

١-حاجی حەمەجان كەپیاویكی جاف بوو پیاویكی دەولەمەندو ناسراوە، ئیمە سەردانمان كرد وەكو هەموو پیاوە ناسراوەكانی ناوچەكەو ریزمان لی گرت، بەلام بەساردییەوە بەخیرهاتنی كردین. لەو شەوانە هاتە لامان لەگەل حەوت چەكدار بەشیوەیەكی زۆر ناشیرین وتی:من خاوەن ٧٠ چال گەنم و جۆم ٥٠٠ سەر مەرم هەیە، نزیك سەر قەلا، ئیستا كەهاتوومەتە بارەگاكەتان دەبینم بریتیە لەیەك فەردە برنج و ئاردو شەكرو یەك تەنكە رۆن لەگەل چوار كیلۆ چا، ئیوە گون

رووتـــن. ئـــەم قســـانەی وتو ســـواری ولاغـــەکانیان بوونـــەوەو گەرانەوە شوێنی خۆیان.

منیش بروسکەیەکم لیدا بۆ هیزی قەرەداغ پاشان بۆ بارەگای بارزان تییدا وتم: حاجی حەمەجان، مانگی بری ٢٥٠ دینارمان پیشکەش دەکات، تەشریفی هاتبوو یەك سندوق فیشەکی ئینگلیزیو بری ٢٥٠ دیناری تەسلیم کردم، پیویستە شۆرش ریزی لیبگریت، تکام وایە ئیوەش نووسراویکی ئاراستە بکەن چونکە ئەم پیاوە جێی ریز ئیمەیە.

دوای بروسکەکەی من بەسێ رۆژ حاجی حەمەجان هاتە لامان ئـەمجارەیان بـەریزەوە دیـاری بـۆ هینـابووین، نزیکـەی ١٠ چەکداری لەگەڵ بوو، بەدوورودریژ ی بۆی باس کردم کەهیزی سوپای گەرۆك بەفەرماندەیی تەها شەکرچی هاتونەتە سەر گوندەکەو ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری دانشتوانی گوندەکەیان داوە، بەلام من ئەو کاتە لەدەرەوەی گوند بووم ئینجا وتی: لەئیستاوە بەپیشمەرگەم دابنین، کەی هیرشتان بردە سەر دوژمن لەخزمەت ئیوەدا دەبم بەهەموو توانایەکمەوە یارمەتیتان دەدەم.

بەلام ئەو کابرایە نە فیشەك نە پارەی بۆ نەهینابووین بۆیە ئەم بروسکەیەم بەکراوەی ناردبوو تا بزانم هەلویستی دوژمن چۆن دەبیت، قسەم بۆ برا پیشمەرگەکان کردو وتم:- سوپاس بۆ یەزدانی مەزن هەتاکو دوژمنان بەم جۆرە گەوج و ئاوا بێ میشك بن، بەهیچ جۆریك مەترسییان لەسەر کوردستان نابیت.

٢-تەها شەکرچی:- ئەفسەریکی خوینمژە لەکۆیە ٨ کەسی لەبەر چاوی دانیشتوانی شاری حاجی قادری کۆیی لەسیدارە دا.

بۆ دانانی نەخشەی تازە لەگەڵ هەمو لیپرسراوانی بەتالیۆنی٩ کۆبوینەوە لەبارەگاکەمان کە لە ئاوە سپی بوو لەسەروی خان رۆستەم ئاغا.

پیشەکی پرسیارم لەپیشمەرگەکان کرد کە ئایا هیچ گلییەکتان بەرامبەر خودی من هەیەو، ئایا من دزم؟ کەشەر دەبیت لەپیشەوەی ئیوە نیم؟

بەگشتی وەلامیان دامەوە وتیان ئیمە هیچ گلەییەکمان لەتۆ نیە.

ووتم:- من کەخۆم دزی نەکەم ناهیلم ئیوەش دزی بکەن.

لەئەنجامی گفتوگۆو لیکۆلینەوە بۆ پرکردنەوەی پیداویستی لیپرسراوەکان، ریککەوتین یاریدەدەری ئامربەتالیۆن و سەرلق و لیپرسراوی ئازوقە مانگی ١٢دینارو سەرپەل و سەردەستە مانگی حەوت دیناریان هەبیت.

بۆ ئامر هێزی قەرەداغ عقید نوری مەلا معروف

له رەفیق پشدەری ئامر بەتالیۆنی ٩ وە:

راپۆرتێــــك دەربـــارەی بـــارودۆخی ناوچەکـــەو بەشـــێك لەهەلویسـەکانمان کەرووبەرووی دوژمـن راوەسـتاوین ئەیخەمـە بەر چاوتـان، هەر چەندە رۆژانە هەر هێرشێکمان کردبێتـە سـەر دوژمـن بەبروسکە ئاگاداری ئێوەو هەروەها بارەگـای بارزانیمـان کردۆتەوە.

ئێستا لەسەرانسەری ناوچەی گەرمیان بەهێچ جۆرێك دوژمـن دەسـەلاتی ئەوەی نییە بەشەو لەمالی خۆی بخەویت، بـەرۆژیش نـاتوانێت ئـازارو ئەشکەنجەی هاولاتیان بدات، لەشـارۆچکەکانی سـەرقەلاو کفری‌و باوەنورو دەربەندیخان ئەوانەی بەکرێگیراوی دوژمنن ناتوانن بەقەدەر یەك مەتر دیواری میری بەجێ بهێلن..؟

مەفرەزەیەکی سـەربازی لـە١٠ سـەرباز پێك هـاتووەو لـەنێوان سلێمان بەگ‌و گوندی قۆری چای ئازارو ئەشکەنجەی هاولاتیـان دەدا، لـەرێکخراوی کفری چـەند راپۆرتێکـم بـۆ هـات کـەدەبێت هێچی‌تر رێگا بەم تاوانبارانە نەدەیت.

لەگـەل لقـی حەسـەنی خەلیفـە مـالك چوینـە سـەریان دوای شەرێکی نیو سەعاتی چوارمـان بەدیل گرتـن و رەوانەی ئێوەمـان کردن، خۆشمان بەسەلامەتی گەراینەوە.

ئەو شەوەی عارف عەبدولرەزاق ویستی ئینقلاب بکات بەسـەر عەبدولسـەلام عـارف، لەگـەڵ لقـی کـامیل مـەلا وەیسـی زەنگەنـە چوینـە نـاو توزخورمـاتو دوو سـەعات ماینـەوە کۆتنـترۆلی شـارەکەمان کـرد، بـەلام بەداخـەوە بـۆ ئـەم مەبەسـتە لەگـەڵ دوو

ـەندامی ریکخـراوی تورخورمـاتو نەخشـەمان دارشـت بـوو، ـەعات ٨ ی شـەوی لـەجێی دیـاریکراو چاوەروانمـان بـن، بـەلام ـەهاتن. سـوپاس بـۆ یـەزدانی مـەزن وەکـو نـەهاتن زیانیـان لی ـەدابن، بـەلام ئەگـەر شـارەزامان لەگـەڵ بایـە بەشـی زۆری کاربەدەستەکانمان بـەدیل دەگـرت. لـەو چالاکییـەماندا لەیـەك شـەو لەیـەك سـەعات هیرشمـان بـردە سـەر کفـریو سـەرقەلاو دەربەندیخان ئەمەش بەو نیازەی ناحیەی باوەنور بگرین، لەگەڵ لقی عـەزەی حـەوادا چوین بەداخـەوە سـەر نەکـەوتین، دووبـارە بەسەلامەتی گەراینەوە.

لەسـەر داوای ئـامرهیز عقیـد نـوری مـەلا معـروف چوومـە خزمـەتی، دوو بـەدوو بەنـهینی کۆبووینـەوە ئاگـاداری کـردم کەبارەگای بارزانی توپیکیان بۆ ناردووم بەو نیازەی بوردومانی نمرە ٨ی پێ بکەم.

لە ئەنجامی لیکۆلینەوە هەردووکمان گەیشتینە ئەو باوەرەی ئەمە فیلیکی سیاسییە بۆ ئەوەیە کە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك لەمەولا پارەی زیاتری بداتێ، ئەمە زیانیکی گەورە دەبەخشیتو دەبیتـە هـۆی رووخـانی ژیرخـانی ولاتەکـەمان. تۆپەکـەی بـۆ بەتالیۆنی ٩ نارد، سەرپەرشتی تۆپەکە عەزیز حەمید مۆریاسی بوو، ٢١ گوللەی لەگەڵ بوو کەهی جەنگی جیهانی یەکەم بوو! دووری ٣,٥ کیلۆمـەتر ئەرۆیشـت، جاریکیـان هیرشمـان بـردە سـەربازگەیك بـەلام هیـچ سـودیکی نـەبوو، چونکـە چـەند گوللـەتۆپیك نەتەقینـەوە، ئـەوانیش هاتنـە دەسـت و بـەهاوەن وەلامیان داینەوەو ناچار بەسەلامەتی پاشەکشەمان کرد.

پاشــان بــەتیکرایی پیشــمەرگەکان و لیپرســراوان کۆبوونەوەیەکی فراوانمان کرد، دوو شەو لەسەر یەك، بەدوورو دریژی باسی باردۆخی ئیستەمان کرد بەندەی بچوکتان لەیەکەم رۆژەوە وەکو برایەك لەخۆشی و ناخۆشی لەگەڵ ئیوە ژیاوم و هەندیك جار بەدەستی خۆم خواردنم بۆ دروست کردوون، لەهەمان کات دکتۆری بەتالیۆنەکەو هی ناوچەکەشم.

لەو شەش مانگەی گەراینەوە ناوچەکە ۷۰ چالاکیمان کردوە، یەك زامدارمان بووە! دەیەها نووسراوی سوپاسمان بۆ هاتووە. لەمانە ۳۰ یان هی مەکتەبی تەنفیزی بووە، دانیشتوانی ناوچەکە کەدەمانبینن دەگەریینەوە بەتیکرایی دیـن بەپیرمانەوەو بەخۆشەویستی و ریزلینانی پیشمەرگەوە پیشوازیمان دەکەن، کەپیشتر هەرگیز ئەمە نەکراوە. چالاکییەکانمان دەنگی داوەتەوە، بەتایبەتی لەسنووری کوردستان وە لیرەوە گەیشتووە بەخاکی عەرەب.

دوژمن تووشی سەرسامی بووە بەتایبەتی لەم ناوچەیە، تاقە کەسیك نییە دەنگوباسمان بباتەوە بۆ ریژیمی عەبدولسەلام عارف بۆ نموونەیە رۆژیکیان رژیم کادریکی پارتی لەریکخراوی کفری ناردبوو بۆ لای بەندەی بچوکتان، تا بزانن ژمارەمان چەندە وەجۆری چەکمان چییە. هەر بۆیە لەنیوان خۆماندا کۆبوینەوەو بۆمان دەرکەوت کەهیچ دەنگوباسیکیان نییە دەربارەی ئیمە، رەنگە دوژمن تەنها ۳٪ی هەوالی ئیمە بزانن.

لەو ماوەیەدا لەریگای ریکخراوو دلسۆزو نیشتمانپەروەرانەوە بەتایبەتی لەهیزی قەرەداغ، ئاگادار کراینەوە کە ۱۰۰٪ دوژمن

نیازی هێرشێکی گەورەو فراوانی هەیە بۆ سەر بەتالیۆنی ٩ و بەتالیۆنی ٥. لەتوزخورماتو فرقەی دووو لە قەڵاوو کفری فرقەی شەش نیازیانە ناوچەکە بەتەواوی لەپێشمەرگە پاك بەکەنەوە. ئینجا تاڵانو ئازارو ئەشکەنجەو گرتنی هاووڵاتیان دەست پێ دەکەن. بۆیە بەهەموو برادەرانم راگەیاند کەحەز دەکەم ئێوە بریارێك بدەن، بەندەش جێبەجێی دەکا، چونکە دوو رێگامان لەبەرە: راکەینو ئینسحاب بکەینو ناوچەکە بەجێبهێلینو تەسلیم بەدوژمنی بکەینو روو بکەینە بەمۆ، یان قەرەداغ. یا پارێزگاری ناوچەکە بکەین بەشەرو رووبەرووی دوژمن راوەستین، من خەلکی ئێرە نییم، بەڵام ئێوە ئێستا ئامادەی ئەو کۆبوونەوەیە ژمارەتان ٤٥٠ پێشمەرگە. لە٩٠٪ خەلکی ناوچەکەن.

هەروەها من بۆ ماوەی دوو سەعات ئێوە بەجێ ئەهێلم هەتاکو بریارێك ئەدەن، هەردوو بریارەکە خەتەر ناکە، بریاری چۆلکردن راکردنی تێدایە، جارێکیتر جەماوەر باوەری بەپێشمەرگە نامێنێت، بریاری شەر ئێجگار خەتەرناکە چونکە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان چەکی ئێمەو چەکی رژێم، بەڵام ئێمە خاوەن هەقینو بەبیرو باوەرو ئیمانەوە دەجەنگین، من بەبروسکەی نهێنی ئاگاداری کاك نوریم کردۆتەوە کەدوای ٦ رۆژ وەڵامت ئەدەمەوە چونکە کۆبوونەوەی لەسەر ئەکەین.

لەکاتێکدا ویستم بێمە دەرەوە تاکو بریار بدەن بەگشتی هەلسانوبەیەك دەنگ وتیان (یا کوردستان یا نەمان)، ئیتر بەشی زۆرمان لەخۆشیدا گریاین، من بەجۆرێك گریام وەکو منالی ساوا

ژێر نەدەبووەوە، لەخۆشی هەڵویستی ئەو فیداکارانەی کەگیانی خۆیان بەخت ئەکەن لەپیناوی رزگاریکردنی کوردستان. ئیمەش یەکسەر نەخشەمان کیشا بەم شیوەیە کارو باری خۆمان دابەش کرد پیش ئەوەی دوژمن هیرش بینیتە سەرمان.

لەبەر رۆشنایی بریارو نەخشەکانی کۆبوونەوەکە پەیوەندیمان بەدانیشتوانی ناوچەکە کردو بەتیکرایی ئاگادارمانکردن، ناوچەکە ١٠٠٪ بەدڵو بەگیان لەگەڵ ئیمەن و، پیمان راگەیاندن کەسوپای دکتاتۆر عەبدولسەلام عارفی دوژمن بەهەموو هیزیکەوە هیرشمان دینیتە سەر، ئیمە بەهیچ جۆریك ناوچەکە چۆڵ ناکەین، ئەمە بریاری ئیمەیە ئەگەر هەر هەمووشمان شەهید بکریین رووبەری دوژمن رادەوەستین شەری جەبهەیی لەگەڵ دەکەین، رەنگە وردە وردە بکشیینەوە، بەلام بەشەر نەك هەلاتن، شەری پارتیزانی ئەکەین، بەلام بەپیی بەرژەوەندی تایبەتی خۆتان هەلویست وەربگرن. چۆن بۆ ئیوە باشە ئیمە رازین، روو دەکەنە هەر ناوچەیەك، وا باشە لەئیستاوە خاوەن ئاژەلەکان ئاگادار بکەنەوە بەپەلە بەرەو بناری قەرەداغ برۆن و دورکەونەوە، هەرچەندە ئاگاداری مال و منال و شتومەکەکانتان بن کەمە.

دوای ئەمە چەند گوندیکیان دەست نیشان کرد تا خانویەك بکەنە مخزن نان و ئاو یانی تێ بهاون، بۆ مەخزەنەکان پیشمەرگەو هاولاتییەکمان بۆ دانا. پیشمەرگە بەم جۆرە دابەش کرا١٥٠کەس شەری جەبهە بکاو٢٠کەسیش بریندارەکان

بپارێزن، ٥ کەسیش بۆ کاروباری ناوخۆو بیتەل لەگەڵ ١٠ تەتەر پۆستەچی.

شوێنێکمان دانا بۆ نەخۆشخانە جێگای ٤٠کەس دەبوو، ئەم شوێنە دوو برینپێچ و هەندێك دەرمانی لێ بوو، هەموو شتمان بۆ ئامادەکردن، بەم جۆرە خواردنیان بدرێتێ بەیانیان ماست و هێلکە، نیوەڕۆیان برنج و شلەو گۆشتی مریشك و ئێواران شۆربا.

هەر یەکێکمان کوژرایین یەکسەر لەشوێنی خۆی تەرمەکەی بنێژن، زامدار ئەگواسترێتەوە بۆ نەخۆشخانە، بەهیچ جۆرێك ڕێگای ئەوە نادەین کەس خۆی بەدەستەوە بدات، پاشان بەئاشکرا بۆ هەموو پێشمەرگەکان ڕوون کردەوە کەسەروەت و سامانمان چەندە؟ پێم وتن بری ٧هەزار فیشەکمان پاشەکەوت هەیە، لەبەر بێ فیشەکی تەقەکردن قەدەغەیە، کەی دوژمن هێرشی هێنا بۆ سەرمان هەتاکو نزیك نەبێتەوە دەست بەپەلەپیتکەی تفەنگەکانتاندا نانێن، کەی هێرش بۆ سەر ناوچەکە هات یەکسەر بارەگای بەتالیۆن ئەگوازینەوە بۆ گوندێك لەپشتی ئاوایی ڕۆستەم ئاغای زەنگەنەو، هەموو شەوێك کۆبوونەوەی خۆمان ئەکەین، چونکە هاتوچۆکردن بەڕۆژ قەدەغەیە، بەڵام لەکاتی پێویستدا بۆ گواستنەوەی زامدار ڕەوایە، دوای ڕاگەیاندنی ئەم بڕیارانە هەر هەموومان دابەش بووین و گەراینەوە شوێنی دیاریکراوی خۆمان بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئەو نەخشانەی دامان ڕشتبوو.

مالئاوییمان لەیەکتر کردو گەردنی یەکترمان ئازاد کردو رووومان کردە قاپی خودای مەزن بەو هیوایەی سەرکەوتوو ببین. ئینشاللا دەستمان گرت بەو فەرموودەیەی دەلێ (*من لم يدافع عن دينه وعرضه فهو ليس منا*). بۆیە بریارماندا داروبەردی کوردستان لەدوژمن بکەین بەئاگر، لەماوەی دە رۆژ هەموو ئەو بریارو نەخشانەی کیشابوومان بەتیکرایی لە٩٩٪ هەر هەمووی جیبەجی بوو، لەچاوەروانی دوژمندا دەست لەسەر چەك وەستابووین.

دەنگ‌وباسی دوژمن کەنیازی هیرشی هەبوو بۆ سەرمان رۆژانە چ بەنامە یا لەریگای خەلکی نیشتمانپەروەرەوە ئاگادار دەکراینەوە، منیش بەبروسکەو نامە ئاگاداری هیزو مەکتەبی تەنفیزیو بارەگای بارزانیم کرد کە لەهەموو رویەکەوە ئامادەییمان تیدا هەیە. دانشتوانی ناوچەکە ١٠٠٪ لەگەل شۆرش بەتیکرایی و، خەریکی خۆ ئامادەکردنبوون بۆ هیرشی دوژمن. خەلکەکە ئەوندە فیداکاری ئەم خاکە بوو بەرادەیەك یەك خیزان رووی نەکردە ژیر دەسەلاتی رژیمی عەبدولسەلام عارف، بەرو مالاتیان گواستەوە بۆ بناری شاخی قەرەداغ، بەبارزانیم راگەیاند کەئیمە: تەنها پیویستمان بەفیشەك هەیە، تکایە بەپەلە یارمەتیمان بدەن. لەبارەگای هیز ئاگاداریان کردم کەعەقید نوریو محەمەد ئەمین بەگ پشدەری لیپرسراوی دارایی شۆرش چوو بوو بۆ سەردانی کاك حمید بەرواری، دوای چاوپیکەوتنیان بەرەو ئیوە ئەکەونە ریگا، لەفلان گوندو چاوەروانتانن، منیش بەپیریانەوە چووم بەلام لەریگا تەگەرەیەکم هاتە ری، لەگوندیکی

جاف جوتیاریك جوتی دەكرد هاتە سەر ریگام و بەشێوەیەكی زۆر ناشرین كەوتە گفتوگۆكردن لەگەلمدا، منیش زللەیەكم لی دا، ئینجا ریگام گرتە بەرو دوای دوو سەعات رۆیشتن بەخۆمدا چوومەوە زانیم اشتباهم كرد، گەرامەوە گوندەكە رووم كردە مالی جوتیارەكە دیتم مالكەی بار دەكات بەرەو ناحیەی سەرقەلا، داوای لیبردنم لی كرد وەدەستەكانم ماچ كرد، ئەویش وتی:-بەمەرجێك بەیەكەوە نانیك بخوین،دوای نان خواردن كەهەلسام برۆم ئەویش كەوتە دوام، بۆ ماوەی ٢٠ دەقیقە داوام لیكرد بگەریتەوە رازی نەبوو بووبە پیشمەرگە!. گەیشتمە ناوچەی زەنگنە لەگوندیك بەخزمەتیان گەیشتم بەگەرمەوە بەخیر هاتنم كردن خۆش حالی خۆم پیشاندا بەهاتنیان بەناوی بەتالیۆنی٩ی هیزی قەرەداغ.

بەلام كاك نوری وەلامی دامەوە زۆر تووڕەو گرژ بوو، ئەلەرزی وتی: من ئامر هیزی قەرەداغم وە لیپرسراوی ناوچەكەم بەفەرمانی بارزانی داوام لەپیشمەرگە حەسەن زەنگەنە كردوە لەگەل ئیمە بیتە بارەگاكەتان زۆر بەناشرینی وەلامی داومەتەوە بەقسەی منی نەكرد بۆیە داوام لیكردوە چەك بیت.

وتم: كوانێ پیشمەرگە حەسەن زەنگەنە، كەهات دوام لی كرد چەكەكەی دانێ و پیم وت تۆ لەئیستاوە دەست بەسەری، برۆز بیبەنە بارەگای بەتالیۆن و زیندانی بكەن.

لەدوایدا بۆم دەركەوت پیشمەرگە حەسەن زەنگەنە سەردەستەیەو هاتۆتە ناوچەكە لەگەل پیشمەرگە بچیتە شوینی دیاریكراو بەپێی نەخشە كە، بۆ ئەوەی چاوەروانی هیرشی

دوژمن بکات و، کاك نوری داوای لێکردبوو کەبەیاوەری لەگەڵی دا بێت، پێشمەرگەکەش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت ڕێگا کراوە بەتەنها بەرێگادا بڕۆین، دلنیابە سەلامەت ئەبیت، ئەویش ئەڵیت دەبێ چەك بێ، ئەویش وەڵامی ئەداتەوەو دەڵێ جارێ شەرمان لەرێگادایە ئەگەر ئامادەی جێی من بگریتەوە من ڕازیم، پێشمەرگە بەرەنگاری دوژمن ڕاوەستاوە تۆش دونیایەك دوریت بەشەرو هێشتا دە ترسیت.

حەسەن زەنگەنە لەبارەگای بەتالیۆن لەبەندیخانە دەبیت کەگوێی لەدەنگی تۆپ دەبێت، نامەیەك بۆ من ئەنووسیت:—

دکتۆر رەفیق من وا بەبێ چەك چوومە لای برا پێشمەرگەکانم کامیان شەهید کران چەکەکەی ئەو هەڵدەگرمو ئەچمە شوێنی، ئەگەر پێشمەرگە زامدار بوو خۆم لەکۆڵی ئەکەم تاکو بەزووترین کات بگاتە نەخۆشخانە.

پاشان بەبروسکە ئاگاداری ئامرهێزی قەرەداغ کاك نوریم کردو تیر تیر گریامو پیم گوت، پێشمەرگە حەسەن زەنگەنە بەبێ چەك چووە بۆ جبهە، گولەتۆپێکی پێکەوتو هەردوو قاچی پەری، دواجار شەهید بوو ! دوای ئەمە لەخزمەت کاك نوری و کاك حمە ئەمین بەگ کەوتینە ڕێگا بەرەو بارەگای بەتالیۆنی ٩ کە لەسەر ئاوە سپی بوو، لێپرسراوی ئازووقە کاك فائق خانەقینی بەجۆرێك پێشوازی لێکردن سەریان سوورما بوو کەبەم جۆرەو بەم شێوەیە ڕێکو پێکن، وتم لەسەعات و ڕۆژەدایە شەر دەست پێ بکات، ئەگینا بەگشتی ٠ پێشمەرگە لەخزمەتتاندا دەبوون.

بەدوورودرێژ ی بۆم باسکردن کەچۆن نەخشەیەکی ریکوپیکمان داناوه رووبەرووی دوژمن بجەنگین، بەهیچ جۆریك مە ترسنیتان نەبیت ئینشائەللا باسی سەرکەوتنمان لەسەرانسەری کوردستان بلاو دەبیتەوه.

گرفتی گەورەم لەگەل شەهید کاك حەسەن زدنگەنە و کاك حەمەئەمین بەگ پشدەری بوو کەکاك نوری پال پشتی ئەوی دەگرت.

جەنابی حمه ئەمین بەگ لەو کاتەدا پیی گوت بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خودی خۆت ئەو پیشمەرگانە گومانمان لییان هەیەو کادری ناسراون‌و سەر بەجەماعەتی ئیبراهیمن دووریان خەرەوە با بچنەوه مالی خۆیان دانیشن‌و، لەهەمان کات ئەو پیشمەرگەی کە لەهیزی خەبات رایان کردووەو هاتونەتە ئیرە بەبەندکراوی رەوانەی هیزی خەباتیان بکەوه، ئەو کاتە خودی بارزانی وه کاك عبدالوهاب ئەتروشی‌و ئەندامانی مەکتەبی تەنفیزی ریزیکی تایبەتی بۆ تۆ دادەنین، بۆچی خۆت پیاو خراپ ئەکەی دوا رۆژی خۆت تاریك ئەکەی، ئەمە هەموو دەنگ‌وباسی تۆمان لایە، کاك نوری پالپشتتەو پاریزگاریت زۆر لی دەکات، کاك نوری لایەنگری قسەکانی دەکردم بەلام لەسەر خۆ وتم: لەسەعاتی یەکەم کەکەوتینە ریگا بەریزتان ئەم نەخشەیەم بۆ ئەکیشیت، من باسی ئەمەت بۆ ئەکەم کەخۆمان ئامادەکردووە روو بەرووی دوژمن چۆك دانەنیین‌و راوەستین‌و خۆمان بەخت کەین، تۆش دەگەرییتەوه سەر هەمان باسی جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدو سالانی پیشوو.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن ئیمڕۆ ڕۆژی سێیەمە وا لەسعات چواری بەیانییەوە دەنگی تۆپ هات، ئەمە مانای ئەوەیە هێرشی سوپای دوژمن دەستی پێکرد، جەنابی حەمە ئەمین بەگ من ڕابەری ئاسایش نیم، لێپرسراوی پۆلیسیش نیم، من پێشمەرگەم، چەکم هەڵگرتووەو ڕاوەستاوم بەرامبەر بەدوژمن، توانیوومە ئەو ڕایانەی وا لەگەڵیان ئەژیم ماوەی نزیکە حەوت مانگە یەك بۆچوون و بیروباوەڕمان هەیە ئەویش شەڕی دوژمن بکەین، جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد لەناو ئێمەدا نییە، بەڵام لێپرسراوی بیتەڵ و ئەو ئەفسەرەی لێپرسراوی جفرە بوون لەگەڵ پێشمەرگە ڕێك کەوتوون لەنێوان خۆیاندا ئاژاوە دروست کەن و من دوور خەنەوە، من ئەمە باش دەزانم ڕێزیان زۆر لێ دەگرم وە تەنها لای تۆ ئەمەم باس کرد.

ئەو پێشمەرگانەی دوای دووبەرەکیەکە چووبوونەوە ناو ماڵ و منالی خۆیان لەسەر نامەی من هاتنەوە و ئەو پێشمەرگانەی لەهێزی خەبات بوون ڕایان کردووە هاتوونەتە ئێرە، ئەمانە هەر هەموویان ژمارەیان نزیکەی بیست پێشمەرگە ئەبوو، بەهۆی چالاکی و فیداکاریان دانرابوون بۆ شەڕی جەبهە، ئێستاکە لەخەتی پێشەوە ئەجەنگن، کەی هێرشی دوژمنمان لەسەر نەما شەر تەواو بوو، ئەگەر کوژران ئەوە لێرە تەسلیم بەخاکیان ئەکەین، ئەگەر بەزیندوویی گەڕانەوە لەپاداشتی فیداکاریەکەیان چەکیان ئەکەین و بەندیان ئەکەین ئەیان نێرینەوە بۆ هێزی قەرەداغ!

هەرچەندە یەکترمان باش ئەناسی ریزم هەبوو بۆی و نیوانمان زۆر خۆش بوو من زۆرم وت لەم بابەتەوە، بەڵام هەموو قسەکانی من بەبارۆیشت و بێ سوود بوو، لای ئەو گرنگ ئەوەبوو کەس ناوی باڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد نەهێنێ، دوژمن زاڵ دەبیت، یا پیشمەرگە ناوچەکە چۆڵ دەکات ئەمانە هیچی گرنگ نییە، بەڵام راستی دەکرد من چاوم ئەنوقاندو گوێچکەم لۆکەم تیخستبوو بەئاشکرا.

کادریکی باڵی مەکتەبی سیاسی کاک فایەق کەلاری ناسراو بەفایەقە کویر ئەهاتە ناو بەتالیۆن تەنزیمی پیشمەرگەکانی دەکرد هی باڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدو هەروەها لیپرسراوی بیتەل و برایەکی تریش تەنزیمی پیشمەرگەیان دەکرد ئەیوت تەنها مەلا مستەفا کورد رزگار دەکات، بەڵام هەرچی من بووم هەموو برا پیشمەرگەکانم بەیەك چاو تەماشام دەکردن کەچۆن روو بەرووی دوژمن راوەستین.

ووتم:- جەنابی حەمە ئەمین بەگ و کاک نوری وا لەمانگی هەشتی سالی ١٩٦٥ سوپای دوژمن هیرشی هینایە سەرمان دەنگی فرۆکەش هات، هەرچی سەعاتیك زووترە ئیرە بەجێ بهیلین بەرەو هەلشۆ تەشریفتان بروات بەسەلامەتی ئەگەن ئینشائەللاو من لیرە چاوەریکی چەك و تەقەمەنی دەکەم کە بۆم بنیرن. منیش رووم کردە برا پیشمەرگەکانم و بارەگای پیشمەرگەمان گواستەوە بۆ جێی دیاریکراو.

یەکەم رۆژ کەشەر دەستی پیکرد پیشمەرگەی ناسراو خەلکی شارۆچکەی کفری کاک ئەحمەدی حاجی سەمین شەهید بوو،

پاش ئەوەی روو بەرووی دوژمن پێی گیردەکاو هەرچەندە سەرلقەکەی عەریف کازم پێی ئەلیت با ئینسیحاب بکەین هەلناستیت، فیداکاری و ئازایەتی و چالاکی ئەم کەلەپیاوە لەمیشکم دەرناچیت.

دوای چوار رۆژی شەر، لەگەڵ کاك حەمید بەرواری لەگوندیکی چۆلی زەنگەنە لەژووریکی بەتالدا بەتەپالەو ریخی مانگا ئاگریکمان کردبۆوەو نان و چایکمان خوارد.

لەژیر دەنگی تۆپ و رەشاش و تەقەی تفەنگ دوای لیکۆلینەوەو شیکردنەوەی بارودۆخی ئیستاکە لەبەر بەرژەوەندی گشتی هەتاکو بتوانین چالاکی بنوینین بەرامبەر سوپای دوژمنی دکتاتۆر عەبدولسەلام عارف راوەستین، ئەم بریارەمان دا، بەبروسکە ئاگاداری هیزمان بەم شیوەیە کرد..

لەئامر بەتالیۆنی – ٥- حەمید بەرواری‌ەو لەئامر بەتالیۆنی ٩ رەفیق پشدەریەوە بۆ ئامر هیزی قەرەداغ عەقید نوری مەلا مەعروف.

لەم سەعاتەوە بووین بەیەك هیزو پیکەوە دەجەنگین روو بەرووی سوپای دوژمن فرقەی شەش و فرقەی دوو چاوەروانی جێ دەستمان بن چونکە هەرگیز ناوچەکە چۆل ناکەین.

*تیبینی/*

من ئەم پێشنیازەم کرد بەو نیازەی بەهۆی حەمید بەرواری بەپەلە پارەتی و فیشەکمان بدەنێ، بەڵام ئەویشم بەخۆمەوە سوتاند، چونکە حەمیدبەرواری کوری بنەماڵە بوو، بەڵام ئیستاکە برازای مەسعودەو برای نێچیرڤانە، بەتایبەتی دوای ئەوەی کەتەقەیان لێ کرد لەجیاتی ئیدریس، شاهد عەیان زۆریان ماون چ لەخەڵکی ناوچەکەو پێشمەرگە. لەوانە دوو سەرلق کەناویان عەزەی حەواو عەزیزی حەمە خەنانە.

٢- چەند جارێك ئەمە روویدا کەسەربازەکان ئەگەڕێن بەشوێن پاتاڵ لەگوندە چۆڵەکان و لەماڵان دەگەڕێن، دەبینن خانوویەك پڕە لەنانە رەق و دۆینەی وشك کراو، سەربازەکان دۆینەکە دەبەن بۆ ئەفسەرێك ئەویش روو دەکاتە سەربازێکی کورد وپرسیاری لێ دەکات ئەوە چییەو چۆن ئەخورێت ئەوانیش دۆینەکە دەخەنە ناو ئاوی ساردو شلی ئەکەنەوە، ئەفسەرەکە ئەیەوێت کەوچکێك بخوات بەڵام دای ئەنێتەوە، ئەفسەرەکە ئەڵێت:- تۆپ و فرۆکەو تانکیان نییەو ئەمە خواردنەکەیانە، ئینجا بەرامبەرمان راوەستاون!

٣- هەڵویستی عەشیرەتی جاف:- مستەفا بەگی جاف* داوای کردبووم لەشوێنی دیاریکراو بەپەلە بگەمە لای. کە چوومە

* مستەفا بەگی جاف: یەکێکە لەسەردارەکانی عەشرەتی جاف، کەسایەتیەکی پایەدارو سیاسەتمەداری نیشتمانییە، رادەبەدەر زیرەك، ئازا، رووخۆش و نانبدە. بەشداری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی کردووەو رچەی باوکی کەریم بەگی جافی گرت کەئەویش شانبەشانی شیخ

خزمەتیان ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ناوچەکە لەپیاوە ناسراوەکانی تیرەکانی جاف لەوێ بوون، بەشی زۆریان کەکویخان ئەمناسین، لەسەرو هەموویانەوە جەنابی مستەفا بەگی جاف ئەو پیاوە مەزن و گفتوگۆ خۆشە فەرمووی: کە دەنگی فرۆکەو تۆپ دیت ئینجا گوێم لەگولەی فیشەکی پیشمەرگە دەبیت بەدەنگیکی بەرز هاوار ئەکەم قەزات لەگیانم برای پیشمەرگەی قارەمان، کاکە، وا خۆمان هاتووینە ریزی پیشمەرگە ئەچینە جەبهە تاکو لەمەودوا خەلکیش وا بەمن و جەماعەتەکەم بلێ. ماوەی پینج رۆژە تاکو خۆمان کۆکردۆتەوە ژمارەمان ٣٨٠ چەکدارین ئیمە عەشایەری قورسین بەهاسان هەلناستین، لەهەر جەبهەیەك دامان ئەنین ئامادەین.

ووتم:- شەوی رابردوو ئاگریك رووناکیەکەی زۆر بەرز بوو، بەهەلە وا تیگەیشتم کە لەدوژمن نزیك بوومەوە، بینیم سێ خوشکی گەنج نانیان دەکرد، پرسیارم لیکردن ئەم هەموو نانەتان بۆ چییە؟ وتیان: ئیمە نا ترسین بەم جۆرە نزیك بووینەتەوە لەسوپای دوژمن. ئەم نانەمان بۆ برا پیشمەرگەکانە خۆ ئیمە لەدکتۆر رەفیق زیاترنین.

ئاو لەچاوم هاتە خوارێ شەرمم کرد بلیم من هەوم. ئینجا بە مستەفا بەگم وت: هەزار جار سوپاسی یەزدانی مەزن و ئیوەی عەشیرەتی جاف و رۆلەکانی خوالیخۆشبوو کەریم بەگی جاف،

---

مەحموودی حەفید لەشۆرشەکانیدا بەشداری کردووە. مستەفا بەگ چوار زمانی دەزانی ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی و تورکی.

کەبەم جۆرە یارمەتیمان ئەدەن، ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئەم سەرکەوتنەمان نەدەبوو، بەهۆی ئێوەیە پشتمان قایمە، شەرەکەتان کردووەتە هی خۆتان بەلاّم بەناوی پێشمەرگە تەواو بووە. ئێمە موشکلەمان تەنها فیشەکە ئیستاکە زیاد لە٣٠٠ پێشمەرگە لەجەبهەیە رووبەرووی دوژمن راوەستاوین هەر یەکەیان بیست تاکو ٣٠ فیشەکی پێیە، ئێوە نزیکەی ٤٠٠ کەس ئەبن، وا جەمەدانەکەم وەکو سوالکەری بەر دەرکی مزگەوت رادەخەم ئێوەش دەستی یارمەتیم بۆ درێژکەن.

نزیکەی حەوت هەزار فیشەکیان داینێ.

جێی باسە شیوعیەکان شان بەشانی ئێمە راوەستان بەسەرۆکایەتی کاک عەتا تالەبانی بەشدار بوون لەرووبەرووبوونەوە دژی سوپای دکتاتۆری عەبدالسلام عارف.

لەکاتی کۆبوونەوەمان لەبارەگای بەتالیۆن ئاگاداریان کردین کەکاک عەتا تالەبانی بەخۆیو هێزیکەوە تەشریفی هاتووە، ئێمەش بەتیکرای بەپیریەوە چووین خۆشحالی خۆمان دەربری.

ئەویش یەك سەر بەشدار بوو لەکۆبوونەوەکە لەگەلماندا، داوام لەسەرلق کاك کامل مەلا وەیسی زەنگەنە کرد کەمۆلگەی سوپای فرقەی دوومان بۆ دیاری کەن، ئەویش بەدووردرێژی هەموو شوینەکانی سوپای دوژمنی خستە بەرچاومانو، پێی وتین کە لەم دوو رۆژەی پێشوو ئەوجێك بەجۆرێك نزیك بووەتەوە تەقەی دۆشکەکانیان ئەگاتە دیی رۆستم ئاغا ئەم فەوجە نیازی پەرینەوەی هەیە بۆ ئەوبەری ئاوەسپی تا بگاتە ناوچەی جاف.

هەروەکو وتم سوپای نیزامی روو لەهەر شوێنێك بکات ئەتوانیت زاڵ بێت، بۆیە تەنها دوو رێگا هەیە لەبەرامبەریدا، یان بۆی چۆڵ کەین و راکەین یان رووبەرووی راوەستین، جا بەشەری پارتیزانی یا شەری جەبهە، ئیمە دوو رۆژە لەبەر بێ فیشەکی ناتوانین شەری پارتیزانیشی لەگەڵ بکەین، بەڵام ئیستاکە بەم شێوەیە ئەم نەخشەمان داناوە ئینشاالله سەرکەوتوو دەبین.

کیشەی فیشەکمان جیبەجی بوو مستەفا بەگی جاف لەگەڵ کوێخاکان و پیاوە ناسراوەکانی تیرەکانی جاف هاتبوونە لامان زیاد لەحەوت هەزار فیشەکیان بۆ هینایین وە رۆستەم ئاغا* ش دوو هەزار فیشەکی بۆ ناردبووین، بۆیە ئیمە خۆمان ریك کەوتین بەم جۆرەی خوارەوە پەلاماری دوژمن بدەین، لەسەعات سێی ئەم شەوە چوار سەر لق هەریەکەی ژمارەی ١٥ پێشمەرگە لەگەڵ دەبیت، کاك حەسەن خەلیفە مالك و کاك کامل مەلا وەیسی و عەزەی حەواو، عەزەی حەمە خەنان، و کاك حسەین حاجی محیەدین کەیاریدەدەری ئامر بەتالیۆنە ٤٠ پێشمەرگەی لەگەڵ دەبیت لەپشتی ئەم چوار سەرلقانە دەبیت، لەکاتی شکانیان، خۆشم لەگەڵ کاك حەسەن خەلیفە مالك بەشدار بووم.

* رۆستەم ئاغا: سەرداریکی ناسراوی عەشرەتی زەنگەنەیە، نشتمانپەروەریکی دلسۆزە، قوربانی زۆری لەپیناوی خاکی کوردستان بەخشیوە. مرۆڤیکی نانبدەو چاونە ترس، بەدرێژایی ژیانی پشتیوانی هیزی پیشمەرگە بووە.

بە کاك عەتا تالەبانیم وت ئەمە شەری جەبهەیە، منیش هەر شوێنێکم بۆ دادەنێن ئامادەگیریم تێدایە شان بەشانی ئەو برا پێشمەرگانە هێرش ببەمە سەر دوژمن.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن لەم هێرشە دوژمن ١١ رەبایەیان چۆڵ کردو ئیمە یەك زامدارمان نەبوو، زیانمان نەبوو، بری ٢٣٠٠ فیشەکمان بەدوژمنەوەنا.

شیوعیەکان: هێزێکی چەکداریان هەبوو بارەگای تایبەتی خۆیان هەبوو سەربەخۆ بوون، بەلام لەسنووری بەتالیۆنی ٩ بوون زۆر ریك وپێك بوون لەهەموو رووییەکەوە، پەیوەندیمان ئێجگار زۆر بەهێز بوو، مامۆستای بەریز مەلا ئەحمەد بانیخیلانی سەرپەرشتی ئیدارەی دەکردن. کاك عەتا تالەبانی لەکۆتایی شەرەکە لەگەل هێزەکەی کەبریتی بوو لە٥٠ پێشمەرگە گەرانەوە، بەگەرمییەوە لەخزمەتیان ماوەیەك رۆیشتن سوپاسمانکردن دەربارەی هەلویستیان.

سوپای دوژمن روویان کردە ناوچەکە بەنیازی ئەوەی دەست بەسەر خاکمان دابگریت و پاکسازی پێشمەرگە بکەن، بەلام دانیشتوانی ناوچەکە بەتیکرایی زەنگەنەو جاف ١٠٠٪ بوونە کۆسپ لەبەردەم ئەو سیاسەتانەی دوژمن و رۆلەکانی کەریم بەگی جاف شەری ئاوباریکیان تازە کردەوە، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن دوای ١٥ رۆژ جەنگ سوپای دوژمن بەناچاری کشایەوە، زیانی ئیمە تەنها برینداربوونی ١٩ پێشمەرگە بوو کە یەکێکیان وەفاتی کرد، لەوانە پێنجیان هی بالی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد بوون، ١٣پێشمەرگەمان

شـەهید بـوون یـەکیکیان خوالیخۆشـبوو ئەحمـەد حـاجی حەمـە سەمین دانیشتووی کفری، ٣کەسیان هـی بـالی مەکتـەبی سیاسـی جەماعـەتی ئیـبراهیم ئەحمـەد بـوون، ژمـارەی ١٤ هـاووڵاتیش شـەهید بـوون، هەشـتیان هـی یـەك خانـەوادە بـوون کـەباوکیان بەتەنها رزگاری بوو لـەبۆردومانی فرۆکـە، هـەر هـەموویان شـەهید بوون. بەڵام زیانی دوژمن لەفرقەی دووو شەش.

١- فرۆکەیەکی میگ کەوتە خوارێ و فرۆکەوانەکەی کوژرا.

٢- ژمارەی کوژراویان لەنیوان٤٢٠ - ٤٥٠ سەرباز بوو.

٣- زیاد لە٧٠٠ زامداریان لەسەرباز هەبوو.

٤- چەند ئوتومبیلیکیان تیك و پیك شکان.

دوای تەواوبوونی شەر گرفتـی ئازوقـەمان بـەهۆی دانیشـتوانی ناوچەکە نەما، یەك هاووڵاتی یا پیشـمەرگە رووی لـەمیری نـەکرد، هەرچی کیشە بیت تووشمان نەبوو، تەنـها لیپرسـراوی لاسلکی و ئەفسـەرەکەی لەلیپرسـراوی جفـرە کیشـەی شـەخس زۆریـان بـۆ دروست کردم، خۆیی گەیاندە لای بارزانیو لـەلای چەندین درۆی بۆ هەلبەستبوم کەگوایەمن جەلالیم.

سـەردانی مالـە شـەهیدەکانمان کـردو یەکـە بەیەکـە بەسەرمانکردنەوە، هەر مالەی بری ٣٠ دینارمـان دانـێ، سـەردانی گوندی بەکر بایفم کرد،کە دوو برای پیشـمەرگە شـەهید ببـوون بەشـداریان کردبوو لـەکۆماری مـهاباد، هـەموو بـەتیکرا دەسـتیان کرد بەگریان، تەماشای منیان کرد، کاك حسـەین حـاجی محیدیـن رووی کـردە مـن کـەمنیش بگریـم، کاغـەزیکم لـەگیرفان دەرهینـا داوام لیکـردن کـەفاتیحاش دادەن لەسـەر بـاوکم، بروسـکەکەم بـۆ

ـخوێندنەوە كە لەبەتاليۆنی حاجی قـەڵای كۆیيـەوە بـۆم هـاتبوو
ـيـنـرۆ ٧ رۆژە بـاوكم لـە١٩٦٢/٨/٢٧ وەفـاتـی كـردووە پاشـان
ـخێينی بەكاك حسەين حاجی محيدينم راگەياند كەمن بۆ باوكم
ـەگرييم گلەييم لی ناكريت.

سـەردانی پيـاوە ناسـراوەكانی زەنگەنـەو جـافم كـرد، يەكـەم كـەس چوومـە خزمـەتی مسـتەفا بـەگی جـاف لەچـەمی شـور ـوپاسـم كـردن و ئينجـا رووم كـردە هاوسـەرەكەی وتم برسـيمە، قبولييـەكی سووری بەگزادەم بۆ لی بنين، شـەوو رۆژيـك پشـووم ـا، مستەفا بەگ فەرمووی ئەم جارەش نەكوژرايت، خوا گەورەيە بۆ جاريكی كەش.

## بروسكەيەكی ئاشـكرا لەبـەتاليۆنی ٥و٩ بـۆ ئـامر هـيزی قەرەداغ بەبروسكەی ئاشكرا.

(بـەهيزيكی هاوبـەش روومـان كـردە نزيكـی شـاخی ئاشـداغ بۆسـەيەكمان دانـا دوو بـەدوو سەرپەرشـتيمان دەكـرد ٤٠٠ پيشـمەرگەم لەگـەڵ بـوو نزيكـەی ٣٠ سـەعات ماينـەوە، سـوپای دوژمن كشايەوە بەمل شكاوی ناوچەكەی بەجێ هيشت.

هـەزار جـار سـوپاس بـۆ يـەزدانی مـەزن كەبـەم جـۆرە سەركەوتنمان بەدەست هينا).

لـە ئامر هـيزی قـەرەداغ و مەكتـەبی تـەنفيزی چ بەبروسـكەو يـا نامـە بـەناوی دكتـۆر مـەحمود عـەلی عوسمـان و حـەبيب محەمـەد كەريم بەبۆنەی سەركەوتنمان پيرۆزباييان لی كردم.

هێزی قەرەداغ بەنامەو بروسکە ئاگاداریان کردم. بارزانی داوای کردوویت، دوای پرسیارو لێکۆڵینەوە لێپرسراوی بیتەلی پاراستن بوودو هەفتانە راپۆرتی لەسەر من رەوانەی مەکتەبی بارزانی کردووە کەمن لەهەموو دانیشتنێکم و کۆبوونەوەیەك وتاریکم دژی خودی بارزانی داوە.

دوای ٧ رۆژ کەشەر تەواو بوو ئینجا هەشت هەزار فیشەکم بۆ هات، ئینجا زانیم هۆی چییە بەم جۆرە بەربەرەکانیم دەکەن!

لەکاتی شەر رۆژی سێ جار داوای فیشەکم دەکرد، تەنیا ئەوەی یارمەتی داین کاکە حەمەی فرج بوو، کە لەگەڵ بەتالیۆنەکەی هات بەهاوارمانەوە، بەگەرمەوە بەخێرهاتنمانکردن خۆشحاڵ بوین بەهاتنیان، بەلام شەر تەواو ببوو، ئەمانە لەسەر بروسکەکەی بارزانی وایان زانیبوو مان ئەگرم و ناچمە خزمەتی، تەماشام کرد خەریکە کیشەم بۆ بیتە پێشێ، یەك سەر ریگام گرتە بەر، هەموو شتێکم تەسلیم بەیاریدەدەرەکەم کرد کاك حسەین حاجی محیدینو حسابیشم لەگەڵ عەقید نوری کرد.

کەوتمە ریگا بەرەو گوندی یەندزێ بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی. کاتێك گەیشتمە لای کاك حەمەی عەزیزو کاك نافز جەلال منیان بردە لای کاك حەبیب محەمەد کریمو د. مەحموود عەلی عوسمانو کاك موحسین دزەیی ئەوانیش بەپیرمەوە هاتنو بەجۆریك بەخێرهاتنیان کردم سەرم سورما، بەلام چونکە هیچیان بەدەست نەبوو، وتیان کاتێك بروسکەکانت ئەهات، یەکەم جار شکمان کرد، بەلام کەراپۆرتمان وەرگرت، بۆمان

ـدرکەوت کوژراوو زامداری سەربازەکان گەلیك لەوە زیاترە کە تۆ باست کردوە، بەراستی جێ دەستت دیاربوو لەسەر لەشکری دوژمن. منیش پرسیارم لێکردن: ئێوە گازندەتان چییە لەخودی من ؟ کاك د. محمود عەلی عوسمان وتی: ئێمە تۆمان کردە ئامر بەتالیۆن بەلاٌم رۆژێك لەرۆژان بەنامەیەك ئیمەت بەسەرنەکردەوە، پاشان ئایا راستە ئەلێن وتارت خوێندۆتەوە دژی خودی بارزانی؟ وتم: ئەمە دووەم جارە تووشی هەلە نەبم، یەکەم جار لەجیاتی ئەوەی رووبکەمە خزمەت مەلا مستەفا چوومە لای کاك حلمی عەلی شریف، دووەم جار کاك عەلی عەبدوللاٌو کاك نوری شاوەیس ئاگاداریان کردم کەجەنابی مەلا مستەفا داوات دەکات بەلاٌم بەقسەی ئیوەم کردو نەچوومە لای، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کە نەکوژرام.

خوێنەری بەریز چ راست یا درۆ وایان بۆ گیرامەوە کاتیك باسی سەرکەوتنەکانم کرابوو بارزانی وتبووی ئەم سەگبابە کەی ئەکوژرێت و رزگارمان دەبیت لەدەستی. لەکاتیکدا تاکە تاوانی من خزمەتکردنی گەلی کوردو بەرگریکردن بوو لەکوردستان. برادەرانی مەکتەبی سیاسی رایان وابوو کەنوسراویك ئاراستەی بارزانی بکەن دەربارەی من پاشان خۆم بچمە خزمەتی کاك موحسین دزەیی وتی: نازانین کەی دیتەوە رەنگە ئەم سەفەرە زۆری پێ بچیت، خۆت بچیتە خزمەتی باشترە چونکە ئەزانین دەمت بگاتێ قسەی لەگەلٌ بکەیت کۆتایی بەم گرژیە دینیت. دوو شەو لەخزمەتیان بووم. بەرەو پینجوین کەوتمە ریگا لەماوەت دوو شەو مامەوە مامۆستا عەلی حەمدی حەزی ئەکرد

کە لەخزمەتیدا چەند شەویك بەیەکەوە بین، لەئەنجامی ئەم میوانداریەی زۆر شتم بۆ روون بۆوە، عەلی حەمدی وتی: ئەمە شۆرشەو دەبیت خۆراگر بیت، با پیت بلیم تۆ تاوانباریت کەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدی، کە ئەچیتە خزمەت مەلا مستەفا ناتکوژیت، بەلام چەکت ئەکەن ئینجا رەوانەی بەندیخانەی ماوەت ئەکرییت. وەکو دەبینی ئیمە بەرۆژ هەموو لەدەرەوەین و بەشەویش کاتی نوستن ئەچینەوە ژوورەوە، ئەم بارودۆخەی ئیستا شتیکی سیاسییە لەم مانگە تەواو دەبیت.

ووتم: لەبەر ئەوەی حزبی نیم و جەماعەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد نیم هەرچەندە شانازی پیوە ئەکەم، ئامادەگیرم تیدا نیە چەك بکریم و بەند بکریم، ئەو چوار سەربازە عەرەبەی دوینی کەهەریەکە دوو دینارم دانی، ئەمانە دور لەکفری بەشەش سەعات بەپی چووین گرتمانن، ئیستا لەگەل ئەوان بخریمە بەندیخانە؟، باش بزانە من ئەمە هەرگیز پەسەند ناکەم و قەبولی ناکەم مەلا مستەفا لەبری ئەوەی زیاتر لەجاران ریزم لی بگریت و پاداشتم بداتەوە بمخاتە بەندیخانەوە، عەلی حەمدی نیم بەمە رازی بم، ئەچم خۆم تەسلیم بەعەبدولسەلام عارف ئەکەم لەو وەزعە باشترە، لەهەلساندا پیی وتم: برادەریکی دلسۆزمان هەیە لەم ناوچەیە بچۆ بۆ خزمەتی، ناوی شیخ رەزا شیخ تەهایە لەگوندی تەرەتوولو ئیمە ئاگاداری ئەکەینەوە یارمەتیت ئەداو ئیمە ئاگاداری ئەکەینەوە.

گەیشتمە خزمەت حەمە رەشیدخانی بانە دوو شەو لایان مامەوە، مەجیدخان فەرمووی سەرمان لیبدە، ئیمە لەگەل

ـەحموود بـەگی گۆڵـی قسـە دەکـەین کەیارمـەتیت بـدا.
نوسـراوەکەی مەکتـەبی سیاسـیم تەسـلیم کـرد، بـڕوا ناکـەم تەماشـای کردبیـت چونکـە بـەجۆرێك باسـیان کردبـوو کـەوا دەرکەوت مەلا مستەفا زیاتر رقی لیم پەیدا بوو، هەر بۆیە کاك عـەبدولوەهاب ئەتروشـی یەکسـەر داوای گرتنـی کردبـووم. ئـەو ماوەیـەی لـەگوندی گۆخـلان لـەمالی مـەلای گوندەکـە بـووم خزمـەتیکی زۆریـان کـردم تـا دەهـات زیـاتر خزمـەتیان دەکـردم. بەشـی زۆری رۆژەکـان ئەچومـە لای پاسـەوانەکانی مـەلا مسـتەفا ئەویش بەدووری ٥٠مەتر چاوە تیژەکانی ئەبریە من بـەلام بانگی نەکردم، هـاتوچۆی د. خـالد حمـە سـەعیدم زۆر دەکـرد، دووجـار سـەرم لەحەمـە رەشـیدخان داو، لـە شـیخ رەزاو کـاك سـابیر ئەحمەدی مینە رەنان رۆژیکیان فەرموت ٥ کلانشینکۆفم بدەیتـێ وا ئەکـەم بگەریتـەوە شـوینی خـۆت بـەئامر بـەتالیۆن، بەقسـەکەی پێکەنیم وتم: بەرتیلیش بدەم ئینجا بچم خۆم بەکوشت بدەم؟!

رۆژگار هـات و رۆیشت من هـەر لەو بارودۆخـەدا بووم، دنیام لێ تـاریك بـوو، خـەریك بـووم شـیت بم، دوای ١٦ رۆژ دوو بـارزانی هاتن خەبەریان کردمەوە کەبارزانی لەسەعات چواری بەیانیـەوە گوندی بەجی هیشتووە، داوایـان لێ کـردم منیـش بکەومـە ریگـا بـەرەو ئـەو شـوینەی بـارزانی رووی تیدەکـات کـەگوندی دارۆخـان بوو لە٢٠/١٢/١٩٦٥.

رۆژیك بەفر دەباری، ٢٠ سانتیمەتر باری بوو، لـەنزیك بارزانی بە١٠٠مـەتر ئەرۆیشتم سلاوم لێ کرد بەدەنگە بەرزەکـەی خـۆم، لامەکـەی ئـەوە بـوو جەمانـە سـوریك هـات، پاشـان بـوون بەسـێ

کەس یەکیکیان پاسەوانی تایبەتی خۆی بوو کە لەبەغدا لەگەلی بوو منی ئەناسی، لەریگا ئیشارەتی بۆ دام کەدوور نیە مردن چاوەروانت بکات.

کاتیك گەیشتینە مالی حەمە رەشیدخان وتم: جەنابی خان ئەم شەو لەمالی ئیوە دادگایی ئەکریم هەر چی خراپە رووبەروو پیم دەلین بۆشم نییە بەرگری لەخۆم بکەم، لامی بدەمەوە، ئەوجار چەکم ئەکەن و رەوانەی لای کاك عەبدول وەهاب ئەترویشیم ئەکەن، ئینجا ئەم کوژن، ئایا خان من تاوانبارم تاوام لی بکریّ؟ ئەمە بارودۆخە، تۆیش بویتە شاهیدی ناحەق، رۆژیك دیت ئەمە دەکریتە کتیب؟

خان وتی: – ئەمە موشکلەیە بۆ منیان دروست کرد، باش دەزانم ئەوە پیلانی چ مرۆڤیکە، سوکایەتیە بۆ خودی من رەفیق پشدەریی بکوژن بەناحەق لەبەرئەوەی شکاتت لەمەلا مستەفا کردوە لای شیخ ئەحمەد بارزانی بۆ بەئازایی خۆت بویتە ئامر بەتالیۆن و پیاوەتی کەس نییە. من لەراست خۆمەوە زۆر هەولم بۆ دایت بەلام سودی نەبوو، ناتوانم هیچت بۆ بکەم، چارت ئەوەیە بەسەعاتیك زووتر راکەیت، ناتوانم یارمەتیت بدەم قەرزاری دونیاو قیامەت ئەبم، رەفیق بەفر دەباریت کەس بەدەرەوە نییە هەتاکو زووتره هەلسە. خودا حافیزت بیت انشاالله بەسەلامەتی ئەگەیتە ناو مال‌و منالەکانت.

ووتم:– بارزانیەکان منیان تەسلیم بەئیوە کرد، بارزانی شەو ئەحوالم دەپرسیت ئایا بۆ بەریزتان زیانی نابیت.

خان فەرمووی: کاك رەفیق من لێپرسراوی بەندکردنی تۆ نیم، ئەم بارزانیانە نەیانوت ئەمە بەندە. بانگی بەختیاری مجیدخانی کردو پێی وت خواردنی بۆ بێنە تاوەکو بەسك بەتالی بەناو بەفردا نەروات. دوای ئەوەی نانم خوارد خودا حافیزم خواستو رێگام گرتە بەر، گەیشتمە بەر مالی شێخ رەزا شێخ تەهای چویسە لەگوندی تەرەتولو یەکسەر چوومە ژوری ژنان کەخواردنیان ئامادە دەکرد، داوای شێخم کرد، یەکسەر کورەکانی هاتن بەخێرهاتنیان کردم ئینجا جەنابی شێخ رەزا هات بەدووروودرێژ ی هەموو شتێکم بۆ باس باسکرد.

فەرمووی دانیشە ئیستاکە ٧٠ بارزانی میوانی منن دلت هیچ نەکات، تووشی نارەحەتی نابیت.

خواردنیکی خۆش و گەرمیان بۆ هینام، تیرم خواردو ترس لەلەشمدا نەما، دوای سەعات ٨ی شەو بەرییان کردم تاکو گەیشتینە گوندی کواواو دەرەگورگان، ئەوەی لەگەلم هات یەکسەر گەرایەوە، منیان لەژیر خان دانا، ژورەکە دوو مانگای لیبەسترابووەوە، بەلام زۆر پاك و خاوین بوو، بەیانیەکەی شۆرباو مریشکیان بۆ سور کردبومەوە، نیوەرۆکەی برنج و شلە، نانی ئیوارەم مریشکی سوورەوەکراو بوو، یاخوا مالی شیخ رەزا هەزار جار ئاوەدان بیت کە بی ئەوەی بیانناسم یارمەتییان دامو لەو کاتەوە تا ئیستا چاوم پییان نەکەوتووەتەوە، سوپاس بۆ خواو بۆ بنەمالەی چویسە.

ئیوارە سەعات چوار ئەندامیکی پاراستنی ناسراو هاتە ناو گوندو لەخەلکی گوندەکە پرسیاری کرد کەسی غەریب نەهاتۆتە

ئیرە من لەبەر ئەوەی لەپەنا خەلکیکی خاوەن بیروباوەڕ بووم وە باش ئاگاداری رووداوەکەی من بوون، بۆیە بەهیچ جۆریك هەرچی مە ترسی بیت نەم بوو.

شەوی پاشتر سەعات ٧ ریگامان گرتە بەر لەگەڵ هاوڵاتیەکی ئەوێ لەسەعات شەشی بەیانی گەیشتمە گوندی راوگان دیی شیخ لەتیفی حەفید لامان دا، من بەتەنها لەژووریك بووم دەرگاکەم لەسەر خۆم داخست، سەعات ٨,٣٠ لەژورەکە هاتمە دەرێ بانگی ئەو برا بەریزەم کرد کە لەگەلم هاتبوو وتم:- ئەو تفەنگە مالی خۆمە بۆ تۆ پیشکەشەو، بریك پارەم پییە بەشی ئەکەین، وا ریگا ئەگرم بەرەو پادگای سوپا دەڕۆم، دەرزی تفنگەکە دەردینم و لەسەر کانیەکە دای دەنیم، کەی گەیشتمە بارەگاکە تۆش دەرزی تفەنگەکە بەرەو مویارەکت بیت. وتی:- پارەم ناویت، لەمنیش دلنیابە چونکە بەلینم داوە بەشیخ رەزا بەسەلامەتی دەتگەیەنمە شوینی خۆت و، بری ٩٠ دینارت ئەدەمێ لەجیاتی تفەنگەکەت.

پارەم لی وەرنەگرت، خودا حافیزیم لی کرد، بەداخەوە ئەم هاوڵاتییە ئیستاو ئیستاش نەم نەدیتەوە، تاکو منیش لەخزمەتی دابم.

رووم کردە سەربازگەکە ٢٠مەترم مابوو بگەمە بەر دەرگا سەرەکییەکە سەربازیك هاواری کرد راوەستە هیچیتر نەیەیتە پیشەوە.

ووتم:- هاتووم خۆم تەسلیم کەم.

ووتی:- برۆ دوای یەك سەعاتی کەوەرەوە.

گەرام لەگیرفانم پارچە کاغەزیکم نەدۆزیەوە، چونکە دوو سەعات پیش ئیستاکە هەر چی نووسراویکم پێ بوو باش و خراپ، سپی و رەش هەموویانم خستە ناو سۆپای داری ماڵەکەو سوتاندم، ئینجا داوای پارچە کاغەزیکم لی کرد، ناوی خۆم بۆ نوسی رەفیق پشدەری، ئامر بەتالیۆنی ۹ هاتووم خۆم تەسلیم کەم.

دوای ٥ دەقیقە دوو سەرباز بەرەورووم هاتن بردیانم بۆ ژیر چادری ئامر فەوجەکە، کە لەگەڵ دوو ئەفسەر دانیشتبوون، دەستیان کرد بەپرسیار بۆ ماوەی یەك سەعات، پیشەکی جەنابی ئامر بەتالیۆن فەوج ئەم قسە نایابانەی لەگەڵدا کردم کەهەرگیز لەبیرم ناچیتەوە، وتی: تۆ چەتەی تاوانبارێت، رووبەرووی سوپای عیراقی راوەستاویت، ئیوە سەر بەئیران و ئینگلیزن، بەیارمەتی ئەوان ئەجەنگن، ژمارەتان ناگاتە ٥٠٠ چەتە، بارزانی تاوانبار ناتوانیت حکومەتی کوردی دابمەزرینی، ئەمە خەونە کورد حکومەتی هەبیت. دەتانەوێ عیراقی عەرەب بکەنە دوو بەش، باش بزانن ئەوەی لەئیمە ئەکوژریت شەهیدە، چونکە پاریزگاری نیشتمانەکەمان ئەکەین، تەماشای خۆت بکە بزانە لەمرۆڤ ئەکەی؟

من بەهیچ جۆریك وەڵامم نەدایەوە، کەزانی لەساغ ناکەمو ماندوومو چاوم هەڵنایەو ریش هاتوو جل و بەرگ و جامانەی سەرم قوراویە کۆتایی بەقسەکانی هینا ئەوجا منی بردە گەرماوی تایبەتی خۆی، خۆم شوشت جل و بەرگی تازەم لەبەرکردو ریشم تاشی بەدلەی سوپام لەبەر کرد، بردمیانە ژوری

دکتۆرو خەوتم. ئەمە بۆ من پشودانێکی باش بوو، دوای ئەوە هاتمەوە سەر خۆم هەستم کرد گیژم و میشکم شت وەرناگریت، چونکە لەبارودوخیکی تازەدا ئەژیم.

لەسالی ۱۹٥٦ ـەوە کەدەستم دایە سیاسەت خەلکم ناسی، لەسالی ۱۹٦۱ تاکو کۆتایی ۱۹٦٥ لەئازارو ئەشکەنجەدام جیگای خۆم کردبووەوە لەناو جەماوەر دلسۆزو خۆشەویست بووم، لەئازاکانی شۆرشی ئەیلول ناسرا بووم، دانیشتوانی ناوچەی بەمۆو بەشیکی گەرمیان سویندیان بەسەرم ئەخوارد، بەکوردیکی دلسۆزو نیشتمانپەروەر ناویان ئەهینام و ریزی تایبەتیم هەبووە، خۆم بەخۆم وت رەفیق ئیستاکە تۆ چیت؟ بەندە لەژیر چادریکی سەربازی دانیشتوەو رابردوم وەکو بەفری بەهاری بەر باران رەشی کردوە، لەمرۆڤیکی نیشتمانپەروەر شۆرشگیر هاتمە ریزی چلکاوخۆرەکانی میری، پاشەرۆژم چۆن دەبیت! ئایا کەسوکارم و برادەرەکانم چیم پێ ئەلین، خۆم داوەتە دەست ئاوەوە مەلەوانیش نازانم، بەهەر حال لەهەموو رویکەوە لەبارودۆخیکی تاریك ئەژیم، گیژم لەشیت ئەکەم. بارزانی و بنەمالەکەی سەریان لی شیواندم و تووشی ئەو بارودۆخە نەخوازراوەیان کردم، لەبەرخۆمەوە دەموت دەك مالتان ویران بێ وەکو چۆن مالی منتان ویران کرد. بەهەر حال لەهەموو رویەکەوە لەبارودۆخیکی تاریکدا دەژیام، کوردیش دەلێ ئەو نانە نانە ئیستا لەخوانە. لەو کاتەدا ئەوەندە دوودڵ و پەشیو بووم هەر لەشیت دەچووم. خۆشم نەمدەزانی چی دەکەم و چیم بەسەر دێ، هەموو ئەوە پاداشتی بارزانی بوو بۆمن بەرامبەر ئەو

شەرو راوەستانەی بەرامبەر رژیم نواندم. بەڵام راستە: *(لايصلح الناس لاسرات لهم ولا سرات اذا جهالهم سادوا)*. واتە خەڵك نابێ بەبێ سەر سەریش سەر نییە ئەگەر نەزانبێ.

بەیانیەکەی بەهەلیکۆپتەر منیان گواستەوە بۆ بارەگای فرقەی دوو لەکەرکوك، دە رۆژ مامەوە لەم چوار کەسە زیاتر کەسی کەم نەدەدیت، ئیبراهیم فەیسەل ئەنساری سەرکردەی فرقەی دوو، عقید روکن عەزیز توفیق، رائد محەمەد زهاد لیپرسراوی ئیستخباراتی فرقەی دوو، هەروەها نەقیب سالم حسەین یاریدەدەری لیپرسراوی ئیستخباراتی فرقەی دوو. ئەم چوار کەسە بەردەوام وتوویژیان لەگەلمدا هەبوو، کەوا لەخواردوە هەندێ لەشتە گرنگەکانی ئەو گفتوگۆیانە دەخەمە روو:

١-یەکەم پرسیاریان لەسەر خۆم بوو ناوم، مەوالیدم، شوینی لەدایکبوون و ژمارەی چەکدارەکانم و، جۆری چەکەکانمان.

٢-پرسیاری ئەوەیان لی کردم کەیارمەتیمان لەکوێوە بۆ دێ، چونکە بروایان نەدەکرد ئەو شەرە گەورانەی ئیمە بەتفەنگی برنەوی ئینگلیزی و هۆلەندی ئەنجام درابیت.

٣-بروایان نەدەکرد کە لەهیزی پیشمەرگە تەنها ئەوەندە بریندارو شەهیدەمان هەبووبیت کەپیم وتن. بۆیە دەیانوت ئیوە زیاتر لە١٩٠ کوژراوو ٤٠٠ بریندارتان هەیە.

٤-باوەریان نەدەکرد کەئیمە پەلاماری دەربەندیخان و ناوچەی توزخورماتوومان دابیت. بەلکو دەیانگوت خەلکی ناوشارەکان بوون بەم کارە هەستاون، چونکە پییان وابوو ئیمە لەتواناماندا نییە ئەو هەموو ریگایە بەپێ ببرین بۆ ئەو ناوچانە.

٥-توانيم بروايان پێ بينم كەمن ناوی كەس لەریكخراوەكانی كفری- توزخورماتوو - سەر قەلاّ - كەلار- باوەنوور نازانم، چونكە من بەوە تاوانبارم كەسەر بەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدم.

لەكاتی گفتوگۆمدا لەگەلّ هەر چوار ئەو لیپرسراوە بۆم دەركەوت كەئەمانە تەنها بروایان بەهیز هەیە. كیشەی سەرەكی من لەگەلیاندا ئەوە نەبوو كەنەمدەزانی چۆن لەگەلیاندا وتوویژ بكەم بەلكو من لەبەر ئەوەی زۆر بەراشكاوەیی و راستەوخۆ قسەم لەگەلّ دەكردن گومانیان لی پەیدا كردبووم، بۆیە دەیانوت: تۆ خۆت بۆ ئەو پرسیارانە ئامادە كردووەو جیی گومانی ئیمەی. دوایی منیان بەرەو بەغدا برد، نازانم بۆ بەلاّم لەریگادا ٢٠ سەرباز پاسەوانیان دەكردم بەبیانوی ئەوەی نەوەك هیزی پیشمەرگە هەولّی تیرۆركردنم بدەن. كەگەیشتین بەوەزارەتی بەرگری منیان بردە لای شەفیق دەراجی لیپرسراوی ئیستخباراتی سوپاو یاریدەدەرەكەی عەبدولرەزاق نایف.دوای ئەوە بردیانم بۆلای سەرۆكی سوپا عەبدولرەحمان عارف و بۆ رۆژی دوایی گەیاندمیانە لای عەبدولسەلام عارف. لەوێ سەرلەنوێ هەموو ئەو پرسیارانەیان لی كردمەوە كەپیشتر بیستبووم، بەهەمان شیوە دووبارە بروایان نەدەكرد بەوەلاّمەكانم. تەنها خودی عەبدولرەحمان عارف و شەفیق دەراجی نەبیت، ئەم دووانە بۆ من بوونە پالپشت. چونكە لەریگای منەوە زۆر زانیاری و راستییان لەسەر ژمارەی كوژراوو بریندارەكانی هیزی پیشمەرگە پێ گەیشت، كەپیشتر لەلایەن

گەورە ئەفسەرانی هێزی سەربازییەوە ژمارەی ناراستو هەڵەیان پێ رادەگەیاندن. هەر بۆیە دووای ئەمە رێگایان دام سەردانی ماڵەوە بکەم. سەعات ١٠ی شەو گەیشتمە بەردەرگای ماڵمان کەدەرگایان لێ کردمەوەو چومە ژوورێ بەو بەرگەوە بینیانمو سەیری باڵتۆکەی دەستیان کردم، یەکسەر بۆیان ئاشکرا بوو کەمن شۆرشم بەجێ هێشتووە بۆیە کەسیان وەڵامی سەلامەکەیان نەدامەوە. دایکم وتی: یاخوا بەخێر نەیەوە ئەمەشت کرد رەفیق. ئەمە وای لێ کردم سەردانی خزمو کەسو کارم بکەم. دوای ئەوە پێیم وتن من بەیانی لێرە نابمو دەچمەوە لای شەفیقی برام لەقەڵادزێ. خێزانەکەم وتی کێشەمان نەبوو وە لەهیچیشمان کەم نەبوو ئەمەت بۆ کرد ؟ بەیانی تیرۆرت دەکەنو دەڵین رەفیق تاوانبار بوو بۆیە کوژرا، بەڵام ئەگەر لەناو هێز پێشمەرگەدا کوژرابای ناوت بەشەهید دەرۆی.لە دوا رۆژدا چی بەمناڵەکانم بڵێم من لەگەڵت دانانیشم، کەماڵ وتی: – رووم دەکردە خزمو برادەران بەپێرمەوە ئەهاتن ئیتر شەرم ئەکەم لەماڵەوە بچمە دەرەوە.

بەدووردرێژی باسی خۆمم بۆ گێرانەوە چۆن لەسەرەوە نووسیوومەو دەقی قسەکانم باس کرد هەتاکو ئەم سەعاتەی گەیشتمە ماڵەوە، ئینجا دوو رۆژ کەسمان لەماڵەوە نەچووینە دەرەوە، هەر چوارمان رێککەوتین کەکاسبی بکەم رێگای باوکو باپیرانم بگرمە بەر، هەربۆیە لەشەقامی جمهوری لەباڵەخانەی محەمەد بوننیە شوقەیەکم گرت بەناوی (مكتب كمال للتجارە والقمسیون) بۆ کاسبی. عەبدولرەحمان عارف ٢٠٠٠ هەزار دیناری دامێو عەبدولسەلام عارفیش ٥٠٠ دینار.

## دەربارەی پەیوەندییەکانم لەگەڵ حکومەتی عیراقدا

هۆی ئەو بایەخ پیدانەی رژیم بەمن لەبەر ئەوە بوو کەخۆم تەسلیم کردەوە پروپاگەندەی ئەوەیان بۆ کردم کەگوایا من سکرتیری مەلا مستەفا بووم، لەگەڵ ئەوەی کەمن هەر لەسەرەتاوە پیم وتبوون، ناوم رەفیق پشدەرییەو فەرماندەی بەتالیۆنی ٩بووم. ئەم پروپاگەندەیەی رژیم لەسەر من لەزۆر رووەوە بۆ من کەلکی هەبوو، چونکە توانیم لەو ریگایەوە زۆر لەکیشەو نەهامەتییەکانی گەلەکم بۆ گەورە لیپرسراوان باس بکەم. هەر ئەوە وای کرد لەمالەوەش ریزم لی بگرن پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت کەمن هەر بەبەلاش خۆم تەسلیم بەرژیم کردووە دەنا بەفکرو هۆش هەردەم لەخزمەت گەلەکەمدام. پاش تیپەر بوونی مانگیك هەستم کرد لەلایەن سیخورەکانی میرییەوە چاودیری دەکریم. چونکە گومانیان لیم هەبوو ئەم کارەی منیان بەدەسکیسەی شۆرش دەزانی، بۆیە ئەو دەمانچەیەی دابوویانمێ لەسەرەتادا بۆ پاریزگاریکردن لەخۆم، لییان سەندمەوە. بۆ جاری دەیەم داوایان لی کردم ریکخراوەکانی پارتییان بۆ دەستنیشان بکەم، دوای ئەمە دلنیابووم کەگەورەلیپرسراوانی سوپای رژیم گومانەکەیان گۆراوە بۆ رق لەمن. هەربۆیە کیشەیان بۆ دروست کردم بەلام عەبدولرەحمان عارفو شەفیق دەراجی پشتیان گرتمو دەربازیان کردم.

وەکو وتم ئەو پشتگیرییەی ئەوانە بۆمن قازانجی زۆر بوو، بۆ نموونە کاتێك سالار تۆفیق سادق کەپێشمەرگەی شۆڕش بوو شەهید بوو وا بلاو کرایەوە کە لەقەلادزێ بەتفەنگی دوژمن شەهید کراوە، بۆیە چومە کەرکوك بەو نیازەی لەویوە بچمە قەلادزێ بۆ سەرەخۆشی لەمامم چونکە شەهیدی ناوبراو ئامۆزام بوو. لەکەرکوك لەتەنیشت کاربەدەستێکی ئیستخبارات دانیشتبووم لەم کاتەدا نامەیەکیان بۆهیناو سەیری منی کردوو وتی: لەبەغداوە بروسکەمان بۆ هاتووە کەگوایە دەتەویت بۆ ناو هیزی پێشمەرگە راکەی، بەلام ئیمە وەلامیان ئەدەینەوە کەکوری مامت لەگەل پێشمەرگەکاندا کوژراوەو تۆش دەتەویت بچیتە سەرە خۆشی. ئەوەبوو لەپیاوەتی خۆی ئاگاداری عقید غانم مصباحی کرد تا ریگا بدەن بەئاشکرا پرسەی بۆ دابنیم و، بریك برنج و شەکرو رۆن و چای بۆیان نارد، منیش دوای ئەوە گەرامەوە.

بێ ئەقلی و شۆڤینی پیاوەکانی رژیم لەلایەك و دلسۆزی مالەوەمان دایکم و هاوسەرەکەم و کەمال لەلایەکی تر وایان لی کردم کەهەلویستە دوژمنکارییانەی مەلا مستەفاو عەبدولوەهاب ئەترووشیم لەبیر بچیتەوە. هەروەها وای لی کردم بەخۆمدا بچمەوەو بریار بدەم بەهیچ شیوەیەك گیانی تۆلە بەسەرمدا زال نەبێ و لەخزمەتکردنی هەر خەلکیك کەهانام بۆدینێ دریغی نەکەم. هەروەها بریارمدا ئەوەندەی پیم بکرێ قەناعەت بەلیپرسراوانی رژیم بینم بۆ چارەسەرکردنی کیشەی کورد. ئەم

کـاره وای کــرد خۆشەویسـتی مالــەوەو خــەلك بــۆلای خــۆم رابکێشم و، دەروونیشم ئاسودە بکەم.

دوای ماوەیـەك سـەرۆك کۆمـاری عـێراق عەبدولسـەلام عـارف لەباروودۆخێکی نادیاردا لـەکاتی سـەردانی بۆ پاریزگای بەسـرە کۆپتەرەکـەی لـەزوبێر کەوتـە خـوارەوەو مـرد. ئـەم رووداوە بـوو بـەهۆی ئـەوەی عـەبدولرەحمان عـارفی بـرای بکـرێ بەسـەرۆك کۆمـار. لەسـایەی ئـەم زاتـەوە گۆرانکـاری بـاش بەسـەر عـێراقدا هات بەکورد و عەرەبیەوە، لەبەرگی یەکـەم و دووەم بـەدرێژی باسـم کردووە. بەش بەحالی خۆم توانیم لەوماوەیەدا لەسەر پێی خۆم رابوەسـتم و، توانیـم رووبـەروو لەگـەڵ سـەرۆك کۆمـار و ژەنەرالــە سـەربازییەکانی رژیم قسە لەسـەر کێشـەی کورد بکـەم. هـەروەها پەیوەندی باشم لەگەڵ حزبە سیاسییەکانی عەرەب دروست کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٦٦، ئایا ٦٦ چییە؟

لێرەوە بەکورتی دێینە سەر باسی باڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد:

هەرچەندە مەلا مستەفا دوای کۆنگرەی قەڵادزێ(شەشەمین کۆنگرەی پ.د.ك)و هێرشەکەی بۆسەر ماوەت و باڵی مەکتەبی سیاسی و هەڵاتنیان بۆ ئێران دوای ماوەیەك هەموو هێزەکەیان گەڕایەوە پاڵ شۆڕش لەسەر داوای عەباس ئاغاو ڕەزامەندی خودی مەلا مستەفا. ئەوەبوو هاتنە دۆلەرەقە مام جەلال و کاك عومەر دەبابەو کاك حلمی عەلی شریف و کاك عەلی عەسکری لەپەنا عەباس ئاغا ڕۆژگاریان بەسەر دەبرد. مەلا مستەفا لەریگای پاراستنەوە زانیاری ئەوەی پێ دەگات کەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد پەیوەندییان بەدەروە پچراوە، بۆیە ئەمە بەهەل دەزانێ بۆ لەناو بردنیان چونکە بەبڕوای ئەو، ئەم جەماعەتە لەداهاتوودا دەبنە هەرەشەی گەورە بۆ سەر بنەماڵە.

بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی پاسەوانە تایبەتیەکانی نارد بۆ لای عەباس ئاغاو برادەرانی مەکتەبی سیاسی. مام جەلال و عومەر دەبابەو عەلی عەسکری و کاك حیلمی پێی ڕاگەیاندبوون کەوای پەسەندی دەکەم بێنە ئیرە لەحاجی ئۆمەران دانیشین، ئەوەش بۆ بەرژەوەندی گشتی. بۆ ئەم مەبەستە لەریگای ریکخراوەوە راستی ئەو وەلامەیان پێ گەیشت، هەروەها بەپەلە ئاگادار کرانەوە، داواکردنی مەلا مستەفا بۆ پشوودان نیە

لەلایەکی کەوە عەباس ئاغا پێی ڕاگەیاندن کەخودی مەلا مستەفا بڕیاری لەناو بردنی داون، بۆیە ئێوە بەرپرسیارن لەبەرامبەر بەرژەوەندیو ژیانی خۆتان، ئەوانیش پاش گفتوگۆ لەناو خۆیاندا گەیشتنە ئەوباوەڕەی کەئەمە پلانەو بارزانی دەیەویت لەو ڕیگایەوە تیرۆریان بکات؛ هەر بۆیە دۆلەرەقە یان جێهیشتو بەنهێنی ڕایان کرد. مەلا مستەفا کەئەم هەواڵەی بیست زۆر تورە دەبیتو یەکسەر چەند جامانە سوریك دەنیریت بەنیازی هەلویست وەرگرتن بەرامبەر عەباس ئاغا، بەڵام سەرۆك هیزیکی ناسراوی نیشتمانیەروەر ئاکۆیی خاوەنی هیزیکی تایبەتی وا ئاسان نیە بۆ بارزانی کەبیکوژیت؛ بۆیە ئەو هەلویستەی عەباس ئاغا دەکریێ وەك داستانیك تەماشا بکریت. پاش ماوەیەکی کەم لەسەرانسەری کوردستان دەنگوباسی ڕاکردنی ئەم کۆمەلە بلاو بۆوە، بەندە یەکیك بوو لەوانەی کەهەر زوو ئەم هەواڵەی بیست.

کاك عەلی مام ڕەزا کەکوری پورمە بەهۆی خزمایەتیەوە هاتوچۆمان هەبوو، بەلام بەهیچ جۆریك پەیوەندی سیاسیم لەگەڵدا نەبوو، لەگەڵ ئەوەی دەم زانی سەر بەبالی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدە بەلام نەمدەزانی پلەی حزبی چییە، دوای هاتنی مامە و حلمی ئینجا زانیم کەلیپرسراوی ڕیکخراوی بالی مەکتەبی سیاسیە. شەو لەپرا کەهیچ ئاگام لەخۆ نەبوو کاك حیلمی عەلی شەریف و عەلی مام ڕەزا هاتنە مالەوە بۆ لام لەبەغداد کەمالمان ئەو کات لەئیسکانی غەربی بەغدابوو، منیش بەگەرمیەوە بەخیرهاتنم کردنو

خۆشحالی خۆم بۆ دەربرین و ریزیکی زۆرم لی نان، پاشان روم بەکاك حیلمی‌کردو وتم: پیشینان راستیان وتووە:- کیو بەکیو ناکەوێ بەڵام چاو بەچاو دەکەوێ، ئەوە وای کرد دەست بکەین بەووتویژو قسەکردن.

سەرەتا کاك حلمی پرسیاری باردۆخی خۆمی لیکردم، منیش بەدورو دریژی باسی بارودۆخی خۆم بۆ کرد پاشان وتم: لەهیچ رویکەوە کیشەم نییە، ئیستا مەکتەبی بازرگانیم هەیە لەبالەخانەی بوننیە بەناوی *(کمال للتجارە والقموسیون)* و دوو وەکالەتم هەیە.

ووتی:- گومانم نییە شارەزاییەکی باشت هەیە بەرامبەر حوکمەتو خودی عارف خۆیو دەزانی چۆن بیر دەکاتەوەو هەلویستی بەرامبەر کیشەی کورد چۆنە.

ووتم:- خودی عەبدولرەحمان عارف جیاوازییکی زۆری هەیە لەگەڵ سەرۆکەکانی پیشوو، چەند جار دووبەدوو لەکاتیکدا کەسەرۆك سوپای عیراق بووو ئیستا کەسەرۆك کۆمارە، دەربارەی کیشەی کورد باسم لەگەڵ کردووە ئامادە گیری تیدایە بۆ چارەسەرکردنی کیشەی کورد، وە هەلویستی ئیجابیە، جیاوازی ناکات لەنیوان عەرەبو کورد. بەڵام عەبدولرەحمان ژەنەراڵەکانی سوپا هینانە سەر تەختی دەسەڵات، ئەو شەوەی لەروسیا گەرایەوە لەفرۆکەخانە بەچاوی خۆم سەرنجم دایە چۆن عەبدولرەزاق نایف دەستی گرتو لەگەلی رۆیشتن، لەکاتیکدا عبالرحمان بزازو عەزیز عەقیلی دانشتبوون بەم هاوینە رازی نەبوون، لەدریژەی قسەکانم بۆ حلمی عەلی بۆم روونکردەوە

کەدەسەڵاتی تەواوەتی بەسەر کورسیەکەیدا نییەو ناتوانیت بەبێ فەرمانی ژەنەراڵەکانی سوپا بڕیارێك بدا بەتایبەتی عەبدولڕەزاق نایف.

وتی:- ئێمە سەرپەرشتی شۆڕشێکمان کرد توانیمان لەماوەیەکی کەم بەشی زۆری جەماوەر لەدەوروپشتی ڕێکخراوی پارتی کۆبکەینەوەو هێزی پێشمەرگەمان بەجۆرێك ڕێکخست کەدوژمنمان سەرسام کرد، بەڵام بارزانی هێزی هۆزەکانی کۆکردەوەو هاتە سەرمان ئێمەش بۆ بەرژەوەندی گشتی نەمان ویست ڕووبەڕووی بوەستین و شەری لەگەڵدا بکەین تاکو ڕیسەکەمان نەبێتەوە خوری و، ئێستاکە بارزانی بەو عەقلیەتە خێلەکییەی خۆی دەسەڵات بەڕێوە دەبات و بارودۆخەکە بەرەو هەڵدێر دەبات، ئەو دکتاتۆریەتەی بارزانی بۆتە هۆی ئەوەی تێکرایی ئەندامانی پارتی و هێزی پێشمەرگە داوامان لێ بکەن بێینە لای ئێوە بۆ گفتوگۆو دۆزینەوەی ڕێکەچارە. ئێمە بەناوی مەکتەبی سیاسی هاتووین کە لەگەڵ حکومەت دانووستان بکەین، ئەگەر هەڵوێستییان ئیجابی بێت و لەماوەیەکی کەمدا دان بەمافی کورددا بنێنن، ئەوا دەتوانین کوردستان لەدەسەڵاتی خێلەکی ڕزگار بکەین و، ئەگەر هەڵویسیان سلبی بێت ئەوا ئێمە یەکسەر بەغدا بەجێ ئەهێلین و چۆن هاتوین ئاواش ئەگەڕێینەوە.

ئینجا وتی:- بۆیە بەنهێنی ڕوومان کردۆتە لای تۆ بۆئەوەی بچیت چاوت بەخودی سەرۆك عەبدولڕەحمان عارف بکەویت تا لەهەڵویستی ئێمەی ئاگادار بکەیتەوە، ئێمە چاوەڕوانی وەڵامین.

منیش لەگەڵ کاک عەلی مام رەزا رۆیشتم بەرەو مالیان کە لەگەڕەکی بغداد جدیدە بوو، چومە خزمەتی مام جەلال دوای سلاو وتوویژو لیکۆلینەوە دەربارەی بارودۆخی ئیستاو هەموو ئەو باسانەی کەکردم لەگەڵ کاک حلمی عەلی شەریف هەر هەموویم بەدەقی خۆی بۆ باس کرد.

مامە وتی:– ئایا ژەنەرالەکانی سوپا باوەریان بەدیموکراتیەت هەیە، دان بەمافی کورددا دەنین، پشتگیریمان ئەکەن، کیشەی کورد جیبەجی ئەکەن، هەلویستیان چۆن چۆنی دەبیت ئیجابی یا سلبی؟

ووتم:– الیس الصبح بقریب، ئەگەر رووبەروویان ببنەوە ئەوجار تیدەگەی حوکمەتیکی سەر بەسوپایە، بەلام خودی عەبدولرەحمان عارف دەیەوێ کیشەی کورد چارەسەر بکات و من شایەتی بۆ ئەوە دەدەم.

سەعات یەکی شەو هاتینەوە بۆ مالی خۆمان و تا سەعات سیی بەیانی بەدوورو دریژی لەگەڵ کاک حلمی قسەمان کرد. بۆ بەیانی چووم بۆلای عەبدولرەحمان عارف و هەموو قسەکانم لەگەل مام جەلال و حلمی عەلی شەریف بۆ باسکرد. دوای ئەوە ئاگادارم کردوون کە بۆ نانی نیوەرۆ لەمالی عەبدولرەحمان جەلیل کەمەلا مستەفا ناوی لینابوو جەلیل چەرمەگا دەعوەت بن، ئیوارەکەشی سەعات چوار لەکۆشکی کۆماری لەگەڵ سەرۆك کۆدەبنەوە. ئینجا سەردانی مام جەلالم کرد بۆ دووەم جار لەمالی کاک عەلی، دەقی قسەکانم بۆ گیرایەوە وتم:– عەبدولرەحمان عارف خۆشحالی خۆی دەربری بۆ ئەم قسانەو

سـلاوو ریـزی هـەبوو، هـەروەها بەریوەبـەری ئاسایشـی گشـتی عبدالجلیل ئەحمـەد وە بەریوەبـەری استخباراتی سـوپا شـەفیق دەراجـی، کەوتنـە جـمو جوڵکـردن‌و زۆر بایـەخیان پییـدا، هـەر هەمووومان لەسەر ئەوە کۆکبوین کەئەم هەڵە لـەکیس نـەدەین بگرە عەبدولرەحمان عارف وتی:- ئەبێ هەموومان تیشـك بخەینـە سەر ئەم رووداوە بۆ جیبەجیکردنی. لیپرسـراوانی سـوپا بەشـدارن، پیم وایە کۆبوونەوەکەی سبەی ئیوارە زۆر فراوان دەبیت.

گەرامـەوە مالـەوە کـاك حلمـی چـاوەروانی دەکـردم، ئاگـادارم کـردو پیـم راگـەیاند کەئـەم میواندارییـە بـۆ گفتوگۆیـە، بۆیـە لـەدامودەزگای ئـەمنی هـەردووك بـەش بەشـدار دەبـن ئـەمن‌و استخبارات‌و نوینەری سوپا، ئەوانـە بگەنـە بـاوەر کەئەم کیشـەیە بەم جۆرە جیبەجی دەبیت ئەو کاتە سـەرۆك یەکسـەر رەزامـەندی خۆی لەسەر ئەدا.

لـەکاتی دیاریکراو گەیشتینە بەر دەرگـای مـالی عەبدولجـەلیل ئەحمـەد هیشـتا لەئۆتۆمبیلەکـەی دانەبـەزی بوویـن یەکسـەر بەپیریانـەوە هـاتن بـەجۆریك پیشـوازیان لی کردیـن جـێی سەرسـورمان بـوو لای خـودی پاسـەوانەکانی. بـەئۆتۆمبیلیکی فۆکـس واگـن سـێ کـەس دابـەزین بریتیبـوون لـەمام جـەلال‌و حلمـی‌و مـن.لـەو لیپرسـراوانەی پیشـوازیان لیکردیـن شـەفیق دراجـی‌و عـەبدولرەزاق نـایف‌وعبدالجلیل ئەحمـەدو چـەند کەسانیکی‌تر کەناوم لەبیر نەماون، ریزیکی تایبـەتیان لیگرتین، دوای سلاوو چـاك‌و چۆنـی‌و نـانخواردن، دەربـارەی هاتنیـان‌و بـاردۆخی ئیسـتاو کیشـەی کـوردو دەسـت تیوەردانـی دەرەوەی

ولات گفتوگۆ کرا بۆ ماوەی سێ سەعات. بەندە لەماوەی ئەم سێ سعاتە رەنگە شەر دە دەقیقە قسەم کردبێت من گوێم ئەگرت، کاك حلمی دووجار بەنهێنی ئاگادای کردم کە ئەگەر ئەوان رازی بن با وێنەمان نەگرن و، وەلامم دایەوە ئەمانە ئاسایشن لای ئەمان ئەمە زۆر گرنگەو حەز بە وێنەگرتن ناکەم.

## پوختەی قسەکانی مام جەلال لە کۆبوونەوەکەدا

مامە لەکۆبۆنەوە سی سەعاتییەکەیدا لەسەر کیشەی کورد وتی:- ئیمە سەرۆك هۆزیك نین، نەهاتوین چەکتان بۆ هەلگرین یان داوای هیچ یارمەتیەکتان لی بکەین، ئیمە نوینەرین بەناوی گروپیکی سیاسی کوردییەوە هاتووین، خاوەن بیرو باوەرین و بەدلیکی پاك و بەئیمانەوە هاتوین کە لەگەل حوکمەتی عەبدولرەحمان کۆببینەوە بۆ جیبەجیکردنی کیشەی کوردو دان نان بەمافی رەوایی کورد، کەئەمە لەدواجاردا دەبیتە مایەی گۆرانکاری لەسەران سەری عیراق، یارمەتی دانی ئیمە بەهیز بوونمان و پشتگیریمان ئەوەیە کەئایا ئیوەی حکومەتی عارف گەیشتوونەتە ئەو باوەرە کەبەشەر ناتوانن دەست بەسەر کوردستاندا بگرن،و کیشەی کورد کۆتایی پێ نایەت، عیراق پیك هاتووە لەلەدوو نەتەوە کوردو عەرەب ئایا ئیوە گەیشتونەتە ئەو باوەرە، ئەگەر وەلامتان سلبیبوو ئیمە چۆن هاتووین ئاواش دەگەرێینەوەو، ئەگەر وەلامتان ئیجابی بوو بەردەوام ئەبین لەووتو ویژو گفتوگۆ کیشەکەمان زۆر بەئاسانی جیبەجی ئەکەین سوود بەخش دەبیت بۆ هەموو دانشتوانی عیراق.

قسەکانی نوینەرانی حکومەتیش لەچەند خالیك لەیەك چوون، کەدیار بوو پیشتر لەنیوان خۆیان قسەیان لەسەر کرد بوو کەبریتی بوو لە:- لەسەدای چەندی دانشتوانی باکوری عیراق لەگەل ئیوەن؟ هیزی پیشمەرگەتان چەندە؟ چۆن چۆن ئەتوانن بەرامبەر بارزانی راوەستین؟ کاتیك بارزانی لاواز بوو؟ ئیران ئەو کاتە دەوریی چۆن دەبیت ؟ ئیوە چیتان لەئیمە دەوێ؟وەلامی مامەو حلمی‌یش بەم جۆرە بوو:- دان بەمافی کوردو کیشەی کورد بنین، ئەوکاتە ئیمە گەورەترین هیز ئەبین لەکوردستان، هەر کاتیك رژیمی شاە کیشەمان بۆ دروست بکات ئیمەش کیشەی بۆ ئەنیینەوە.

ئینجا مام وتی:- کاك رەفیق من ئەو دانیشتنانەم زۆر دیوە بەم جۆرە ئیستا بەگەرمەوە گفتوگۆیان لەگەل کردووم بەلام زۆری پێ نەچووە وەلامەکەیان بەفرۆکە داوینەتەوە، وادیارە ئیشمان بۆ ئەکەن وەریزیکی تایبەتی تۆ ئەگرن، بۆیە ئەگەر بتوانیت بەقسەی خۆشەکانی خۆت لەگەلیان بدوییت بۆ بەردانی برادەرەکانمان، ئەگەر بیتو بتوانیت ئەمە بکەیت ئەوا لەهەموو رویکەوە ئیمەو ئەتۆ سوود بەخش دەبین.

بۆیە چومە نیوان کاك عبدالجلیل ئەحمەدوشفیق دراجی وتم:- تکایەکم هەیە لای بەریزتان بۆ خودی من، ئەگەر بەدەمەوە بین ئەووا لەناو خەلك ئەگۆرییت و بەباشی باسی ئەم هەلویستەم ئەکەن و، بەناوی منەوە تەواو دەبیت چونکە کەس نازانیت ئەم کارە بۆ خودی مامەو حلمی ئەنجام دراوە، ئینجا دریژەم بە قسەکانم داو ووتم:جەلال و حلمی داواکارییەکان هەیە لای

بـەڕێزتان ئـەویش ١١ کەسـیان گـێراوە کەسـەر بـەڕێکخراوی خۆیـانن بڕیـاری بـەردانیان بـدەن لای ئـەوان زۆر زۆر گرنگـە، بۆئێـوەش زۆر زۆر ئاسـانە، بـەردانیان دەبێتـە مایـەی نزیـك بوونـەوەی بـاوەڕو دروسـتانەیە کەبـەهێزکردنی پـەیوەندیتانو، هـەر کـاتێك لەگـەڵیان رێـك کـەوتن ئـەتوانن لـەجیاتی ١١ کـەس کەبەرتان داون ئەو کاتە ١١١ سەدو یانزە کەسیان لێ بگرنەوە.

بەبێ لێکۆڵینەوە بڕیاریاندا هەر ١١ کەسیان بەر بدەن، من بۆ جێبـەجێکردنی ئـەو خاڵـە گرنگـە مامـەوەو چومـە ئاسایشـی گشتی، سوپاس بۆ یـەزدانی مـەزن بەربوون، ئـەوەی لـەبیرم مـاوە نـاوی دوو لـەو بـرا بەڕێزانەیـە، یـەکێکیان لەلـەندن جێگـیربووەو خاوەنی چەند ملیۆنێك پاوەنە کە لەم دواییە هاتبوو بۆ سلێمانی خـۆی پێنیشـان نـەدام ! دووەمیـان بـرای بـەڕێزو رۆشـنبیرو نیشتمانپەروەرو سیاسەتمەدار پزیشکی ناسراو کاك فواد بابان کەهـەتاکو ئـەم مێـژووە کـەرووی تێدەکـەم شـەرمەزارم دەکـات، لەهەڵوێستو پیاوەتی خودی خـۆی لـەکاتێکدا ئـەم کـارە ناکەمـە هـی خـودی خـۆم، چونکـە لەسـەر داوای حلمـیو مامـە بەربوون.

*تێبینی/*

١-بـەهۆی ئـەوەی بـەهیچ جۆرێـك دەورێکـم نـەبوو لەکۆبوونەوەکە، ئەمە یەکەم جارە بەم جۆرە لەنزیکەوە بەشداری کۆبوونـەوەی وا گرنـگ بکـەم، قسـەکانو خواردنـەکانم هـەمووی لەمێشـك دایـەو ئێسـتاش کـە٣٤ سـاڵ تێپـەڕیوە لەبـەر چاومـە

رسته‌یه‌ك هه‌یه له‌ناو خۆماندا ئه‌ڵێت ته‌رت كه‌م و قوتت ده‌م دانیشتنه‌كه‌شی به‌م شێوه‌یه سه‌رنجی راكێشام، مام جه‌لال و كاك حلمی وام دانان ئه‌مانه مامۆستان یا كاربه‌ده‌ستێكی گه‌وره‌ن، یا دكتۆرن وه ئه‌مانه ته‌ندروستیان باش نییه، به‌جۆرێك لاوازو بێ ده‌سه‌لات و فه‌قیر بوون جار جار ئه‌م ویست له‌جیاتی ئه‌وان قسه بكه‌م. هه‌رچه‌نده له‌بنجه‌كانه‌وه هه‌ردووكیان ئه‌ناسم. به‌لام تا ئه‌و كاته نه‌م ده‌زانی به‌رامبه‌ر به‌بێگانه چه‌ند به‌هێزن. له‌و كاته‌دا خۆم به‌خۆم ئه‌ووت ره‌فیق عه‌یبی ئه‌م دوو كابرایه ئه‌وه‌یه ره‌گه‌زیان كورده.

٢-شه‌و دره‌نگ گه‌رامه‌وه ماله‌وه به‌دوورو درێژی هه‌موو روداوه‌كانم بۆ دایكم و هاوسه‌ره‌كه‌م و كمال گێرایه‌وه، له‌ناو خۆماندا وتوو ویژمان له‌سه‌ر كرد پیم وا بوو دوا رۆژم زۆر تاریك ده‌بێت وه ئه‌مه‌ی من پیی هه‌ستام كاریكی خه‌ته‌رناكه بۆیه بریارمدا ئاگاداریان كه‌م، پیشه‌كی له‌گه‌ڵ كاك عه‌لی قسه‌م كرد، ئه‌ویش وای په‌سه‌ند كرد كه‌كاك حلمی و مامه ئاگادار بكه‌مه‌وه.

٣-بۆ كاك حلمی‌م باس كرد ئه‌ویش وتی:- ئیمه به‌بریاری گشتی ئه‌م ریگایه‌مان گرتۆته به‌رو خۆت ده‌زانی ئیمه نوینه‌رین گومانم نییه تووشی ته‌نگ و چه‌له‌مه‌یه‌كی گه‌وره دیین له‌راستیشدا كاریكی خه‌ته‌رناكه، به‌رای من دوو كیشه‌ی گه‌وره‌مان دیته پیش،: یه‌كه‌م له‌گه‌ڵ بارزانی، دووه‌م له‌گه‌ڵ حوكمه‌ت، كه‌تۆ به‌هیچ جۆریك ئاگادار نیت وه تاوانبار نیت، ئیمه به‌رامبه‌ر به‌خودی تۆ بارمه‌تیت ئه‌ده‌ین له‌هه‌موو روویكه‌وه‌و پشت گیریت ئه‌كه‌ین. والله ثم والله راستیان كرد

ـــ ئاغا میراودەلی وە هەمزە باپیر بابەکر ئاغا میراودەلی وە ـــ ئەحمەد ئاغای بیشیر میراودەلی.

ـــەوە بەخێر هاتن و میوانداریێکی بێ وینەیانکردن. ـــی تایبەتیان لێ نان، لەگەڵ بەشی زۆری کاربەدەستانی ـــ کۆبوونەوە لەوانە:- سەرۆك کۆمار عەبدولرەحمان عارف و ـــی ناوخۆو سەرۆك سوپاو وە بەڕێوەبەری ئاسایشی ـــ بەڕێوەبەری دەزگای سوپاو چەندین کار بەدەستیتر.

ـــەکەم کۆبوونەوەیان لەگەڵ کاربەدەستانی میری هەر ـــیان چ بەنووسین یان بەقسە وەکو بنیشتە خۆشە بەدوورو ـــی باسی بارودۆخی ناوچەی پشدەرو بیتواتەیان دەکرد. ـــ وت لەو رۆژەی مەلا مستەفا نوینەری تایبەتی خۆی دانا ـــ میرخان بەکاربەدەستی ناوچەی پشدەر وە عەلی شەعبان ـــ بەدەستی بیتواتەو رانیە ئەم دوو تاوانبارە بەجۆریك ئازارو ـــەنجەی دانشتوانی ناوچەکە ئەدەن، کەهەرچی خودا پێی ـــشە ئەی کەن و، هیچ یاسایەك لەسەران سەری جیهاندانییە ـــ جۆرە دادگای و رەفتار لەگەڵ هاولاتیان بکات، ئیمە بۆ ـــی بەرهەلستی لەم دوو تاوانبارانە بکەین، بۆ بەرژەوەندی ـــ و بەتایبەتی ناوچەی پشدەرو رانیە، ئامادەین بەهەموو ـــیەك یارمەتیتان بدەین و، باشترین و چاکترین ریگا ئەوەیە بۆ ـــسەرکردنی ئەوەیە کەخۆتان حوکمی ناوچەکەی خۆتان ـــ وەکو سالانی حوکمی پیش ١٩٣٦و تاوەکو ١٩٤٢، هەموو ـــبەدەستان لەخۆتان بیت قائمقام و مدیری ناحیەو سەرۆك

ئەم قسەیان بردە سەر بەدڵو بەگیان بەهیچ جۆریك جیاوازیا
لەگەڵ من نەکرد.

من هیچ تاوانیکم نەبوو بەهیچ جۆریك ئاگادار نەکرا بوود خۆیان ئەو ریگایەیان گرتە بەر، چ بالی مەکتەبی سیاسی ـ حوکمەت، گومان نییە لەوەی ماوەیەك بوو بالی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مام جەلال بەنهینی لەگەڵ حوکمەتی عارف پیوەندیان هەیە بەیەکەوە، لەو رۆژەی ؟؟؟؟ کردووە لەخزمەت جەنابی عەباس ئاغای ممندئاغای سەرۆك هۆزی ئاکۆ. دیار روون و ئاشکرایە لەهەر دووك لا بەندەیان دەست نیشان کردووە بۆ ئەوەی بگەنە یەك، چونکە یەکەم سعات کەئاگاداری کـ بەدەستی حوکمەتم کرد لەسەرو هەموویانەوە سەرۆ عەبدولرەحمان عارف رەزامەندی خۆی پیشاندا بـ کۆبوونەوە.هەلویست و بۆچوون و پیلانی میری ئەوە بـ کەسەران سەری کوردستان هیزی سێیەم پیك بهینن لـ هۆزانەی کە لەیەکەم رۆژی شۆرشی ١١ ئەیلولی ١٩٦١ چەکیـ هەلگرتووە رووبەرووی حکومەت، بۆ ئەم مەبەستە لەریگا بەندەوە پیوەندیم بەچەند سەرۆك هۆزیك کرد ئەوا لەخوارد ناویان ئەنووسم.

لە سالی١٩٦٦ پەیوەندیم بەهۆزی پشدەر کرد، دوای چەن نووسراویکم نارد لەریگای کمالی برام وە دووجار خودی خـ چووم بەنهینی چاوم پییان کەوت ئەمە بوو لەئەنجامی ئـ هەولدانە سێ کەسیان بەناوی نوینەری هۆزی پشدە تەشریفیان هینایە بەغدا کەئەم بەریزانە بوون: – بابەکر محمو

شارەوانی و رابەری پۆلیس و، بەهێزی چەکداری خۆتان ناوچەکە بپارێزن.

وەڵامی نوێنەرانی پشدەر:- ئەو پیلانەی ئێوە چارەسەریی بارودۆخی ئێستای ناوچەکە ناکات بەتەواوەتی بەلکو زیاتر ئالۆزتر دەبێت، چونکە بەبێ یارمەتی ئێوە هیچمان پێ ناکرێت وە کەیارمەتیمان لەئێوە وەرگرت ئەوا ئێمە چووینە خانەی فرسانەکان..

ئێوە ئەگەر ئەتانەوێت نوێنەرانی مەلا مستەفا نەك هەر لەپشدەرو رانیە بەلکو لەسەران سەری کوردستان کەسیان لەدەورو پشت نەمێن و دانشتوانی ناوچەکە بەتێکرای ژیان و رووبەروویان راوەستن ئەوا کێشەی کورد جێبەجێ بکەن لەرێگای جەماعەتی جەلال تاڵەبانی، ئەو کاتە هەموو دانشتوانی کوردستان لەرۆشنبیرو نیشتمانپەروەرو دلسۆزان و ئێمەی هەموو هۆزەکان بۆ بەرژەوەندی گشتی بەتایبەتی بۆ بارودۆخی ناوچەکە بەتێکرایی پاڵ پشتی جەماعەتی جەلال تالەبانی ئەبین، دوای ماوەیەکی کەم وەلامێکی ئارام رۆژانە ژیانێکی بەختەوەر بەگشتی ئەبەین بەرێوە بارزانی تەنها یارمەتی دەرەوەی بۆ ئەمێنێ لەناوەوە خەلکیی بیگانەو زۆر کەمی بەدوا دەکەوێتو بەمەرجێك دان بەمافی کورددا بنێن.

وەڵام دانەوەیان بەم شێوەیە وای لەکاربەدەستانی میری کرد کەهەلوێستو گفتوگۆو لێکۆلینەوەو کۆبوونەوەی لەسەر کرا لەنێوان خۆیاندا، لەئەنجامی شیکردنەوە دوو بۆچوونیان هەبوو:-

یەکەم:- ئەم بۆچوون و هەلویستانەی نوینەرانی پشدەریان پەسند کرد بەتایبەتی عەبدولرەحمان عارف زۆری لەلاوە گرنگ بوو، بەلام بەبێ جیبەجیکردن خرایە پشت گوێ.

دووەم:- بەختەرناکیان زانی بەم جۆرە جەماعەتی جەلال بەهیز بیت.

*تیبینی/*

بۆ ئەم نەخشەیە میری پەیوەندیم بەجەنابی عەباسی مامەند ئاغا سەرۆك هۆزی ئاکۆ کرد بەلام بەهیچ جۆریك بەپیر ئەم هەلویستەوە نەچوو بەلکوو دژی راوەستا.

٢-هەروەها پەیوەندیم بەجەنابی شیخ لەتیفی شیخ محمودەوە کردو فەرمووی باوی ئەو جۆرە نەخشانە نەماوە ئیستاکە دونیای ئیمرۆ دونیای جەماوەرەو بەتایبەتی داوای کیشەی کورد دەکات بۆ جیبەجیکردنی.

٣-ئەم هەلویستە لەسەرانسەری پوچەڵ بووەوە، خۆم دەوری سەرەکیم هەبوو بەخودیو، ئەوانەی ریگایان پێ نیشان ئەدام ماموستای بەریز ئیبراهیم ئەحمەد بوو.

٤-لەسەر حەسۆ میرخان وعەلی شەعبان میری ئیجگار باش ئاگادار بوون بەلام ئەوەیان نەدەزانی، مەلا مستەفا باسی بارودۆخی ناوچەکەیان بۆ کردبوو هاواری بۆ دەبەن کە لەجیاتی حەسۆ میرخان یەکیکی کەیان بۆ بنریت، چونکە تاوەنەکانی یەجگار زۆر زەقە.

بەڵام وەڵامی مەلا مستەفا هەر ئەوە بوو:_ ناوچەکەتان پیاوی تیدا نییە، ئێوە خراپن هەر حەسۆ میرخان بۆ ئێوە باشە، دووجار لەسەردانی هاوڵاتیانی ناسراودا بۆ لای مەلا مستەفا پێی وتبوون:- ئیستاکە ئەنیرم بەشوینیدا چارەسەری ئەکەمو سزایی ئەدەم یەکێکی کەتان بۆ ئەنیرم.

کە نوینەران ئەگەرانەوە قسەکانی بارزانیان بڵاو دەکردەوە بەخۆشییەوە، راستی ئەی نارد بەشوین حەسۆ، ئەویش دەست کەوتی مانگیکی ئەبرد بۆ ادریس بارزانی کاتیك حەسۆ ئەگەرایەوە لەجاران زیاتر ئازارو ئەشکەنجەی خەلکی ئەداوە دەستی دەکرد بەپارە ککۆکردنەوەو دزیو دادگای خەلكو، ئەو پارەی بەمانگیك کۆی کردبۆوەو دابوییە دەست ئیدریس بەخودای مەزن بەجۆریك تۆلەی خەلکی لی سەندەوە کەئیستا گۆری پیسە تا کورەکانی بچنەسەریی، ئەلی کوریشی بەفەرمانی نیچیرڤان شەری قەلادزیی بەپارە کرد کەسەرەتای شەری ناوخۆ بۆ دوای راپەرینەوە.

## کورتەباسیك دەربارەی

## عەبدولرەحمان و هۆی چارەسەر نەکردنی کیشەی کورد

یەکەم سەرۆك کۆمار کە لە عیراقدا حوکمی عیراقی گرتبیتە دەست هیچ جیاوازییەکی لەنیوان رەگەزی نەتەوایەتی کوردو عەرەب نەکردبیت، ئەم زاتە گەورە بوو، هەموو هەلویستو بیرو باوەرو بۆچوونی ئەوە بوو کیشەکانی کەهەیە بەتایبەتی هی

كورد چارەسەر بكات، بۆ ئەم مەبەستە پشتگیری ئەنجومەنی وەزیرانی جەنابی د.عەبدولرەحمان بزازی كرد بۆ لیكۆلینەوەو وتووویژو چەسپاندنی مافی كورد، ئەویش لەریگای خۆیەوە هەولیكی زۆریداو، لەو كاتەی ژەنەرالەكانی سوپا حوكم یان بەدەست بوو لەپشت عەبدولرەحمان عارفەوە لەبارودۆخی ئەو رۆژەدا وتی:- ئەگەر بەپەنجەی دەست چەكدار لەم شاخانە ببینیت،كیشەكە بەشەر كۆتایی نایەت كاتیك لەزەمانی بزاز ئەمە بلاو بووەوە كەدەبیت كیشەی كورد بەئاشتی جیبەجی بیت، ژەنەرالەكان قین و رقیان لی راگرت، بەجۆریك لەدژی ئەو رۆشنبیرو سیاسەتمەدارە راوەستان، ئەگەر دوورنەخرابایە، لەوانە بوو بەنهینی تیرۆری كەن و، هەمووئەو حزبە سیاسیانەی كەنیازی ئەوەیان بوو بەكودە تا بینە سەر حوكم بەنارەوایی خۆیان دەربری بەنهینی و ئاشكرا لەبزاز مرۆڤیكی كۆنە پەرستەو دەیەویت عیراق بكاتە دوو پارچە،

عەبدولرەحمان عارف وەكو سەرۆكەكانی تر، ژەنەرالەكانی چوار دەوریان گرتبوو زال بوون بەسەر ئیش و كاری توناناى ئەوەی نەبوو بریاری بن بر بدات قرار حاسم بۆ نموونە:- خوالیخۆش بوو جمال عبدالناصر كاتیك لەروسیا دەگەریتەوە بۆ یوغسلافیا ئینجا بەسواری یەخت ئەیەویت بەرەو دورگەی بریۆنی بروات سەردانی تیتۆ بكات، كاتیك لەناو یەختەكە دەبیت ئاگاداری ئەكەن كە لەعیراق كودەتا بووەو لەرۆژی ١٤ی تەمووزی سالی ١٩٥٨، روو دەكاتە محەمەدحسەین هیكل و محمود فوزی ئەلیت رای ئیوە چییە بیدەن، ئایا بگەریمەوە

روسیاو یان بەردەوام بمو بچمە لای تیتۆ، هەردووکیان دینە خزمەتی و ئەلین بریاری وا زۆر گرنگە تەنها سەرۆك بۆی هەیەو بەریزێ دوای چەند بریاری گەرانەوەی دەدا بۆ روسیا، بەلام سەرۆك عبدالرەحمان عارف ئەوەندە بێ دەسەلات بوو بەرامبەر ژەنەرالەکانی ناچار بوو لەهەموو شتیك پرسیاریان لی بکات، هەرچی حزبە ناسیۆنالیستە عەرەبیەکانیشە ئەوانەیان دەویست کیشەی کورد چارەسەر بکریت بەلکو هەموو هەولیکیان بۆ ئەوە بوو کورد لەعیراقدا رەش کەنەوە. بۆیە خودی عەبدولرەحمان عارف تووشی گرفتی گەورە بوو. بۆیە حزبەکان لەهەولی جدی دابوون بۆ ئەوەی بینە سەر حوکمو عەبدولرەحمان عارف لەدەسەلات دووربخەنەوە، بەلام رەحمان پێ وابوو گاردی کۆماری‌و هەموو سەرۆکەکانی دەزگا ئاسایشەکان پشتگیری دەکەن و لەگەلی دان بەتایبەت بروای بەعەبدولرەزاق نایف بوو.

شایانی باسە لەو کاتەدا ناصریەکانیش لەجمو جۆلی گەورە دابوون بەنیازی کودەتا وە پروپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کەئەوان ئەگەر دەسەلات بگرنە دەست دەتوانن کیشەی کورد بەئاشتی چارەسەر بکرێ. هەرچی بەعسیەکانیشە بەهەمان شیوە لەجموجۆلی ئاشکراو نهینی دابوون بۆ هەمان مەبەست، بۆیە سەریان بەهەموو کون‌و قوشبنیك دەکرد بۆ گەیشتن بەم ئامانجە وەدووبارە ئەوانیش پرو پاگەندەی ئەوایان دەکرد کەکیشەی کورد یەکەم گرفت دەبیت کەئەوان دەست دەبەن بۆ چارەسەرکردنی.

لەو ماوەیەدا هەر جموجۆلیکی نهینی دژی عبدالرەحمان عارف کرابا ئەحمەد حەسەن بکر سەرۆکی ئاگادار دەکردەوە، بۆ نموونە:- لەکاتیك، عارف عەبدولرەزاق ویستی کودەتا بکات، بەعسیەکان بەهەموو توانایەکیانەوە پشگیری عەبدولرەحمانیان کرد نەیان هیشت ئەو پلانە سەر بگریت. عبدالرەزاق پاش گیرانی عەبدولرەحمان بریاری بەردانیدا، کەئەمەش نیشانەی لەخۆبردوویی و دل فراوانیەتی.

*تیبینی/*

١-هەموو ئەو هەلویست و پیلانانەی لەسەرەوە بەکورتی باسکردن لەلایەن دەزگاکانی ئاسایشی دەولەتەوە ئاشکراو زانراون، ئەوانیش چ بەتەلەفۆن و چ بەنامە ئاگاداری عەبدولرەزاق نایف، سعدون عدنان، شفیق دراجی، ئیبراهیم داود، عبد الجلیل ئەحمەد یان دەکردەوە، ئەوانیش کەم و زۆر ئاگاداری عەبدالرحمان عارفیان دەکرد کەبارودۆخەکە لە١٠٠٪ لەبەرژەوەندی جەنابیان دایەو ئاسایشی گشتی توانیویەتی کۆنترۆلی هەموو جولەکان بکات. لەشەوی کودەتادا سعات ١٢ عەبدولجەلیل ئەحمەد چووە لای عەبدولرەحمان عارف لەکۆشکی کۆماری و پیی راگەیاند کەئەم شەو کودەتا ئەنجام دەدریت و بەلگەی تەواوم بەدەستە، عەبدولرەحمان عارف وتی ئیمە تەواو ئامادەین.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کودەتاکە ئەنجام دراو سەرکەوتوو بوو، هەموو ئەوانەی لەدەورو پشتو دۆستی عبدرحمان بوون هەر هەموویان بەشداری کودەتاکە بوون تەنها عبد جلیل ئەحمەد نەبێ، ئەویش لەبەر ئەوەی دەستی هەبوو لەناکۆکی و دووبەرەکی نانەوە لە نێوان باڵی مەکتەبی سیاسیو بارزانیدا لەسێدارەیان نەداو بەریانداو، بیستم کەسەدام ئۆتومبیلیکی بەدیاری بۆ ناردبوو.

چەند کەسانێك لەسیاسەت مەدارانی کوردیش لەو کودەتایە دەوریان هەبوو، چونکە وایان دەزانی لاوازی عبد الرحمان عارفە کەکێشەی کورد چارەسەر نابێ، بۆیە گەر دوور بخرێتەوە لەدەسەلات ئەوا زەمینەی چارەسەر دێتە پێشەوە. هەر هەموو ئەو ئەفسەرانەی ئەو تاوانە گەورەیان کرد عیراقیان بەگورگان سپاردو، بەدەستی خۆیان دەسەلاتیان تەسلیم بەبەعس کرد، لەدواجاریشدا خۆیان بەدەستی بەعس تیرۆر کرانو کوژران تەنها ئیبراهیم داود نەبێت کەسەر لەشکری کۆشکی کۆماری بوو، شایانی باسە لەبەرگی یەکەمو دووەم لەزۆر شوێندا باسی عبد الرحمان عارفم کردووە.

٢-دوور خستنەوەی عەبدولرەحمان عارف لەدەسەلات، زیانێکی گەورەبوو بۆ گەلی عیراق بەگشتیو بۆ کورد بەتایبەتی، ئەگەر ئەم زاتە نیشتمانپەروەرە لەسەر دەسەلات مابوایە کورد ئێستا لەبارودۆخێکی تردا دەبوو عیراقیش ئەم هەموو نەهامەتیەی بەسەر نەدەهات.

٢-لە رۆژی روداوی شۆرشی تەمووزی سالی ١٩٥٨ەوە تاکو ئیستای سالی ٢٠٠٠، چوار هەلی گەورە بۆ کورد هاتۆتە پیش بۆ ئەوەی کیشەی کورد بەئاشتی چارەسەر بکری، بەلام بەداخەوە سەرکردایەتی کوردی نەیتوانیوە وەك پیویست کەلك لەو هەلانە وەربگریت، بەلکو زۆر جار بەهەلە مامەلەی لەگەل بارودۆخەکە کراوە وەك چۆن لەگەل عبد الکریم القاسم کراوە. خۆ ئەگەر لەسەردەمی عبد الحمان عارفدا هەردوو بالەکەی شۆرش لەگەل حکومەت گفتوگۆیان کردبا، ئەوا بەدەسکەوتی گەورەوە دەگەرانەوە. بۆ نموونە: کاتیك عبد الرحمان عارف سەرۆك سوپای عیراق بوو چومە خزمەتی لەمالەوە، دوو بەدوو بۆ ماوەی دوو سعات دانیشتین و گفتوگۆمان لەسەر بارودۆخی عیراق کرد پیی وتم: رەفیق ئەگەر دەسەلاتم لە١٠٠٪ لەعیراق بکەویتە دەست، ئەوا دلنیابە کیشەی کورد بەئاشتی چارەسەر دەکەم، چوونکە بەشەرکۆتایی نایت، بەلام ئایا بەرای‌تۆ بارزانی واز لەیارمەتی و کلکایەتی بۆ ئیران و ئیسرائیل دەهینیت، چەند حەز ئەکەم هەر دوولا مام جەلال و مەلا مستەفا پیکەوە بین بۆ لام تا کیشەکە چارەسەر بکەین.

بە گشتی لەناو سەرکردایەتی عبد الرحمان عارف دوو بۆچوون هەبوون بەرامبەر بەکیشەی کورد:

١-خودی عبد الرحمان عارف بەشیك لە ژەنەرالەکانی سوپا وەکو ئیبراهیم فیصل النصاری وایان پەسەند دەکرد و بۆ بەرژەوەندی گشتی عیراق وایان بەباش دەزانی بەهەموو توانایەکەوە پشتگیری لەبالی‌مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مام

جەلال بکەن و پارمەتیان بدەن تا دەسەلاتیان بەسەر هەموو کوردستاندا بگرن، چونکە ئەوانە لەبروای حکومەتدا هیچ پەیوەندیەکیان بەدەرەوە نەبوو.

٢- دەسەلاتی گەورە هی سەرکردە گەورەکانی سوپا بوو کە لە عەبدولرەحمان عارف بەهیزتر بوون کە ئەمانە پییان وابوو ئەگەر جەماعەتی مام جەلال دەسەلات بەسەر کوردستان دابگرن ئەوا هەرەشە لەبەرژەوەندیەکانی عەرەب دەکەن، چونکە ئەمان پارتیکی ریکخراون و لەسەر بیری نەتەوایەتی کۆ بوونەتەوە. لەلایەکیتریشەوە بەم شیوەیە بارزانی ئەوەندە لاواز دەبیت کەخۆی دەکاتە ناو باوەشی شاو ئیسرائیل، سەرۆکی ئەم رایە عبد الرزاق نایفبوو.

بۆیە ئەم رایە نەیهیشت جەماعەتی مام جەلال بەهیز ببن، لەبەرامبەردا جەماعەتی مام جەلال ئاگاداری ئەوە بوون کەگۆرانکاری لەدەسەلات بەریوەیە، بۆیە پییان وابوو هەر گۆرانیك روویدات کیشەی کورد چارەسەر دەبیت.

## کودەتای تەمووزی سالی ١٩٦٨.

لە بەرگی یەکەم کورد دوژمنی خۆت بناسە لەلاپەرە ٦-١٦ باسی ئەوەم کرد کەسەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران عبد الرزاق نایف لە ٣٠/تەمووز/١٩٦٨ لەدەسەلات دور خرایەوە، ئەوەبوو بەعسیەکان دەسەلاتیان گرتە دەست. بەهۆی ئەوەی رابردوو یان ئەوەندە پیس بوو بەرامبەر بەگەلی عیراق و کورد

بەتایبەتەی، لەکاتی گرتنە دەسەڵاتیاندا جەماوەریان ئیکجار کەم لەگەڵ بوو بەتایبەتی کورد، کوردەکان بەپەنجەی دەست دەژمێردران، بۆ نموونە یەك مدیر ناحیەی کوردیان هەبوو لەهەموو ڕیکخراوەکەیان دا.

بەعسیەکان پێش هاتنیان بۆ سەر دەسەڵات پەیوەندی نهێنیان بە هەردوو بالی پارتیەوە (بارزانیو مەکتەبی سیاسی) هەبوو، بەلام بالی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مام جەلال بەجۆریك لەگەڵ رژێمی بەعس لەیەکتری نزیك بوونەوە کەهەلویستی سیاسیان تا رادەیەکی زۆر وەك یەك بوو. سەرەتا جێی سەرسورمان بوو کەبەعسیەکان بەو شێوەیە پشتگیری ئەو جەماعەتەیان دەکردو، بەهەرەشەیان نەدەزانی بۆ سەر خۆیان. بەلام هەر زوو دوای ساڵو نیویك ئەو شهر العسله کۆتایی پێ هاتو گومان کەوتە نیوان هەر دوولاوە.

بەعسیەکان لەکوردستاندا توانییان خەلکیکی زۆر لەدەوری خۆیان کۆ بکەنەوەو، بەجۆریك بەهیز بوون کەتوانییان دەست بخەنە ناو سەرکردایەتی بالی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مام جەلال، بەو نیازەی دوو بەرەکیو ئاژاوە بنینەوە. بۆیە بەئاشکرا پشتگیری تارق ئەحمەد داودییان کرد ( لەبەرگی یەکەم لاپەرە ١٦ باسم کردووە). هەرچەندە بەعسیەکان پیلانو نەخشەیان بەهۆی دەسەلاتە فراوانەکەیانەوە ورد داریژرا بوو، بەلام بۆیان نەچووە سەرو خراپ بەسەریاندا شکایەوە، ناچاری وای لیکردن کەپاکانە بۆ خۆیان بکەنو بلین ئەم کارە ئەفسەریك پیی هەستاوە ئیمە سزای دەدەین. کەوا لەخوارەوە بەکورتی بۆ

خوێنـەری بـەڕێزی ڕون دەکەمـەوە کەهەڵویسـتی مـام جـەلال لەسەرەتادا چۆن بوو لەگەڵ بەعسیەکانداو پاشان چۆن بەپلەی ١٨٠ بای دایەوە بۆ دژایەتیکردنی سەرسەختی بەعسیەکان.

لەسـەر داوای بـرای گـەورەم مـام جـەلال هاتمـە کـەلارو لـەماڵی حەمـەی مـام وەلی کۆبووینـەوە، دوای تـەواوبوونی کۆبوونەوەکـە یەکسـەر گەڕامـەوە بـۆ بـەغداد، لـەوێ چـاوم بەبەشـی زۆری سەرکردە بەعسیەکان کەوت، منیش دەقی قسەکانی مام جەلالم پـێ ڕاگـەیاندن. پێـم وتـن مـام جـەلال بەدەنگـە بەرزەکـەی دەیشیراندو هاواری دەکرد، بەجۆرێك ڕق و قینی هەستابوو وای دەزانـی مـن بـەو کردەوەیـە هەسـتاوم وە دەیگـوت: ئـەمڕۆ مـانگی یەکی‌سـانی ١٩٦٩ە، بەزووترین کات چارەسـەری ئـەو بارودۆخـە نەکـەن و بـەلینمان پـێ نـەدەن ئەوانـەی بـەو ئیشـە هەسـتاون سـزازیان دەدەن، ئـەوا بـەناوی مەکتـەبی سیاسـییەوە پیـان ڕابگەیەنـە کەپشـتیان تێدەکـەین و بەیـەك جـاری پـەیوەندی نیوانمان دەپچڕیت.

دوا بـەدوای ئـەو ئاگادارکردنـەوەی مـام جـەلال بەعسـیەکان ناچـار بـوون هیچی‌تـر دەسـت لـەکاروباری مەکتـەبی سیاسـی وەرنەدەن. بەعسیەکان دوای ئەم ڕووداوە بۆیان دەرکەوت کەمام جـەلال کەسـیکی ئاسـایی نیـەو نـاتوانن فیلـی لی بکـەن و، لەبـەر ئەوەی خودی مـەلا مستەفا پەیوەندیـەکی بەهێزی لەگـەڵ ئێران و ئیسـرائیل داهـەبوو بۆیـە نـەیان دەتوانـی هیـچ دانووسـتانیکی لەگـەڵدا بکـەن. بۆیـە بەناچارییـەوە پشـتگیری بـالی مەکتـەبی سیاسیان دەکرد.

لەناو بەعسیەکاندا بەگشتی دوو بۆچوون هەبوو:

١-ئەوانەبوون کە پێیان وابوو پارمەتی دانی بالی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مام جەلال خەتەریکی گەورە دروست دەکات و لەبەرژەوەندی بەعس دانییە، بەلاّم بارودۆخەکە وادەخوازێ هیچ هەلویستیکی دوژمن کارانەی ئاشکرایان بەرامبەر نەنوینریت. رۆژیکیان بەندە لەگەلّ کادرو دۆستیکی رژیمی بەعس باسی ئەوەم دەکرد کەبۆچی پارمەتی بالی مەکتەبی سیاسی نادەن، تاکو شاخی بەمۆیان بکەویتە ژیر دەسەلاّت و بارەگایان لەو ناوچەیەدا هەبیت، یەکسەر قسەکانمی بری و وتی: ئەمە زۆر خەتەر ناکە بۆ ئیمە کەبارەگایان بکەویتە سەر سنوور.سەدام و ئەحمەد بەکر لەگەلّ ئەم رایە دابوون.

٢-ئەم جەماعەتە پییان وابوو پیویستە حکومەت بەهەموو توانایەك پشتگیری بالی مەکتەبی سیاسی بکات. چونکە لەریگای ئەوانەوە کیشەی کورد چارەسەر دەکریت، ئەوەش لەو بروایەوە کەئەمانە هیچ پەیوەندییان بەهیزە دوژمنکارەکانی دەرەوە نیە، وە دەیانگوت ریککەوتنمان لەگەلیاندا دەبیتە هۆی ئەوەی دوارۆژیکی دیموکراتی و سەربەخۆ بۆ هەموو عیراق دابین بکری و، هەر لەو کاتەشدا دەستی دراوسیکانمان لەناو خاکی عیراقدا دەبرین. گەرچی ژمارەی ئەمانە زۆر بوو بەلاّم بەعس هەر هەموویانی لەسیدارە داو کەسیانی نەهیشت لەسەر هەموویانەوە عبدالخالق السامرائي.

لەپینجی ئازاری مانگی ١٩٧٠ لەمالی ئیمە لەبەغدا لەسەر داوای بەعس لەگەلّ بالی مەکتەبی سیاسی کۆبوونەوە یان

ئەنجامدا، لەدانیشتنەکەدا بەعسیەکان پاکانەیانەکردو دەیان گووت ئەگەر ریکیش بکەوین ئەوا ئیوە بالیکین لەکیشەی کورد. لەشەوی ١١/١٠ هەمان مانگو ساڵ لەکاتیك عیراقی النور لەژیر چاپدا نیوەی چاپکرابوو سەدام داوای لەئەحمەد حەسەن کرد کەدەبیت خودی خۆت ئاگاداری وەزیری رۆشنبیری بکەیت بۆ ئەوەی عیراقکە دەرنەچیت و، زیریش بەتەلەفۆن لەگەڵ مامۆستای بەریز حلمی عەلی شەریفگفتوگۆ دەکاو پیی رادەگەینێ کەفەرمانی راگرتنی عیراقکە لەدەسەڵاتی ئەودا نییەو گەرانەوەی بۆ نیە.

## دەستکەوتەکانی ساڵی ١٩٦٦:

١-زانکۆی سلیمانی کرایەوە.

٢-پاریزگای دهۆك راگەیەنرا.

٣-ئیدارەی دهۆك و سلیمانی و هەولیر تەسلیم بەکورد کرا.

٤-بریار درا کەجەژنی نەورۆز وەك بۆنەیەکی رەسمی کوردی دانی پیدابنری.

٥-ئیزگەی کوردی لەبەغدا لەنیو سەعاتەوە کرا بەبەردەوامی.

٦-دوو قوتابخانە کرایەوە بۆ دەرچوانی شەشەمی ئامادەیی و سێی ناوەندی، ژمارەیەك لەوانەی کەسەر بەبالی مەکتەبی سیاسی بوون وەرگیران.

٧-عیراقی النور کەزمانحالی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو دەرچوو.

٨-گۆڤاری بەیان لەبەغدا دەرکرا.

٩-هەفتانە عیراقی هاوکاریو رونـاکیو رزگـاری سلیمانی دەرچوو.

*تیبینی/*

لەگەڵ صالح مەهدی عەمماش چووینە خزمەت سەرۆك كۆمار ئەحمەد حەسەن بەکر پیم وت: کەچومەوە ماڵەوە بینیم لەبەر دەرگای ماڵمان دوو تەنەکە دانراوە پر کراوە لەخۆڵە میش، ئاگری لێ دەردەچیت.منیش رووم لەدایکم کردوو وتم. ئەوە چییە ؟ لەوەڵامدا وتی ئەوە ئاگری نەورۆزە. وتم ئیمە ماڵە سیخورمان پێ دەڵین ئاگری نەورۆزی چی ! وتی کورم ئیمە هەر چی بین کوردین. لەو کاتەدا صالح عەمماش وتی جەنابی سەرۆك بریاربدە ن لەسەر ئەوەی کەنەورۆز جەژنیکی کوردییە،ئەمەش بەدەست پیشخەری جەنابتان دادەنریت. سەرۆك ئەحمەد وتی: لەگەڵ شەفیق الدراجی لەسەر شیوەکەی ریك بکەون منیش ئیمزای رازی بوونی لەسەر دەکەم. منیش بەدورو دریژی ئاگاداری ماموستای بەریز ئیبراهیم ئەحمەدم کردەوە، پیم راگەیاند کەسەعات ١٠ یان بۆ داناوی بۆ ئەوەی چاوت بەشەفیق الدراجی بکەویت، تا بەیاننامەکە دەربکەین لەسەر ئەوەی کەنەورۆز جەژنی کوردانە، چونکە ئەحمەد حەسەن بەکر رەزامەندی فەرمووە.

## ڕوونکردنەوەیەک لەسەر چەند هەڵویستێکی

## باڵی مەکتەبی سیاسی لە١٩٦٦ەوە تاکو ١٩٧٠/٣/١٠:

١-دەربارەی یارمەتی و کۆمەککردنی هاوڵاتیان: لەیەکەم ڕۆژی پەیوەندییان بەحکومەتی عبدالرحمان و ڕژێمی بەعسەوە، لەهەموو عیراق بەگشتی و بەتایبەت لەکوردستان، بەهەموو توانایەکیانەوە پشتگیری هاوڵاتیانیان دەکردوو دەیان پاراستن. لەهەر شوێنێک مافی کورد پێشێل کرابێت، یەکسەر ئەندامانی مەکتەبی سیاسی چارەسەریان دەکردو دەگەیشتنە سەر ڕووداوەکە. بەتایبەتی لەکەرکوك، هەر کاتێك کێشە لەنێوان کوردو عەرەبی بەعسی دروست ببوایە یەکسەر خودی کاکەعەلی عەسکەری گەیشتۆتە جێی ڕووداوەکەو تاوانباری سزا داوە،

زۆر جار ڕووداوەکە بەجۆرێك پەرەی سەندووە لەکۆشکی کۆماری قسەی لەسەر کراوە. بۆ نموونە لەکەرکوك ئەفسەرێك بەبێ ئیزنی موختاری گەرەك دەچێتە سەر ماڵێك لەگەرەکی تەپەی مەلا عەبدوللە وە ئازارو ئەشکەنجەی خاوەن ماڵ و هاوسەکەی دەدا، کاك عەلی عەسکەری لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك دەچێتە سەر ماڵی ئەفسەرەکە لەرێگای محطة القطار وەتۆڵەی ماڵە کوردەکەی لی دەکاتەوە. هەروەها لەشاری سلیمانی چەند جارێك ئەوانەی سیخوری دەزگاکانی ئاسایشی گشتی بوون، ئازاری خەلکیان دابوو بۆیە خەلکەکە هاواریان بۆ لای خوودی مام جەلال بردبوو، ئەویش بەهێزێکی پێشمەرگەوە

چـوو بـووه سـەر ڕووداوەکـەو گـەورەترین سـزای تاوانبـارانی دابووو، پیی ڕاگەیاندبوون کەریگە نادەین بەهیچ شیوەیەك مافی کورد پیشیلّ بکریت.

ڕووداوەکـانی لـەوجۆرە یـەکجار زۆرن لـەو کاتـەدا. هـەر بـۆ نموونـە: کـاك محمـدی حـاجی تاهـیر لیپرسـراوی سـلیمانی ئاگاداری مام دەکات کەتاوانبار محەمەدحاجی ئیبراهیم چەرمەگا بەهۆی دەزگاکانی ئاسایش‌و سوپاوە بۆتـە خاوەن دەسـەلاّتیکی گـەورەو، ئـازاری خـەلك‌و هاولاّتیـان دەدا بەشـیوەیەکی ئاشـکرا سـەرانە لەبەشـی زۆری بازرگانـەکان وەردەگریـت. مـام جـەلال کەئەم هەوالەی بیست یەکسـەر لەگـەلّ هیزی پیشـمەرگە دەچیتـە سـەر نووسـینگەکەی‌و کـەل‌و پەلـەکانی تیـك‌و پیـك دەشـکینی‌و فرییان دەداتە سەر شەقام‌و لەبەر چاوی خەلك دەیشکینن، بـەلاّم ئیستا ئەگەر بچیتـە قەلاّ چوالانـو هاوار بـۆ مامـە بـەریت ڕەنگـە نەتوانیت بەهاوارتەوە بیت چونکە ئیستا سەرۆکی هەریمە.

٢-لەبارەی‌پەیوەندیـەکانی‌ڕژیمی بـەعس وبـالی مەکتـەبی سیاسـی :ئـەوەی ڕوون‌و ئاشـکرایە کەحکومـەتی عبدالرەحمـان‌و ڕژیمی بەعسی لەیەکەم ڕۆژەوە کۆمەك‌و پشـتگیری بـالی مەکتـەبی سیاسـیان کـرد، بـۆ ئـەوەی لـەریگای پیشـمەرگەکانیانەوە بەتـەواوی دەسـت بەسـەر کوردسـتاندا بگـرن، ئـەم خالـە ڕۆژانـە بنەمالـەو ئەوانـەی سـەر بەخۆیانـە باسـی لیـوە دەکـەن‌و دەلیـن جەماعەتی جەلال تالەبانی لەگەلّ سوپای ڕژیم هیرشـی هیناوەتـە سـەر هـیزی پیشـمەرگە لەسـالی ١٩٦٦. لەدانیشـتنم لەگـەلّ برایانی بەریز د.عەبدوللاّ ئاگرین‌و د. ڕۆژ نوری شاوەیسـی گفتم

پێ دان کە لەکتێبی دووەمدا باسی ئەو شتە بکەم، بەڵام وا لەبەرگی سێیەمدا باسی دەکەم، مەبەستم رۆداوی ٦٦ە.

قەستەم بەخوا، ئەمەی دەربارەی رووداوەکان دەیلێم هەمووی راستە، هەر لەکۆبوونەوە نهێنییەکەی مەلا مستەفا لەگەڵ نوێنەری حکومەتی عەبدولسەلام عارف کاک ـك و پاش هاتنی مەلا مستەفا بۆ حەوزی دوکان و کۆبوونەوەکەی لەگەڵ پارێزگاری ئەوسای سلیمانی حاجی عەبدولرەزاق و هەتا رۆژی ١٩٧٠/٣/١٠، هەموو ئەم رووداوانە دەخەمە بەر چاوی سیاسەتمەدارو رۆشنبیران تا بەبی شێواندن و دەستێوەردان ئاگاداری چۆنیەتیی رووداوو گۆرانکارییەکانی ئەو مێژووەمان بن.

پێشتر بەتیروتەسەلی ئاماژەم بۆ کۆنگرەی قەڵادزی کردبوو کە لەمانگی تەمموزی ١٩٦٤دا بەسترا، ئیستاش بەنیازم ئەو رووداوانە بنووسم کە لەساڵی ١٩٦٦ـەوە هەتا ١٩٧٠/٣/١٠ روویاندا بی ئەوەی هیچیان لی بشارمەوە، هەروەها باسی زالدەستیی مەلا مستەفاو مەکتەبە سیاسییەکەی دەکەم بەتایبەتی لەماوەی نێوان ١٩٦٤-١٩٦٦.

دوای کۆنگرەی قەڵادزێ بەفەرمانی مەلا مستەفا ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هەڵبژێردران، بەڵام نەیان توانی جێگای باڵی مەکتەبی سیاسی بگرنەوە، ئەمانە لەژێر دەسەڵاتی تەواوی بنەماڵە دابوون و کەسیان بۆی نەبوو روو بەروو بەمەلا مستەفا یانمەسعود یان ئیدریس بلێ پشتی چاوت برۆیە. گرتن، بەردان، کوشتن، دزی، داگیرکردنی سەروەت و سامان، ژن هێنان، تەڵاق

دان، گـــەورەکردن و دەولەمـــەندکردن، بـــێ دەســـەڵاتکردن و هـەژارکردن، هـەر هـەمووی تەنـهاو تەنـها بەدەست بنەمالـە بـوو. هـەموو کاربەدەستانیش بەفـەرمانی بنەمالـە دانرابـوون وەکـو: عـەبدول وەهـاب ئەتروشـی و عـەلی شـەعبان و حەسـۆو میرخـان کەناوبانگی تاوانیـان بەهـەموو کوردستاندا بلـاو ببـۆوە، خـەلکی دانیشـتوی حـەوزی دوکـان و قـەڵادزێ و رانیـەو تەویلـەو بیـارەو هـەموو ناوچەکانیتر هاوارو نالـەیان بوو بەدەستیانەوەو شـەوو رۆژ لـە خـواو پیغەمبـەرو شـیخ و مەشـایخان دەپارانـەوە کـە لـە دەستیان رزگاریان ببیت .

بنەماله جیاوازیەکی ئاشکرای دەکرد لەنیوان سۆران و بادینان دا، هەرچـەندە جامانـە سـوورەکان جـل و بـەرگی پیشـمەرگەیان لەبـەر کردبـوو بـەڵام دەسـەڵاتەکە بنەمالـەیی بـوو. بـۆ نموونـە لەسالی ١٩٦٥ لەسەردانی مـەلا مسـتەفا بـۆ ناوچـەی پینجویـن و کۆبوونـەوەی لەگـەڵ ئیرانیـەکاندا بەئاشـکرا لـەگوندی سـاواجی شەسـەد تفـەنگی برنـەوی دار شوشـەی دریـژی ژمـارە ١٧ی وەرگـرت، بـەڵام هـەر هـەمووی لـەحاجی ئۆمـەران بەسـەرئەو بادینیانەیلەگەلیدابووندا دابەش کرد.

مـەلا مسـتەفا ئـەوەندە لـەخۆی بـایی ببـوو پشـتی لەسـەرۆك هۆزەکـان کردبـوو، پیـی وابـوو هـەرچی هـیزی پیشـمەرگەیە پـەیوەندی بەوانـەوە دەکـات بەتایبـەت دوای رووداوی ماوەت.هەرلەوماوەیدا پەیوەندی دەرەوەیان بەهیز کرد،بەتایبەت لەگـەڵ ئـیران و ئیسـرائیل دا. هەرچـەندە هـەولیان دەدا ئـەو پەیوەندییانە بشارنەوە بەڵام هەر ئاشکرابوو، هەموو ئەوانە وای

کردبوو جەماوەر لییان بیزار بێت. بەڵام هەتا مام و حلمی نەهاتنە بەغدای لەگەڵ حکومەت کۆبوونەوەیان نەکردووە ریک نەکەوتن، بنەماڵە نەیان دەزانی جەماوەر چەند لییان بیزارە. دوای ئەوە بۆیان دەرکەوت کەبالی مەکتەبی سیاسی خاوەنی ریکخستنیکی پتەوو هێزی پیشمەرگەیان زۆرەو پیشمەرگە بەپەرۆشەوە پەیوەندییان پێوە دەکات.

کاتیك مام و حلمی دوای کۆبوونەوەکانیان بەئاشکراو نهێنی کەوتنە جیبەجیکردنی نەخشەکانیان لەماوەیەکی کەمدا دەسەڵاتیان بەسەر چەند بارەگایەکی پارتیدا گرت، زۆر ناوچەیان لەپارتی پاك کردەوە یەکەم ناوچە گەرمیان بوو، ئەو بەتالیۆنە بوون کەئەمن ماوەیەك سەرپەرشتیم کردبوو. حکومەتی عەبدول رەحمان عارف و هەموو دەزگاکانی گرنگی زۆریان پێدا بەو دەست بەسەراگرتنی بارەگاکانی پارتی و لایان سەیر بوو کەچۆن جەماوەرو هێزی پیشمەرگە لەهەموو لایەك لییان هاتونەتە دەست، بۆیە داوای لەهەموو قائد فرقەکان کرد کەیارمەتی بالی مەکتەبی سیاسی بدەن، تا وای لی هات پشتگیری و یارمەتیەکان بەئاشکرا ئەنجام دەدرا. ئەوە بەردەوام بوو تا هاتنی رژیمی بەعسیش لەسالی ١٩٦٨، لەدەرەوە وا باس لەکورد دەکرا کەدوو هیز هەیە یەکەمیان بالی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی جەلال تالەبانییەو بەشی زۆری رووناکبیرو مامۆستاو نیشتمانپەروەریان لەگەڵ دایە حکومەتی مەرکەزی پشتگیریان دەکات. دووەم جەماعەت بارزانییەکان بوون، کەئیران بەئاشکرا پشتگیری دەکردن و یارمەتی دەدان هەروەها پەیوەندییان لەگەڵ

ئیسرائیلدا هەبوو. لەکتیبی (*الموساد في العراق ودول الجوار ،ص ٢١٧*) باس لەخودی مەلا مستەفا دەکاو دەلێ: *وربما يرجع السبب الى طبيعة البارزانى نفسه، فقد كان شعبه غير متجانس، ويتكون من قبائل تحارب احداها الاخرى. ان البارزانى هو ابرز زعماء شعبه، لكنه لن ينجح في توحيده لذا بقي زعيما لقبيلة ليس الا*)، لە لاپەرە ٢٠١دا هاتووە (*البارزاني يزور اسرائيل سرا في منتصف نيسان ١٩٦٨* وەلە لاپەرە ٢٠٢دا دەلێ( *فقد اكد كرون وليكوب لرئيس الموساد انه ورغم المساعدات المقدمة للبارزانى لا احد يتوقع ان تؤدى عن فائدة ما*)

هەرچەندە پەیوەندی نیوان بارزانی و ئیسرائیل رۆژ بەرۆژ بەهیزتر دەبوو، بەتایبەت دوای چوونی بۆ ئیسرائیل و زیادبوونی یارمەتی بۆی، بەلام لەناوەوە رۆژ بەرۆژ لاوازتر دەبوو چونکە بالی مەکتەبی سیاسی لەناوەوە هەر دەهات و بەهیزتر دەبوو تا وای لیهات بەشی زۆری شارەکان کەوتە ژیر کۆنترۆلیانەوە، بوونە خاوەنی ٧٠٠٠ پیشمەرگەو ٨٠٠٠ میلیشیات وەبەجۆریك بەهیز بوون کەرژیمی بەعس چاوەریی نەدەکرد. بۆیە رژیم لەهەولٚ دابوو بۆ ئەوەی بیان هینیتە ژیر کۆنترۆلی خۆیەوە.

پیشتر باسی ئەوەم کرد کەرژیم لەریگای تاریق ئەحمەد داودی هەولیاندا ئەو پلانە جیبەجی بکەن بەلام هەروەکو باسمان کرد سەرکەوتوو نەبوو. بۆیە سەدام حسەین و ئەحمەد حەسەن بەکر رق و کینیان لەبالی مەکتەبی سیاسی داگرتو، توانای خۆیان بەگەر خست بۆ لەناوبردنی لەشەوی ١١/١٠

مانگی ئازاری سالی ١٩٧٠. هەرچەندە لەناو حزبی بەعسدا بەشیکی زۆری سەرکردایەتیان ئەمەیان پێ باش نەبوو، بەلاّم دوا قسە لای سەدامو ئەحمەد حەسەن بەکر بوو.

## پەیوەندیەکانم لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی

من یەکەم پەیوەندیم لەگەڵ بالی مەکتەبی سیاسی لەو کاتەوە دەستی پیکرد کەبەریزان مام جەلالو حلمی عەلی شەریف هاتن بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت، لەبەرگی دووەمدا باسی ئەوەم کردوە کەئەوکاتەی لەشاخی بەمۆ بووین کاك حیلمی هەلویستی سلبی بوو بەرامبەرم، بەلاّم لەکوردەواری‌دا میوان خۆشەویستە بەتایبەت کەدوو کەسایەتی نەتەوەکەمان بن.

من ئەو کاتەی تەسلیم بەحکومەت بومەوە، خزمو دۆستەکانمو هاوسێ کانم هاتوو چۆیان نەکردمو ریزیان نەدەگرتم، پیم گەیشتبووە کەدەڵین رەفیق بۆتە سیخوری رژیم. لەکاتێکدا دەزگاکانی ئاسایشو سوپا رایان لەسەر من یەکجار خراپ بوو، گومانیان هەبوو لەمنو پیان وابوو بەفەرمانی بارزانی هاتووم بۆ تیرۆرکردنی کاربەدەستانی رژیم. دوای هاتنی عەبدول رەحمان عارف بارودۆخی من بەرەو باشی چوو لەهەموو روویکەوە وەبووم بەکاسبی مالی خۆم، باری ئابوریم زۆر بەرەو باشی دەچووو، لای خەلك روونو ئاشکرا بوو کەمن خراپەی کەسم ناوێو نامەوێ کەس بەگرت دەمو ئەو نهینیانەی کەدەیانزانم بۆ

رژێم نایان درکێنم. ویژدانم ئاسودەبوو بۆیە هیچ گرنگیم بەپروپاگندەی خەلك نەدەدا.

سەرەتا مە ترسییەکی زۆر گەورەمان هەبوو لەهاتنی مام جەلال و کاك حیلمی چونکە دە ترسام ببنە پیاوی رژێم و رووبەرووی بارزانی بوەستن وەك چەند سەرۆك هۆزیکو، گلەیم لەعەلی پورزام دەکردو پیم دەگوت کەئەو کیشەیە چییە تووشی منت کردووە، بەلام ئەو لەوەلامدا دەیگوت ئیوە خراپ لەکیشەکە گەیشتوون وەبەخۆرایی خۆتان خراپ مەکەن چاوەرێی ئاخرەکەی بکەن. لەرۆژی سیهەم نوینەرانی بالی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ نوینەرانی سەرۆك عەبدول رەحمان عارف کۆبوونەوە، دەستیان کرد بەگفتوگۆ. نوینەرانی حکومەت ئەم سێ کەسە بوون کەقسەیان دەکرد عەبدول رەزاق نایف و شەفیق الدراجی و عەبدول جەلیل ئەحمەد بوون، عەبدول رەزاق بەشی زۆری پرسیارەکانی دەکرد بەلام لەوەلامدانەوەدا هەرسیکیان یەك را بوون. پرسیارەکانی حکومەت کورت و پربوون، باسی لەهیزی بارو دەکرد، دەیان پرسی هۆی چیبوو مەلا مستەفا هیرشی هینایە سەرتان لەماوەت؟ بۆچی بەرەنگاری رانەوەستان و هەلاتن بۆ ئیران ؟ بۆ پەناتان بۆ عیراق نەهینا؟ هیزی چەکدارتان بەژمارە چەندە؟ چۆن دەتوانن بەرامبەر هیزی بارزانی رابوەستن ؟ ئایا سەرۆك هۆزەکانتان لەگەلەو جەماوەر پشتتان دەگریت و چیتان لەئیمە دەویت ؟ وە لەوەلامدا وتیان ئیمە بەدلیکی پاکەوە هاتینە لاتان، ئیمە نوینەری مەکتەبی سیاسین و دەمانەویت لەگەڵ حکومەتدا کیشەی کورد بەئاشتی

چارەسەر بکەین، نەهاتووین ببینە چەکداری ئیوە دژی بارزانی، ئایا براۆاتان وانیە کەکیشەی کورد پیویستە بەئاشتی چارەسەر بکریت ! هەتا ئیوە بیر لەهیز بکەنەوە ولاتانی دەرەوە بارزانی بەهیز دەکەن ئیمە پیویستیمان بەیارمەتی ئیوە هەیە، پیویستە ئیوە دان بەمافی کورد دابنین بەو شیوەیە هەم بارزانی نامینیٚ و هەم کیشەی کورد چارەسەر دەکریت، مەلا مستەفا بەیارمەتی ئیوە هیرشی هینا بۆ سەر ئیمە بۆیە ناچار بووین بەرەو ئیران هەلبیین.

نوینەرانی حکومەت بەوریاییەوە گوییان بۆ قسەی نوینەرانی مەکتەبی سیاسی شل کردبوو، مامو حلمی پییان وتن: خۆشحالٚ دەبین کەپیش ئەوەی لەگەلٚ سەرۆك عەبدول رەحمان عارف کۆبینەوە رای ئیوە بەراشکاوی بزانین.

نوینەرانی حکومەتیش وەلامیان دانەوەوتیان پیمان باشە ئیمە گویمان لەرای ئیوە بیٚ.

مام رووی کردە منو وتی: رەفیق ئیستاکە داواکاریەکانی ئیمە قبولٚ دەکەن، من زۆر کوبوونەوەی ئاوام بینیووە بەلام بەیانی رایان دەگۆریت، بچۆ قسەیان لەگەلدا بکە پیان بلیٚ با ئەو پانزە دۆستەی ئیمە لەزیندان بەردەن تا بروایان پیٚ بکەین.

رژیم یەکسەر بریاری بەردانی دان. بۆ ئیوارە سەعات چوار، مام وتی باکەس نەزانیٚ ئیمە لیرەین بۆیە هەر خۆت سەرپەرشتی ئەم کارە بکە.

یەکیك لەو برا بەریزانە د. فوئاد بابانبوو. من تا نزیکەی یەکی شەو مامەوە، هەر هەموویان ناردنەوە مالەی خۆیان.

پاشان خۆم گەرامەوە مالەوە، بەپیکەنینەوە چومە ژورەوەو وتم ((ان بعض الظن اثم))ئەوجار بەدوورودریژی هەموو رووداوەکەم بۆ مالەوەمان گیرایەوەو داوای لیبوردنم لەعەلی پورزام کرد لەوەی کەپیشتر پیم وتبوو، چونکە من هەلە بووم.

ئەوەی پالی پیوەنام بۆچوون و بیروباوەرەکانم بەو شیوەیە بگۆرم، ئەوە بوو کەیەکەم جارم بوو ببینم مام جەلال و حلمی لەگەل خەلکانیکی نەناسدا کۆببنەوەو باس لەبابەتی سیاسی بکەن. ئەم دیدارە ئەوانی وەك دوو مامۆستا هینایە بەرچاوم کەموحازەرە بەچەند خویندکاریك دەلینەوە، دووانیان سیاسەتمەداری ناسراوبوون ئەوانیش شەفیق ئەلدەراجی و عەبدولرەزاق ئەلنایف بوون. مام جەلال و حلمی کیشەی کوردیان بەشیوەیەك شیکردەوە کەروونیان کردەوە تاکە ریگەی بەرەنگاریکردنی ئەو حکومەتانەی یارمەتی بارزانییان دەدا، بەتایبەتی رژیمی شای ئیران و ئیسرائیل ئەوەیە کەبۆ هەتا هەتایە واز لەمەسەلەی بەکارهینانی هیز بهینریت و، ددان بەمافە نەتەوەییەکانی کورددا بنیریت و بۆ چارەسەرکردنی ئەم کیشەیە دانایی و زانایی بخریتەکار.

پاش ئەم کۆبوونەوانەی مام جەلال و کاك حلمی لەگەل حکومەت، بەغدایان جی هیشت و گوسم بوون. کاتیك کەتەشریفیان لەپرا پەیدابوون و هاتنە نوسینگەکەم لەبەغدا، لەگەل جەنابی برای گەورەم مامۆستا عەبدول رەحمان زەبیحی و چەند پیشمەرگەیەك بوون، بەلام ئەم جارەیان بەئاشکرایی. کە لەنزیکەوە لەهەلویستی برایانی مەکتەبی سیاسی گەیشتبووم

بۆیە یەکسەر چوومە بەردەمیان راوەستام و وتم: من لەپیناو ڕزگارکردنی کوردستان خۆم بەخت ئەکەم، باوەری تەواوم بەئیوەی ئازیزو بەریز هینا. لیرەرا هەرچی هەمە لەخزمەت ئیوە دایە نوسینگەو تەلەفۆن و ئۆتۆمبیل و سەروەت و سامانم وەچیم پی دەسپیرن بۆتان جیبەجی دەکەم.

لەکاتی ریککەوتنی نیوان بالی مەکتەبی سیاسی و حکومەتی عبدول رەحمان عارف بەریز ئیبراهیم ئەحمەد لەتاران نیشتەجی بوو لەسەر بریاری مەکتەبی سیاسی، دوای ئەم ریککەوتنە جەنابیان گەرانەوە بەغدا. لەو کاتەدا منیش گەیشتمە خزمەتی وە بەخیرهاتنمکردن. دوای ١٠ رۆژ پییان راگەیاندم کەجەنابیان لەمالەوە چاوەریم دەکا، کەگەیشتمە خزمەتی فەرمووی برادەران بەگشتی باسی چالاکی و هەلسوراویت دەکەن، لەیەکەم رۆژەوە کەگەیشتومەتە بەغدا باسی دلسۆزی تۆ دەبیستم. بۆیە کۆمەلیك پرسیارم هەیە دەبیت وەلامم بدەیتەوە، کیشەکانت چییە؟ سەروەت و سامانت چییەو مانگانە چەند بەشت دەکات ؟ پەیوەندیت چۆنە لەگەڵ حکومەت وکامیان دیاری وەردەگری ؟

منیش وەلامی یەکە یەکەی پرسیارەکانم دایەوە بەراست گۆیی. بۆیە وتی لەم سەعاتەوە یەکسەر پەیوەندیت بەخودی منەوە دەبیت بەبی من یەك هەنگاو نانییت، رۆژانە لەمالەوە بم یان لەبارەگا دییتە لام، لەئیستاوە پەیوەندیت لەگەڵ کاربەدەستانی میری بەتایبەتی ....... بەهیز دەکەی، لەدیاریەکی ٢٥٠ فلسی تاکو ٢٥٠ دیناری بۆت هەیەو با کەسیش پیی نەزانیت، چیت سەرف کرد وەرە یەکسەر بۆت

سەرف دەکەمەوە، تکام وایە هیچم لێ مەشارەوە، لەم رۆوە تۆ مانگانە سی دینارت هەیە.لەم سەعاتەوە بۆ هەر دەعوەتیك بچم تۆ لەگەلمدا دییت و وەکو ئیمە رەفتار دەکەی وەهەوڵ دەدەین هەر گیراویکمان هەبیت لای رژیم لەریگای تۆوە بەری بدەین، بۆ ئەوەی خەلکی وەکو ئیمە دلسۆزی تۆ بۆ کورد بزانن.

بەهۆی ئەوەی گوێ رایەلی تەواوی ئیبراهیم ئەحمەدم دەکرد لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە ریزی زۆرم لی دەگیراو وردە وردە لەناو رژیمیش بووم بەسەنتەریکی گرنگ، لەلایەن خودی عارف ەوە کۆبوونەوەی زۆرم کردو گفتوگۆی زۆرمان کرد، لیپرسراوەکانی تریشم بەدیاری دەم چەور کرد، دایکم زۆر گلەیی لی دەکردم چونکە زۆربەی شتە بەنرخەکانم کرد بەدیاری لەوانە پینج فەرشی ئیرانی کەنرخەکانیان لەنیوان ٩٠-١٦٠ دینار دەبوو. وای لیهاتبوو سەدام وتبووی زۆربەی ئەو مالانەی کەچوومەتە لایان دیاری رەفیق پشدەری لی بووە، پیشتر من دەمزانی کەدەسەلاتدارانی بەعس بەپارە هەموو شتیك دەبەخشن و زانیاری زۆر گەورە ئاشکرا دەکەن، هەر بۆیە نامەم بۆ مەسعود بارزانی ناردو داوام لی کرد یەك دوو ملیۆن دینارم بۆ بنیریت تا زانیاریان بۆ بنیرم، بەلام ئەو هیچ وەلامی نەبوو.

من بەرادەیەك لەگەل سەرۆك کۆمارو کاربەدەستە گەورەکانی رژیم تیکەل ببوم کەخودی خۆیان لیم کەوتبوونە گومانەوە، رۆژیکیان عەبدول خالق السامرائی وتبوی ئیوە چۆن بروا بەرەفیق پشدەری دەکەن، ئەو کابرایە کارمەندی دەزگای موخابەراتە. زۆر جار کە لەگەل برایم ئەحمەد دەچوومە لای

وەزیریك من دوای برایم ئەحمەد ئەهاتمە دەرەوە، کەلییان دەپرسیم بۆ دواکەوتی راستیەکەم پێ دەگوتن. شەویکیان سەعات دوانزە جەنابی رەجەب عەبدول مەجید جیگری سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ ئاگاداری کردم کەبەیانی دەچینە باکوری عیراق، سەعات یەکی شەو چومە خزمەت مام جەلال خەوتبوو، پرسم پێ کرد بۆ ئەم سەردانە، تا رازی نەبوونەچوم لەگەلیا.

## رووداوەکانی دوای بەیاننامەی ئاداری ۱۹۷۰

## (لەسەر بریاری مام پەیوەندیم بە بارزانیەوە کرد)

لەدوای بەیانی ئازاری ۱۹۷۰ بارودۆخی ولات گۆرانی گەورەی بەسەردا هات، بارزانی بوو بەدۆستی نزیکی بەعس و هەموو هیزو توانای لەخزمەتی بەعسدا بوو، بەعسیەکان دەیان وت بارزانی هی ئیمەیە. ئەمانە وای کرد مەکتەبی سیاسی بچن لەگەل بارزانی دابنیشن و ریك بکەون بۆ بەرژوەندی گەلەکەمان، منیش چاوەروانی ئەوەم دەکرد وەکو ئەندامەکانیان هاتووچۆی بارزانی بکەم بەغدا بەجی بهیلم و بەرەو کوردستان بگەریمەوە،

کاتیك برادەرانی مەکتەبی سیاسی هاتنە لام پییان راگەیاندم کە لەگەل مەلا مستەفا باسی تۆمان کردووەو وتومانە پەیوەندیەکی پتەوی لەگەل لیپرسراوانی حکومەت داهەیە، بارزانی ئەمەی زۆر پیخۆش بووەو حەزی کردوەو بیتە خزمەتت. مەلا مستەفا پیی وتبوون: پیم باشە رەفیق لەبەغدا بمینیتەوەو،

پەیوەندی هەر بەبرایم ئەحەمەدەوە هەبێت. برایم ئەحمەد کەهاتە لام پێی وتم: رەفیق من بەرژەوەندی تۆم دەوێت، مانەوەی تۆ لەهەموو رویەکەوە سوود بەخش دەبێت، لەدوارۆژدا خەڵك دەستت بۆ درێژ دەکاو دەڵێن: ئەمەیە رەفیق پشدەری، بۆیە بیری لێ مەکەوەو بەقسەم بکە وتم مامۆستا ئەگەر بەگەورەیی خۆت لێم قبوڵ بکەی بەهیچ جۆرێك من رازی نیم لەفەرمایشتەکانت دەربچم، بەڵام مانەوەم لای حکومەت جێی گومانەو، خەڵکیش تانو تەشەرم لێ دەدەن، جگە لەوەماڵەوەمان بەتایبەت دایكو کەماڵی برام رازی نین لیرە بم، بۆیە تکا دەکەم یارمەتیم دەیت بیمەوە کوردستان.

ووتی: گومانت نەبێت لەمن کەتەنها بەرژەوەندی تۆم مەبەستە، راستە ئەم رێگایە زۆر سەختە بەڵام لەو ماوەیەدا شارەزایی باشمان لەتۆوە پەیدا کرد، بۆیە دڵنیام سەرکەوتوو دەبێت، ئەم کارە بۆ خۆتو خانەوادەکەتو دواجار گەلەکەت سودیکی گەورەی هەیە. هەروەها وتی لەم رۆوە پەیوەندیت پتەوتر بکە لەگەڵ حکومەتو، دڵنیا بەلەخۆم زیاتر کەسیتر بەم کارە نازانێت لەنیوان ئیمەشدا جفرەیەکدا دەنیم کەبەس خۆمو خۆت تێی بگەین، ئەم قسانەی مامۆستا وای کرد قەناعەت بینم. بۆ ئەم مەبەستە نەخشەیەکی تازەم دارشت. سەرەتا لەهەموو ئەو کەسانە دوور کەوتمەوە کە لەحکومەتدا دەسەڵاتدار بوونو سەر بەمەکتەبی سیاسی یان بارزانی بوون، هەموو پەیوەندیەکم لەگەڵ شۆرشدا پچران.

جماعەتی مەکتەبی سیاسی بەغدایان جێ هیشتو من بەتەنیا مامەوە، ئەمە وای کرد حکومەت گومانی لیم کەم بێتەوە، بەلام کوردو نیشتمانپەروەرەکان لیم کەوتنە گومانەوەو، لەناو خۆیان دەیان وت رەفیق سیخوری رژیمەو پیاوی میریە، منیش لەبەرخۆمەوە دەمووت گرنگ ئەوەیە من خزمەتی شۆرش دەکەم، چش لەوەی خەلکی نەزان دەیلێ، ئێستا هەزار سوپاسی یەزدانی مەزن دەکەم کەتوانیم لەو رێیەوە خزمەتی گەورەی گەلەکەم بکەم. •

دایکمو کەمالی برام سەرەتا زۆر گلەییان لی دەکردمو دەیان وت بۆ لەگەڵ جەماعەت نەچوویتەوە کوردستان، بەلام هاتووچۆی بەردەوامی نوینەرانی سەرکردایەتی شۆرش بۆ مالەوەمان لەبەغدا تیگەیاندن کەرەفیق لەپیناوی کوردو کوردستان ماوەتەوە.

پاش یەکگرتنەوەی بالی مەکتەبی سیاسیو بارزانی، زۆر لەسیاسیەت مەدارو روناکبیرانی کورد بەدەسکەوتیکی گەورەیاندا دەنا، هەموو کوردەکانی دەرەوەو ناوەوە پییان وابوو کەبارزانی دەسەلاتی شیاو دەبەخشیت بەبرادەرانی مەکتەبی سیاسی، بەلام بەپیچەوانەوە بارزانی بەپیی عەقلە عەشایرەکەی خۆی هەموویانی خستە ژیر چاودیری پاراستنەوە، کەئەمە بۆ بەعسیەکان جیگای دلخۆشی بوو.

ئەمە گەلی کوردی لەتواناو لیهاتوویی خەلکانیکی وەکو مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، عەلی عەسکەری، نوری شاوەیسی، نوری ئەحمەد تەها، جەلال تالەبانیو عومەر مستەفا عومەر

دەبایە بی بەش کردو ئیتر بەعسییەکان لەخۆشییان خەریک بوو شاگەشکە دەبوون.

## دیداری دووانەی نیوان منو مام جەلال

بۆ ئەم مەبەستە مام جەلال داوای لی کردم کەپەیوەندی بەمەلا مستەفاوە بکەم، بۆ ئەوەی ریگا چارەیەك بدۆزینەوە وەپیی وتم بەباشی دەزانم لەریگای خۆتەوە یەکسەر پەیوەندی بەخودی مەلا مستەفاوە بکەی لەپیناو پاراستنی بەرژەوەندی ولاتەکەمان، چونکە تۆ لای بارزانی ناسراویتو دۆستو دوژمن گومانی نیە لەدلسۆزی تۆبۆ ئەم گەلە، ئەم جارە ئەمریکا نیازی وایە بارزانی بکەن بەحکومەت، لەبەرگی یەکەم لاپەرە ٤٤ باسی ئەوەم کردوە. ئەوجار من بەتەنیا بیرم لی کردەوە، زۆر شتم لا ئاشکرا بوو لەوانە، من پەیوەندیم بەمامۆستا برایم ئەحمەدەوە بوو بەدلنیایشەوە بارزانی گومانی لەمن هەیەو حەزی بەوپەیوەندییە نییە، ئینجا هۆی قسەکەی برای بەریز مام جەلالم لیکدایەوە کەوتی: بارزانی بروای بەجەلال تالەبانیو جەماعەتەکەی نییە.

بۆیە لەدلی خۆمدا دەمووت ئایا دەبیت بارزانی براوی بەوە بینی کەمن پەیوەندیم بەشۆرشەوە بووە لە لاپەرە ٣٦-٣٧ باسی ئەوەم کردووە کە لە١٩٦٦ـەوە هەتا ١٩٧٣ پەیوەندییم بەبارزانییەوە لەریگەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدەوە بوو، کەسیش بەم پەیوەندییەی نەزانیوە.

بەرەبەیانیك سەردانی کاك عەبدالوەهاب ئەتروشیم کرد لەبەیروت، لەهۆتیل مارتینز، ئامادەییم نیشاندا کەپەیوەندی

بەشۆرشەوە دەکەم، بەڵام هەر دوو دل بووم. کاک عەبدولوەهاب خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی و وتی بارزانی ئاگادار دەکەمەوە.

کەگەڕامەوە بەغدا خاتوو زەکیە ئیسماعیل هاتە لام*، دەستمان کرد بەگفتوگۆو لێ کولینەوە، پێم وت کەئامادەییم تێدایە گیانی خۆم بەخت بکەم لەپێناو رزگارکردنی کوردستان بەسەرکردایەتی بارزانی، ئەویش خۆشحاڵی خۆی نیشانداو وتی ئەمە خزمەتێکی گەورەیە لە لاپەرە ٤٤ ی بەرگی یەکەم باسی ئەوەم کردووە..

ئافرەتەکە وتی: بەیانیەکەی ئەچم بۆ خزمەت بارزانی، هەندێ پارەت دەدەمی هێلکەی پی بکرە چونکە لەحاجی ئۆمەران هێلکە نییەو لەبەغداش کەمە، ئینجا لەگەڵ نامەکەتدا وەکو دیارییەکی خۆت دەیبەیت، منیش پێی دەگەیەنم و پێی دەڵێم رەفیق دەبێت پەیوەندی بەخودی تۆوە بێت، چونکە رەفیق لەپاراستن دڵنیا نیە. جگە لەوەی بەگشتی پاراستن لەم جۆرە کارانەدا جێی بروا نییە.

* خاتوو زەکیە ئیسماعیل: ئافرەتێکی رشنبیرو سیاسەتمەداری ناسراوە لەعیراق و لەوڵاتە عەرەبیەکاندا. بەداخەوە دوای هەرەسی شۆرشی کورد ١٩٧٥ هەلویستی سیاسیی گۆڕاو رێگەی خزمەتکردنی رژێمی عیراقی گرتەبەر کەبەزۆری من وای بۆ دەچم ئەمە لەلایەکەوە هۆی کاریگەریی حەبیب محەمەد کەریم بوویێت لەسەری کەخستیە سەر ئەم رێگەیە، یان هۆی ئەوە بوویێت کاک مەسعود بارزانی ئەم رۆڵەی پێ سپاردبێت تا هاوکاریی بەعس بکات بۆ راپەراندنی کاروباری تایبەتی رۆژانەی خۆی.

لە لاپەرە ١١٠و١١١ی بەرگی یەکەمی کتێبەکەمدا باسی ئەوەم کردووە کەهێلکەکە سێ کارتۆن بوو بایی ٢٦,٦٠٠ دینار بوو، دامەدەست خوشکە زەکیە ئیسماعیل حەقیو وتم سڵاوم بەسەرۆك بگەیەنەو ئەم هێلکانەش لەمنەوە دیارییە.

***تێبینی***

١- لەجیاتی ناوی خۆم ناویکی نهێنیم بۆ خۆم دانا بەناوی بەیروت مارتینز، تەنها بەندەو کاك مەسعود ئەوەمان دەزانی. بەڵام سەیر ئەوە بوو دامودەزگا ئەمنییەکانی حکومەت پێیان زانیبوو! باشە چۆن؟!

٢- من سەرەتا لەریگەی شەفیقی برامەوە پەیوەندیم بەنووسینگەی بارزانیەوە کرد لەلاپەرە ٤٥ی بەرگی یەکەمدا ئەمەم روون کردۆتەوە.

٣- من لەیەکەم رۆژی پەیوەندیم لەگەڵ بنەماڵەوە ئاگاداری مامۆستائیبراهیمو عومر دەبابەو مام جەلال م کرد، هەرچەندە مەسعود بارزانی لەنامەکانیدا پێی دەووتم کەنابیت مام جەلال ئاگاداری هیچ بیت. برادەرانی مەکتەبی سیاسی خۆشحاڵ بوون بەوەی کەپەیوەندیم بەبنەماڵەوە هەیە، مام جەلال پێی وتم: من خۆم ئاگادارم کردی کەرۆژیك زووتر پەیوەندییان پێوە بکەی باشترە.

لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی ئەوەم کردبوو کە سەدام حسین لە دیداریکدا (١٩٧٦/٩/١١) رایسپاردم کە مام جەلال تیرۆر بکەم بەڵام لەبەر ئەوەی رازی نەبووم ئەو فەرمانە جێبەجێ بکەم فەرمانی دەستگیر کردنم دراو لە بەرواری

١٩٧٦/٩/١٤دا بەفرمانی سەدام بەبی ئەوەی دادگایی بکریم ماوەی نزیکەی ٢٠ مانگ زیندانی کرام. لەوماوەیەدا بەجۆریك ئازارو ئەشکەنجەدرام واملیهاتبووخوین و میزم تیکە لببو. لەم ماوەیەدا سی جار کەسوکارم هاتن بۆلام ولەژیر چاودیری پیاوانیئەمندا هەرجارەی سەعاتیك لام دادە نیشتن، تەنیا جاریکیش بۆ ماوەی چوار دەقیقە لەگەل دایکم بەتەلەفۆن قسەم کرد. ئەم جارەش هەرلەژیر چاودیری ئەمن دا. لەم ماوەیەدا ئەوەی بەرامبەرم کراوە هیچ یاسایەکی سەماوی ودنیایی پیی رازی نابیت جگەلەیاساکەی سەدام حسەین.

پاش ئەو بیست مانگە حوکم درام بەبیست سال و رەوانەی بەندیخانەی ئەبوغریب کرام (سەیری ل ١٠٢ ــ ١٤٣ ی بەرگی یەکەم بکە کە بە دوورو دریژی ئەم باسەی تیدایە). هەزار ملیۆن سوپاس بۆ یەزدانی مەزن لەدۆزەخە رزگارم بوو. دوای ئەوەی حوکم درام بۆ بەیانی یەکەمی رەوانەی بەندیخانەی أبوغریب کرام لەگەڵ شفیق ی برام کەگەیشتینە بەندیخانە مالە وەمان ئاگادار کرد. لەژووری پیشوازی سی رۆژ ماینەوە، ئەم ژوورە دەرگاکەی لەدەرەوە ئەکرایەوە.

## بەندیخانەی سەدام

بیست مانگ لەخزمەتی پیاو کوژەکانی سەدام حسەین دابووم، لەگەڵ ئەو شوینە تازەیەی کەبریار وابوو بیست سالی تیا بەرینە سەر ئەوەندە جیاوازی هەبوو لەنیوانیاندا کەبەم دوو نموونە کۆتایی پێ دینم: جیاوازی پلەی سەرمای شاخی قەندیل و گەرمای شاری بەسرە چەند ئەوەندەش جیاوازی هەیە لەنیوان ئەم دوو شوینەدا لەهەموو رویەکەوە. بیست سالەکەی ئیرەم لەمانگیکی میوانداریيەکەی دکتاتورم پێ خۆشترە.

بەریوەبەری بەندیخانە ئەفسەریك بوو بەپلەی عەقید کە لەبەر ئەوەی نەبیبوو بەبەعسی بۆ ئەو شوینە دوور خرابۆوە، بەلام عەرەبیکی قەومی بوو. دووجار بۆ لیکۆلینەوە داوای کردم، جاریکیان پیی وتم: ئەگەر شتیکت شاردۆتەوە لەنهینییەکان ئاگادارم بکە، لەپاداشتی ئەوە لەژووریکی تایبەتی دات دەنیم و لەو خەلکە خراپە دوورت دەکەمەوە. دوا بەدوای ئەو عریف جواد هاتوو ئەویش هەمان پرسیارو گفتوگۆی لەگەڵ کردم بەلام ئەمەیان سەربە موخابەراتی گشتی بوو. لەوەلامی هەردووکیاندا من وتم: لەدادگای شۆرشدا دانم بەهەموو تاوانەکانم دانا وەو داوام کرد دوای ٤٨ سەعات لەسیدارەم بدەن، بەلام بەفەرمانی جیگری سەرۆك صەدام حوکمەکەم کرا بە ٢٠ ساڵ زیندانی. ئەوەم وت و لەدلی خۆمدا گالتەم بەعەقلیان دەکرد و دەم وت خوا عەقڵ بدات بەمندالەکانتان. دوای ئەوە بەریوەبەری ئاسایشی

بەندیخانە ئیمەی بردە هۆلی ژمارە - ٣- کەهۆلی تاوانبارەکان بووی وتی: ئەم هۆلە ژووریکتان بۆ چۆڵ دەکەم تا ئیوە بەتەنیا تییدا بخەون، وە با ئەوانی‌تر لەهۆلەکەدا بنوون. بەلام من هۆلەکەم پێ باشتر بوو لەعەزیەت دانی زیندانییەکان. دوای رۆشتنی بەریوەبەر بۆ ماوەی ١٠ دەقە هەموو زیندانییەکان هەر سەیریان دەکردین. منیش رووم کردە زیندانییەکان‌و وتم: برایانی کۆمەلە لەسەر ئیوە زۆریان لیداوم، من رەفیق پشدەریم‌و ئەوەش شەفیقی برامە. برایانی کۆمەلە بەپیرمانەوە هاتن‌و بەگەرمی پیشوازیان کردین‌و خۆشحالی خۆیان دەربری کەئیستا ماوم‌و لەگەلیان دام.

## دیدارو سەردانەکانی ناو زیندان

لەیەکەم رۆژەوە خەلکیکی زۆر دەهاتنە لامان، بەجۆریک کەکاتمان نەبوو لەگەڵ کەسوکارمان قسە بکەین ئەوەش لەبەر ئەوەی وا بلاو ببۆوە کەئیمە کوژراوین. چونکە ماوەی شەش مانگ بێ هەوال بووین .

من لەسالی ١٩٦٦ەوە تا بەرواری ١٩٧٦/٩/١٣ هەر کەسیک هاتبیتە مالم بەدەست بەتالی‌و نائومیدی نەم ناردۆتەوە. هەر لەو ماوەیەدا زیاتر ٢٠-٢٥ کەسم لەسیدارە رزگار کردوەو، رەنگە ژمارەی ٥٠٠ کەسم بەردابیت‌و ١٠٠ کەسیشم دەولەمەند کردبێ. هەر هەموو ئەوەش بەبێ بەرامبەر. بۆیە لەکاتی لیقەومانمدا ٧٠٪ ی ئەو چاکەیە هاتەوە ریگام، خەلکیکی زۆر

لەکاتی سەردانمدا بەدیارییەوە دەهاتن منیش هەموویم بەسەر هاورێ زیندانییەکانم بەبێ جیاوازی دابەش دەکرد.

زیندانی ئەبو غریب یەکێکە لەزیندانییە گەورەو ناخۆشەکانی رژیمی بەعسی عیراقی، بەجۆرێك کە لەناوەوەیدا چەندین کەسی شۆرشگێرو رۆشنبیری تێدایە. وا لەخوارەوە هەندێك لایەن و بەشی ئەو زیندانییە باس دەکەم:

١-بەشی گرتووخانە قسم الموقف: ئەم بەشە بەناو سەر بەبەندیخانو بوو بەڵام لەراستیدا سەر بەئەمن و موخابەراتی گشتی بوو.

بەریوەبەری بەندیخانە لەبەر ئەوەی بەعسی نەبوو حەزی بەئەمن نەدەکرد، بەڵام ناچار بوو فەرمانەکانیان جێبەجێ بکات. رۆژانە دووجار سەر ژمێری دەکراین، هەفتانە لەکاتی سەر ژمێریدا سێ جار بۆ ماوەی دوو سەعات لەبەر گەرمای هاوین یان لەبەر سەرمای زستان رایان دەگرتین، گوایە یەکێك دیار نییە. هەر لەو بەشەدا عیراقی الثورة یان بۆ دەخوێندینەوەو باسی هەڵویستی حزبی بەعسیان بۆ دەکردین. هاتووچۆو سەردان لەو بەشەدا زۆر زەحمەت بووو، زوو زوو بەناوی جمووجۆلی سیاسی یەوە ئالوگۆریان پێ دەکردین لەناو هۆڵەکاندا کەئەوە بۆ ئیمە زۆر ناخۆش بوو. لەهەمان کاتدا لەو بەشەدا چوار کەسی تری تێدابوو کەزۆر بەخراپە لەگەڵ مان دەجولانەوە کەبریتیی بوون لەمأمور هادی، عریف جواد، فلاح، عبدالسادة. بەندکراوەکان نزیکەی ١٠٠٠ کەس دەبوون، لەوانە ٦٠٠ کەسیان کورد بوون لەناو کوردەکانیشدا ٣٠٠یان لەسەر

سیاسەت گیرابوون.هەرچی بەندکراوە عەرەبەکانە تەنها سێ کەسیان ڕێك و پێك بوون حەسەن مستەفا، ابو زهیر-کە کاتی خۆی ئامر کولیەی عسکری بوو لەسەر حزبی شیوعی گیرا بوو، عەزیز عقیلی*. ئەوەی سێیەمیان کاتی خۆی وەزیری بەرگری بوو، پێشتر بەهۆی عقید عەزیز تۆفیق یەکترمان ناسیبوو. بەجۆرێك لەگەڵ عقیلی تێکەڵ بووبووین و ببووینە هاوڕێ کاتێك کەبەربووم و خواحافیزیم لێ خواست گریا. کاتێك کەپێم وت ابو عقیل بۆ دەگری وتی: لەبەر دوو هۆ دەگریم یەکەمیان لەناو زیندانیدا کوردم ناسی، کاتێك ئازای و فیداکاری ملازم جوامێرم بینی خۆم لەبەر چاو کەوت.

دووەمیش ئێستا تۆو کاکە شەفیق دەڕۆن و بەتەنها جێم دێلن. وتم بەڵام ٤٠٠ بەندکراوی عەرەبت لەگەڵە، وتی من گومانم لەهەموویان هەیەو لێیان دە ترسم، بەداخەوە لەزینداندا بۆم

---

*عقیلی کاتێك وەزیری بەرگری بوو دەی وت پێویستە بۆمبی ئەتۆمی بەکوردستاندا بدرێت.بەڵام دادگای شۆڕشی بەعس فەرمانی لەسێدارە دانی دا، دایکی بەمەبەستی ڕزگارکردنی پەنای بردە بەر خودی مەلا مستەفا، ئەویش نووسراوێك ئاراستەی سەرۆك ئەحمەد حەسەن بەکر دەکات بۆ ئەم مەبەستە. ئەوەبوو فەرمانی لەسێدارەدانی لادراو بە٢٠ساڵ زیندانی حوکم درا. لەناو زیندانیشدا کوڕێکی مەسیحی بەناوی مەناف کرابوو بەچاودێری لەلایەن بەعسییەکانەوە، لەکۆتاییدا حزبی بەعس لەزینداندا دەرمان خواردی کردو کوشتیان.

خراپی تیدابوو، نموونەی ئەو کوردە زیندانیە باشانە کاك حەمە موچورکەی پینجوونی بوو کەبەباخەوان ناسرابوو وە خەلکی شاری پینجووین بوو، ئەم کابرایە رۆشنبیرو نیشتمانپەروەریکی ناسراو بوو. هەروەها مرۆڤی وای تیدابوو کەئەگەر بتەویَ باسی خراپەکانی بکەی ئەوا بەکتیبیك تەواو نابیت. وا لەخوارەوە هەندیك لەو ناوانەو بەریژەی لەسەدا رادەی خراپیان دیاری دەکەم:-

١-ئەحمەد حاجی پینجووینی بەرادەی لە١٠٠٪ خراپ بوو.

٢-بلەی رەشید بەحری بەهەمان شیوە.

٣-سیف الله کاکەیی ٨٠٪.

٤-خەلیل جمهوری ٦٠٪.

٥-موحەسەن یەزیدی ٦٠٪.

٦-حەسەن یەزیدی ٥٠٪.

٧-داود باغستانی کەئەمەیان نمرەی خراپی لەژمارە نایەت، ئەم کابرایە لەناو زیندانیشدا بەپیلانو فەرمانی موخابەرات دەجوولایەوەکە بەراستی کەسیکی خەتەر بوو. لەدواییدا بەفەرمانی موخابەرات لەزیندان ئازاد کراو نیردرایە لای بنەمالەی بارزانی تا ببیتە خزمەت کاری ئەو بنەمالەیە، ئیستاش بەفەرمانی نیچیرڤان نەبیت ناجوولیتەوەو بوە بەچلکاو خۆری دەستی ئەوان.

هەروەها ئەحمەد حاجیو بلەی رەشید بەحری هیچیان لەداوود باغستانی کەمتر نەبوو. دەربارەی بارودۆخی بەشی گرتوو خانە لەزیندانی ئەبو غریب دەلیم: ئەم بەشە لەرووی

ئیداریـەوە سـەر بەبەندیخانـەی گشـتی بـوو بـەڵام بـەکردەوەو لەراسـتیدا سـەر بەبەریوەبەرایـەتی ئـەمنی گشـتیو موخابـەراتی گشـتی بـوو. بەریوەبـەری زینـدان ئەفسـەریکی نەتـەوەیی بـوو، لەبـەر ئـەوەی نـەچوو بـووە ریـزی حزبـی بەعسـەوە لەئەفسـەری خرابـوو. بـەڵام لەبـەر ئـەوەی خویـریو بـی کەسـایەتی بـوو نەیدەتوانی سەرپیچی ئەو فەرمانو رینماییانە بکات کە لـە داموو دەزگاکـانی ئەمنـەوە بـۆی دەهـاتو لـەپیناوی پاراسـتنی پۆستەکەی وەکو بەریوەبەری زینـدان، سـەرلەبەری فەرمانـەکانی جیبەجی دەکردو بەموو لیی لا نەدەدا.

چوار کەس هەبوون لەو زیندانەدا گوایە بـەپیی فەرمانـەکانی داموودەزگا ئەمنیەکان رەفتاریان لەگەلماندا دەکرد بەڵام بەردەوام ئـەو رینماییانـەیان دەبـەزاندو زیـاد لـەرادەی خـۆی بـەتوندی مامەلـەیان لەگەڵ دەکردین. بـۆ نموونـە هـەموو رۆژیـك دوو جـار زیندانیەکانیان سـەرژمیر دەکرد، ئـەم ئیشـەیان لـەناو گۆرەپـانی زینداندا ئەنجام دەداو ناچاریان دەکردیـن، بەگـەرمای هـاوین یـان بەسـەرمای زسـتان لـەو گۆرەپانـەدا راوەسـتین، بیانووشـیان ئەوەبوو گوایە زیندانییەك دیار نییە. ئینجا ناچاریان دەکردیـن گوی لەو دەنگوباسـان بگریـن کـە لەعیراقی الثورة بلاودەرکایـەوە بۆ ئەوەی سیاسەتی بەعس لەسەر ئاستی ناوەوەو دەرەوە بچیتـە میشکمانەوە. ئەوەندە ماندوویان دەکردینو زۆریان بۆ دەهینـاین کەنـەمان دەتوانـی لـەناو زینـدانـدا هاموشـۆو سـەردانی یـەکتر بکەین، بەردەوام لەم قاوشەوە دەیانگواستینەوە بـۆ یـەکیکی‌تر،

ئەمەشیان بەئاردەزووو زەوقی خۆیان دەکرد گوایە ئیمە چالاکی سیاسیمان هەیە.

ئەم چوار کەسە بەلای منەوە مامۆستای عەلی کیمیایی بوون، بەلکو خراپتریش بوون، ئەوانیش: مەئمووری زیندان هادی، عەریف جەواد، حسەین فەلاح و عەبدولسادە بوون.

لەهەمان کاتدا لەناو زیندانیدا کۆمەلیکی زۆر لەکوردی خۆراگرو خاوەن بیرو باوەر هەبوون، کەچەند لەسەریان بنوسین کۆتایی نایەت، چونکە ئەمانە نە ملکەچی ئەمن و ئیستیخبارات بوون و نە هیچ نهینیەکیان بۆ رژیم درکاند. هەروەها لەزینداندا کۆمەلی خەلکێ بیتاوان هەبوون کە لەبەر ئەوەی فیشەکیك لەناو باری ئیسترەکەیدا دۆزرابووەوە بەپیشمەرگە تاوان بار کرابوو، یان لەکاتی رووداونی هیرشیکدا بەبێ تاوانی گیرابووو ژمارەیان ۲۰۰ کەس دەبوون. ئەمانە لەسەر دەستی برا رۆشنبیرو مامۆستاکان فیری خویندنو خویندەواری و گیانی شۆرش گیری بوون،ئەمانە بەشی هەرە زۆر یان پاش ئازاد بوونیان لەزیندانی پەیوەندییان بەریکخراوەکانەوە کرد. دەزگاکانی ئەمن لەبەندیخانە سەریان سوورمابوو لەخۆراگری ئەم بەند کراوانە. لەریگای سەردانەوە هەموو دەنگ و باسیکی دەرەوەمان پێ دەگەیشت و، لەناو خۆماندا یەکسەر بلاومان دەکردەوە. دۆستایەتی و برایەتی مان زۆر خۆش بوو، بەرادەیەك کەهەرگیز ئەوەم بیرم ناچیتەوە جاریکیان لەمانگی رەمەزان سەردانی چەند برایەکم کرد کە لەهۆلیکی‌تر بوون، من لەبەر ئەوەی بەرۆژو بووم زۆر برسی و تینو بووم، بۆیە پیم وتن بەسەری مام جەلال

سوێندم بدەن تا رۆژوەکەم بشکێنم. کاک ئاوات عبدولغفور وتی تەلمان هەیە، کاک عومەری سەید عەلی وتی وەرە لای ئێمە نان بخۆ، پاشان کاک عومەر بالیفو چوار کەوچك برنجی بۆ ناردم تا دڵنیام بکات لەوەی کەئەم خواردنەیان هەیە، لەدوای بۆم دەرکەوت کاک ئاوات لەبری قەل ساواری لای کاک عومەر نانم خوارد.

لەناو ئەو برادەرە خۆشەویستانەدا بەڕێزان مام خدر سیکانیان، کاک مامەند، مام حەمید کۆیی م هەرگیز بیر ناچیتەوە، کەئەمانە نموونەی هاوڕێی دلسۆزو خۆراگر بوون. باوکی کاک مامەند لەسێدارە دراو دایكو خوشکیکی بیست ساڵ حوکمی زیندانیان بەسەردا درا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پیاوە چۆکی بۆ بەعس دانەداو لەسەر خۆراگری خۆی مایەوە.

مام حەمید کۆیش کوریکی پێشمەرگەی هەبوو شەهید بوو وە کوریکی تریشی لەبەندیخانەدا لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا شەهید بوو، ئەمانە وای لێ کردبوو هەندێ جار لەرووی دەروونیەوە هەلدەچوو. لەناو ئیزیدیەکانیشدا چەندین نموونەی خۆراگریم بینی، لەوانە شەش لەبرا ئیزیدیەکان پێیان دەلێن ئەگەر بێت و دان بەوە دابنێن عەرەبن و ئیمزای بکەن ئەوا ئازادتان دەکەین، بەلام ئامادە نابن ئەم کارە بکەن. کاتێك بەوەم زانی چوومە لایان و پێم وتن من نوینەری مام جەلال و بارزانیم و، جەنابی تەحسین بەگی ئیزیدی کەمیری ئیوەیە جێی باوەری منەو دۆستێکی نزیکمە، بۆیە بەناوی هەر سێکیانەوە داواتان لێ دەکەم کەئەو داوایەی بەعسیەکان جێ بەجێ بکەن، زۆر لەم

قسانەم بۆکردن بەڵام بێ کەلك بووو، وتیان، تۆ جێی باوەری ئێمەی و هەموو شتێکت بەقسە دەکەین. بەڵام ئێمە کوردین و ئامادەنین ببین بەعەرەب ئەگەر هەموو ژیانیشمان لەزیندانیدا بەسەر بەرین. لەسالی ١٩٨١ لەلەندن ئەمەم بۆ جەنابی تەحسەین بەگی ئێزیدی گێرایەوە. بەداخەوە ئێستا تەنها ناوی سێ دانەیانم بیر ماوە شیخ عەتا، مشکۆ، ئەبو کادح کەناوی مانع بوو.

هەروەها لەناو بەندیخانەدا چەندین شۆرشگێری تر هەبوون کەئامادە بوون تا دوا هەناسە لەسەر بیرو باوەرەکانی خۆیان پێ دابگرن، کەئەمانە نموونەی ئەو جۆرە کەسانە بوون مامۆستا حسەین رەزا، حەمید کەریم شانەیی، مامۆستا هادی، جاسم محەمەدسەلیم، خدر عەلی ئەحمەد، عومەر سەید عەلی، ئەنوەر حەسەن، خۆشناو محەمەدئەمین، ئەرسەلان بایز، ئاوات عبدالغفور، کوردۆ قاسم، ئەحمەد مەولود، عەلی بچکۆل، جەبار فەرمان لەناو هەموو ئەمانەدا حسەین رەزاو جاسم محەمەدعەلی و خدر عەلی ئەحمەدو خۆشناو محەمەدئەمین سەلماندیان کەبەراستی خۆ راگرو شۆرشگێرن.

*تێبینی*

لەو ماوەیەدا بەبۆنەی ئەوەی سەدام حسەین بوو بەسەرۆك کۆمار لێبووردنی گشتی دەرچوو، بەریوەبەری بەندیخانە بەم بۆنەیەوە هاتە لامان و کۆبوونەوەی پێ کردین و ئەو هەواڵەی پێ راگەیاندین. فەلاح وتی: ئێوە بەرناکەون. کاك عومەری سەید

عەلی وەڵامی دایەوە وتی: قرار واضح. ئینجا فەلاح دریژەی پیداو وتی: رەفیق تۆ بچۆ دەرێ چونکە ئەم بریارە تۆ ناگریتەوە لەبەر ئەوەی تۆ دوو دەعوای ئەمنی دەرەوەت لەسەرە. بەکوردی‌و بەکورتی وتی تۆ جاسوسی جولەکەو ئیرانی. تومەس ئەو هەوڵ‌و دەنگوباسەی داومە بەمەکتەبی بارزانی ئەوانیش فرۆشتویانە بەئیسرائیل‌و ئیران.

٢- من ئەو رووداوە میژووییانە تۆمار دەکەم کەخۆم بەشداریم تییاندا کردووە، بۆیە بەمافی خۆمی دەزانم ئەوەی پیویست نەبیت تۆماری نەکەم‌و لەپیناوی لەبەرچاوگرتنی هەل‌ومەرجی ئیستای کوردستان چاوپۆشی لەهەندی رووداو بکەم، یان پشتگوییان بخەم بەلام بریارم داوە خوا یار بیت لەبەرگی چوارەم‌و پینجەمی ئەم کتیبەدا بەئاشکرا بەتانوپۆیاندا بچم.

ئەوەی ئیستا لەدلمدایەوە دەمەویت بیخەمە بەرچاوی هەموانەوە ئەوەیە کەهەلگری ناوی پیشمەرگە، ئەم ناوە پیرۆزە، خاوەنەکەی ئەگەر پشتی کردە دوژمن‌و لەکاتی شەردا سەنگەری چۆل کرد، مافی ئەوەی نییە بیتەوە ریزی شۆرش‌و جاریکی‌تر دەسەلات یان لیپرسراویتی بگریتەوە دەست.

٣- ئەوانەی لەبەردەمی دام‌و دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژیمدا خۆیان بۆ رانەگیراو لەپیناوی پاراستنی گیانیاندا ئیعترافیان لەسەر هاوسەنگەرو هاوریبازەکانیان کردو لەسەردەمی دادگا شایەتیان لەهاوریکانیان دا، هەرکاتیك لەزیندان دەرچوون بۆیان نییە تیکەلی سیاسەت ببنەوەو بچنەوە ریزی حزبەکان. کاری وا ئەگەر بکریت تاوانیکی گەورەیە، چونکە پیویستە ئەم جۆرە

کەسە رووخاوانە کە لەزیندان دەردەچن خۆیان لەبەرچاوی خەلك ون بکەن، توخنی سیاسەت نەکەونەوەو لەکۆڕو کۆمەلی سیاسی دووره پەریز بن، جگە لەوەی کەدەبیت پلەوپیی‌ەی گەورەیان نەدریتی، بەرپرسیاریتی نەگرنە دەست چونکە بەزۆری لەکاروباریاندا رووبەرووی بارودۆخی دژوارتر دەبنەوەو ئەوساکە دووبارە خۆیان پی ناگیریتەوەو دەبنەوە مایەی رووخانی ئەو ئەزموونەمان کەبەری خوینی شەهیدانە.

لەوەوە دلنیا بووم کەکیشەکەی من پەیوەندی وبە خودی سەدامەوە هەیە. دوای ئەوە ئەو برا دلسۆزانەی لیبووردنەکە گرتنیەوە خواحافیزیان لی کردمو بەجییان هیشتم، منیش خۆشحالیم دەربری بەئازاد بوونیان. لەو کاتەدا رووم کردە برای گەورەو ئازیزم کاکە شەفیق کەدەیوچاوی سور هەلگەرا بوو وە گرژی پیوە دیار بوو پیی وتم: ئیستا زانیم کەتۆ جاسوسی ئیسرائیل و ئیرانی، من هیچ باوەرم پیت نەماوە، پیشتر پیم وابوو هەموو ئەوەی کردمان لەپیناوی کوردو کوردستاندا بوو. لەو جۆرە قسانە زۆری گوت بەلام من بەهیچ جۆریك وەلامی کاکە شەفیقم نەدایەوە ناچار بووم بگریم، کەبینی دەگریم بی دەنگ بوو ئەولاو ئەولای ماچ کردم. لەئیمە خراپتر کوریکی کامل جادر چیی بوو کەئەویش وەك ئیمە بەر لیبووردنەکە نەکەوت ئەوە بو هاتە لامو پیی وتم: مام رەفیق خەریکە میشکم بتەقی، تکایە چارەیەکم بکە. منیش وتم: وەرن دوام کەون، ئەوەبوو ۷۰۰ قەرەویلەی ئاسنمان گواستەوە بەماوەی ٥ سەعات، دوای ئەوە بەجۆریك ماندوو بووین کەهیزمان تیدا نەماو یەکسەر خەوتین.

بەدوایدا ئیمەیان گواستەوە هۆلیك کەهەر هەموو زیندانییەکانی بەتاوانی دەرمانە بۆ هۆشکەرەکان المواد المخدر زیندانی کرابوون. ٢٤ سەعات پیش ئەو کاتە لەگەڵ برا کوردە شۆڕشگێرەکاندا زیندانی بوومو ئیستاش لەگەڵ خەڵکی خراپەکار. فەلاحی سیخور بەلاماندا رەت دەبوو توانجی تیدەگرتینو دەی وت: رەفیق تۆ ١٧ساڵت ماوە، بەڵام شەفیق تۆ دوو ساڵ. بۆ بەیانییەکەی رۆژی بینین بوو مواجهە. ئەوەبوو وەکو جاران ماڵەوەمان هاتن و دایکم لەپیشەوە دەرۆیشت، هەر هەموویان ورەیان بەردابوو تەنها دایکمو کەمال نەبیت کەبەجۆریك ورەیان بەرز بوو لەریگا قسەی خۆشو گاڵتەوە هەموومانیان هینایە پیکەنین. دایکم وتی: لەم هەفتەیەدا خەونم بینیوە ئیوە بەردەبن، دوای ئەوە رووی کردە کاکە شەفیق و پیی وت: ئاگات لەرەفیق بیتو دڵی عاجز مەکە، هەروەها دڵخۆشی دایەوەو داوای لیکرد کەخۆراگر بیت چونکە تەنگانە بەری کورتە. دوای ئەوە کات تەواو بوو وەکو رۆژان گەرانەوە بۆ ماڵەوە. کاتیك دەگەنەوە ماڵەوە زۆر بەعادزیو ماتی دادەنیشنو هەر کەسە دەڵێ دەچم دەخەوم. ئیوارەکەی رووباری کچم تەلەفۆن بۆ سەدام حسەین دەکات بەبۆنەی بوونە سەرۆك کۆماری. سەدام پیی دەڵیت خۆت بناسینە، ئەویش دەڵێ من ناوم رووبارەو کچی رەفیق پشدەریم، سەدام دەڵیت: سەید رەفیق چۆنە ؟ رووبار وەڵامی دەداتەوە دەڵێ: تۆ خۆشیت خستە ماڵی هەموو کەس تەنها ماڵی ئیمە نەبیت، چونکە باوکم هیشتا لەزیندان دایە. ئەویش دەڵێ: باوکت بەر بووە، چونکە ئەو

بڕیارە ئەویش دەگریتەوە. ڕووبار دەلێ: ئیمرۆ هەتاکو سەعات ٢ لای باوکم بووین لەبەندیخانەی ئەبو غریب. سەدام پیی دەلێ: قسەی من یەکەو باوکت بەر بووە، بەیانییەکەی دیتەوە لاتان.

منو شەفیقی برام لەناو زیندانیدا ئاگامان لەو شتانە نەبوو، کاتیك نیوەی شەو لەبەندیخانە بەڕیوەبەر هاتە لامان، کەگەیشتە لای من بەگەرمەوە سلاوی لی کردمو وتی ڕەفیق چیتان بۆ بکەم؟منیش وتم ئەگەر بمان گوازنەوە بۆ لای باخەوان و عومەر صادق زۆر مەمنون دەبین. بەپیکەنینەوە وتی: من لەمالەوە بووم جیگرەکەم ئاگاداری کردم کەپرسیاریان لیکردووە دەربارەی ڕەفیق پشدەری، لەقسەکانیدا زانیم کەئەوە سەرۆك کۆمارە کەپرسیاری کردووە. منیش خۆم هاتم ڕاستییەکەی بزانم، سەرۆك کۆمار پرسیاری ئەوەی لیکردین کەهۆی چییە تا ئیستا ڕەفیق پشدەریتان ئازاد نەکردووە، ئیمەش وەلامان داوەتەوە لەبەر ئەوەی دوو تاوانی دەرەوەی لەسەرە واتە جاسوسە. ئەویش وتبووی من ڕەفیق دەناسم شتی وا ناکات (رفیق ما یضرب تختە جروك) بۆیە فەرمانی پیداین بۆ بەیانی ئازاد بکریین.

ئەودبوو سەعات ١٢ی شەوئاگادار کراین خۆمان بپیچینەوە دوای ئەوەی ئیمەیان بردە لای بەڕیوەبەری بەندیخانەی گشتی، ئەم کابرایە سەعاتیك داینانو قسەی خۆشی بۆ کردین وە دەی وت: بڕوا ناکەم هیچ گلەیەکتان لەئیمە هەبیت، لەو کاتەدا لیپرسراویکی موخابەرات هاتە ژوورو وتی: تەلەفۆن بۆ مالەوە بکە کە لەسەعات شەشی ئیوارە بین بۆ بەندیخانە تا لەگەلیان

بچیه مالەوە. تکام وایە خەلك كۆ نەکەنەوەو لەدوو ئۆتۆمبیل زیاتر نەیەن. سەعات دوو تەلەفۆنم لەگەڵ مالەوە کردوو دوای سلاوکردن ئاگادارمکردن کەسبەی بین بۆ لام. لەکاتی خواحافیزیمدا لەگەڵ کاك عومەر صادق کەبەناهەق بۆ ماوەی ۲۰ ساڵ حوکمی زیندانی بەسەردا درابوو زۆر هەستم بەدڵ گرانی دەکرد بۆ ئەو. لەسالی ۱۹۷۹ سەعات ۸ گەیشتمە مالەوە، باس ناکریت لەخۆشیان کەس و کارو خزم و دۆستەکانم چیان بۆ کردم. ئەو شەوە شەوی عارەفە بوو، جەژنمان لەمالی خۆمان کرد لەبەغدا. دووەم رۆژ هەر هەموومان نزیکەی ۷۰ کەس دەبووین جەژنمان لەمالی برایی ئازیزو دلسۆز کاك حمەو کاك ئەحمەد کورانی مام وەلی لەگوندی ئەحمەد ئاوا ناوچەی کەلار بەسەر برد.

سێیەم رۆژی جەژن لەسلیمانی بوین لەمالی کەمالی برام. لەناو خۆماندا ئەوەمان بەباش زانی بۆ بەرژەوندی گشتی و کەمکردنەوەی بار گرانی سەر خەلك تا هاتووچۆی بەغدا نەکەن بۆ ماوەی حەوت رۆژ پیاوان لەمالی حەسەنی برام و ژنانیش لەمالی شەفیقی برام لەقەلادزێ دابنیشن. بەهۆی ئەوەی ئیمە کە لەبنەمالەی حاجی صادقە دریژین و خزمەتیکی زۆری خەلکمان کردووەو، وا بلاو ببۆوە کەئیمە سەر نگووم کراوین بەجۆریك پیشوازی کراین و خەلك هاتە لامان کەخۆمان لامان سەیر بوو. ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی سەرنجی رژیمی بەعس رابکیشێ: ریکخراوی رانیەو سەنگەسەرو قەلادزێ هاتنە لامان. داوایان لێ کردم بەرامبەر ئەم هەلویستەی سەدام حسەین لەبەرامبەر مندا

لەکاتێکدا من – وەکو نوێنەری ڕێکخراوەکان دەیان گوت – ئەو هەموو تاوانەم بەرامبەر بەرژێمی عێراقی کردووە، داوایان لی کردم بەو بۆنەیەوە قسە بۆ خەڵك بکەمو باسی چاکەی رژێمی بەعسیان بۆ بکەم تا خەڵك هان بدەم بینە بەعسی و ئەوانەش کەچوونەتە شاخ بیان هێنمەوە ناو رژێم. ئەوەبوو سەیری براکانم کردوو ئەوانیش بەچاو پێیان وتم وەڵامیان بدەوە. بۆیە پێم وتن: ئێمە بەبێ تاوان گیرابووین، تەنها تاوانمان ئەوەبوو کەکورد بووین رژێم خراپترینو ناشیرنترین کردەوەیان لەگەڵدا کردین، ئێمە بەمافی خۆمان بەربووینو، خەڵکانی شاخ خاوەنی بیرو باوەڕنو بەقسەی من پەشیمان نابنەوە ئێوە ئەگەر راست دەکەن گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەنو داواکانیان جێبەجێ بکەن تا لەشاخ بینە خوارەوە.

دوای بەربوونم لەزیندانی ئەمە یەکەم جار بوو لەگەڵ کادیرانی رژێمی بەعس رووبەڕوو ببمەوەو بەسلبی قسەیان لەگەڵ بکەم. لەدوای ئەمە بیرم لەوە کردەوە لەداهاتوودا چ بکەم ؟ هەنگاوی یەکەم نووسراویکم ئاراستەی برای گەورەو زۆر بەریزم سکرتێری یەکێتی مام جەلال کرد، لەو نووسراوەدا بۆم روون کردبۆوە کەمن ناتوانم لەو بارودۆخەی رژێمی بەعس بژیمو، پێم وت دلنیام لەوەی جارێکیتر زیندانیم دەکەنەوەو، هەروەها پێم راگەیاند کەدەمەویت بیمە ناو شۆرشەوەو خزمەت بەگەلەکەم بکەم، جا چ لەشاخ یان هەندەران. لەهەمان کات بۆم نووسی بوو پێویستم بەچارەسەری دەروونی هەیەو پێویستە ماوەیەك پشوو بدەم. وەڵامی برای گەورەمان مام جەلال زۆر ئیجابی بوو، پێی

باش بوو یەکەم هەنگاو بچمە دەرەوە. ئەوەبوو کەوتمە خۆ ئامادەکردنی یەکەم شت ماڵەوەم بەیەکجاری گواستەوە بۆ شاری سلێمانی لەلایەن خەڵکیشەوە پێشوازیەکی باش کراین، بەڵام بەداخەوە لەو کاتەدا لەپڕا برای ئازیزو هاوڕێی بەندیخانەم کاکە شەفیق لە٣٠/١/١٩٨٠ کۆچی دوایی کرد، ئەم کارەساتە هەموو بەرنامەکانی منی دواخست. شەفیقی برام دوای شەش مانگ لەبەربوونمان لەبەندیخانە کۆچی دوایی کرد، کاتێك لەبەندیخانەی تایبەتی موخابەرات بووین ماوەی ١٦ مانگ کەس و کاری خۆی نەدی. لەکاتی لێ کولینەوەدا رۆژێکیان کاسێتێکی بەدەنگی من بۆ لێدەدەن و پێی دەڵێن ئەوە رەفیقی براتە دان بەتاوانەکانی خۆیدا دەنێت. تۆش کەدەتەوێ رزگار بێت پێویستە وەکو ئەو بکەی. کاکە شەفیق کەگوێی لەدەنگم دەبێت لەهۆش خۆی دەچێت و دەبووریتەوە، ئەمە یەکەم جار بوو نیشانەی نەخۆشی دڵی لێ دەربکەوێت. خۆراگری ئەم قارەمانە شایەنی باسکردنە، چونکە لەزینداندا کەمن ئەوانەی خۆ دەگرن و چۆك لەبەرلمبەر دوژمن دانادەن. من لەزیندانیدا زۆر لەوانەم بینی کەنەیان توانی خۆیان بگرن و هەر زوو ورەیان بەرداو دەستیان کرد بەئیعترافات، هەندیك لەوانە هەر لەلێکۆڵینەوەدا دان بەتاوانەکانیان دادەنێن و خەڵکی تریش لەگەڵ خۆیاندا تووشی زیندانی دەکەنو، هەندێکی تر لەدوای لێکۆڵینەوە لەزینداندا خۆیان راناگرن و بێ تاقەتی و ترسی خۆیان ئاشکرا دەکەن. حەقی خۆیەتی ئەوانە کە لەزیندان بەردەبن جارێکی تر رێگایان پێ نەدرێت تێکەڵ بەسیاسەت و

حزبایەتی ببنەوە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە ناتوانن نهێنی بپارێزن و پیاوی ئەو بوارە نین.

لەماوەی پرسەی شەفیقی برامدا دوکان و بازار داخراو خەڵک بەگشتی بەشداری خەممان بوو، ڕۆژی دووەم ڕووم کردە ئەو بەڕێزانەی سەرپەرشتی پرسەکەیان دەکرد حەمە سووری مینە عارەب و کاک عومەری حاجی موساو حەسەنیبرام و پێم وتن: دەبێ تەگبیرێك دانێن بۆ ئەو خەڵکەی دەورو بەری شارۆچکەی قەڵادزێ تا بەبرسیەتی نەگەڕێنەوە، با هەرچی کەبابخانە هەیە کەباب بۆ ئێرە بهێنن، چونکە زیاد لە٧٠٠ میوان هاتووە. وتیان: ئێمە ئەو کیشەیەمان لەناوخۆماندا جێبەجێ کردووە، هەرچی خەڵکی قەڵادزێیە لەگەڵ خۆی سینی خواردن بێنێ بۆ ئێرە، بەڵام بۆ نان خواردن بچنەوە ماڵی خۆیان چ ژن چ پیاو. هاوسەرەکەی شەهید عەلی عەسکەری هات بۆ پرسەکەو پێی وتم: کە لەئۆتۆمبیلەکە دابەزیم پرسیارم کرد ئەو قەرەباڵغیە چییە؟ کێ وەفاتی کردووە؟ وەڵامیان دامەوە وتیان شەفیقی برای ڕەفیق پشدەرییە، ئەم پیاوە ئەوەندە باش بووە کەهەموو خەڵك بۆی دڵگرانە. ئەو جار خۆم ئاشکرا کردوو ڕیزی زۆریان لێ گرتم و بەئۆتۆمبیل منیان هێنا بۆ پرسەکە. هاوسەرەکەی خالە شەهاب بەهەمان شێوە لەگەڵ سۆرانی کوریدا بۆ پرسەکە هات و دوو ڕۆژ لامان مانەوە، دایکی سۆران وتی: لەهەموو پرسەیەك من بۆ شەهاب دەگریم، بەڵام لەم پرسەیە هەموو گریانەکەم بۆ شەفیقی براتە ڕەفیق. چونکە کاتی لێ قەوماو ئێوە زۆر بەهانامانەوە هاتن، ئەوەتا سۆران نایەوێت بگەڕێتەوە سلێمانی، چونکە تۆی زۆر خۆش دەوێت. هەواڵ بەمام جەلال دەگات کەرەفیق کۆچی دوایی کردووە، بۆیە دەفەرمووێت بۆ ماوەی ٢٤

سەعات لەسەر رەفیق دەنووسمو، لەدواییدا وەڵامی بۆ دەچیت ئەوەی كۆچی دوایی كردووە رەفیق نیە بەلكو شەفیقی برایەتی. ئەو كاتە منیش وتم: هەتا لەژیاندا ماوم حەز دەكەم بەدەستو قەلەمە زیرینەكەی خۆی تەنها پێنج دەقیقە لەسەرم بنوسێ. سبحان من یغیر الاحوال.

لەبەرواری ١٩٨٠/١٢/٢٨ لەسنووری عیراق دەرچووم لەگەڵ برای بەریزو دلسۆزم مام صالح سورچی. ئەوەبوو چوینە كویت بەئۆتۆمبیلی كاك عومەر سورچی كە لەسەر داخوازی من خستبوویە بەر دەستمان. لەوێ چوینە مالی ئەبو حەیدەر كەپیاویكی خزمەت گوزارو نیشتمانپەروەر بوو وە هەمیشە دەرگای مالی لەسەر پشت بوو بۆ هەموو كەسیك. لە١٩٨٠/١٢/٢٩و لە١٩٨١/١/٤ تەلەفۆنم لەگەڵ برای بەریزو خۆشەویستم مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد كرد، ئاگادارم كردەوە كە لە١٩٨١/١/٥ سەعات نۆی شەو بەكاتی لەندەن دەگەمە لای. لەكاتی دیاری كراو گەیشتمە لەندەن، بەلام لەترانزیت دوایان خستم. لەوێ چەندین پرسیاریان لێ كردمو پیان وتم دیارە بەپێی ئەو پارە زۆرەی پیتە نیازت نیە بگەرییەوە عیراق، هەروەها وتیان ئەو هەموو میوەو دیارییە چییە لەگەڵ خۆتا هیناوتە. لەدواجار دوای دوو سەعات ریگایان دام و فیزەی سێ مانگیان دامێ. كە لەفرۆكەخانە هاتمە دەر د. لەتیف رەشیدو كاك هەلۆ ئیبراهیم ئەحمەد چاوەروانیان ئەكردم، سەرەتا ئەوەم بۆ روونكردنەوە كەبۆچی دواكەتم وە داوای گەردەن ئازاییم لێكردن.

## لە لەندەنیش وازم لە بڕواکانم نەهێنا

پاش گەیشتنم بەلەندەن دیاریەکانم تەسلیمی کاك د. لەتیف رەشید کرد بۆ دابەشکردن، من بۆماوەی دە مانگو بیست رۆژ لەلەندەن مامەوە، مانگی یەکەم لەئەپارت مانیك بووم کە لەدوری ٥٠٠ مەتر بوو لە VICTIORIA فکتۆریا دوایی گواستمەوە بۆ گەرەکی CHELSI لەبالەخانەی NILGWIVHOYSE.

ئەپارتمانیکم گرتو مامەوە، تاکو ئەو رۆژەی لەندەنم جێهیشت، هەر کاروباریکی خودی یان سیاسیم هەبوایە لەریگەی برایانی بەریز د. لەتیف رەشید ود. صلاح حەمە سەعید ئەنجام دەدا، بۆیە بەبێ ئاگاداری ئەو بەریزانە هیچ هەنگاویکم نەدەنا، شایانی باسە کەئیمە لەنیوان خۆماندا تەبا بووینو هیچ کیشەیەکمان نەبوو ئەمەش هەمووی بۆ مامۆستای گەورەو بەریز ئبراهیم ئەحمەد دەگەریتەوە.

من کەهاتمە دەرەوەی ولات بەنیازی چارەسەرکردنو پشوودان بوو، بەلام بەجۆریك تەندروستیم باشبوو ریگام نەکەوتە لای هیچ دکتۆریك ئەمەش هەمووی لەگەورەیی خواوەبوو، پاشان بەهۆی ریگا نیشاندانی مامۆستای بەریز ئیبراهیم ئەحمەدو ریگاپیدانی مام جەلال توانیم بەیارمەتی د. لەتیف رەشید ،خزمەتیکی زۆری ولاتەکەم بکەم، کەجیدەستی خۆم لەخزمەتکردنی کوردو کوردستاندا لەو دەربەدەریە دیارخەم، کەوا لەخوارەوە بەکورتی باسی هەندیك لەو لایانانە

دەكەم بەتایبەتی لەسەر خودی ئەو مامۆستا بەریزانەی كۆچی دوایان كردو ماوەیەك لەخزمەتیان دابووم. خوالیخۆش بوو تۆفیق بەگ‌و خوالیخۆش بوو عەلی كەمالكە حاتەمی تەی كوردان بوو،وخوالیخۆشبوو مامۆستای گەورە ئیبراهیم ئەحمەدو، خوالیخۆشبوو كاكی كاكان عومەر مستەفا.

پینجەم رۆژ بەهۆی كاك د. لەتیف رەشید تەلەفۆنم لەگەڵ برای گەورەمام جەلال كرد كەئەو كاتە لەلیبیا بوو، هەموو ئەو ئاگاداریانەی هەم بوو بەدورو دریژی باسم لیوە كرد، ئەویش فەرمووی نوسراویكم بۆ بنووسە ئینجا داوای كرد ئەم كارانە ئەنجام بدەم، سەرەتا داوای لی كردم سەردانی بالویزخانەی لیبیا بكەم لەلەندەن‌و وتی هەوڵ بدە لەئەمنیستی بەسەرهاتی خۆت باس بكەو با لەگۆڤارەكەیان بۆت بلاو بكەنەوەو، هەوڵ بدە لەعیراق ئینگلیزیەكان هەموو ئەو ئازارو ئەشكەنجەی كەدراوی بلاوبكریتەوە، منیش چوار جار چوومە بالویزخانەی لیبیا، جاری یەكەم لەگەڵ جەنابی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو د. لەتیف رەشید چووم، ئەوانیش بەبالویزی لیبیان ناساندنم كەناوی ئیبراهیم بوو، پیشەكی بروسكەیەكم دایێ بۆ دۆستی دیرینی گەلی كورد، لەبروسكەكەدا بەدورو دریژی باسی هەلویستی رژیمی بەعس‌و درندەییم كردبوو بەرامبەر بەگەلی عیراق بەگشتی و گەلی كورد بەتایبەتی، جەنابی بالویز وتی: سەرۆك محەممەر قەزافی دەلیت: ئەو چوار حكومەتە ئاسودەیی بەخۆیانەوە نابینن، مەبەستی عیراق‌و ئیران‌و توركیاو سوریایە تاكو كیشەی كورد چارەسەر نەكەن، بەتایبەتی توركیا كەرۆژ

بەرۆژ رووبەرووی کێشەو گرفتی ئابووری گەورە گەورە دەبێتەوە قەرزەکانی زیاد دەکات، ئەمانە وا لەتورکیا دەکەن ببێتە گۆچانی دەستی ئەمریکا لەناوچەکە، لەدرێژەی قسەکانیدا بالوێزی لیبیا ئاماژەی بەوە کرد کەسەرۆك معەمەر قەزافی لەگەڵ تاوانبار ئەحمەد حەسەن بەکرو وەزیری دەرەوەی تورکیاو کاربەدەستانی حکومەتی ئیسلامی ئێران باسی ئەوەی کردوە کەکێشەی کورد لەرێگای ئاشتیەوە نەبێت چارەسەر ناکرێت.

دوای دانیشتنی یەك سەعات خواحافیزیمان لەجەنابی بالوێز کرد. پاش ئەوەی ژمارەی تەلەفۆنی منی وەرگرت دوای چەند رۆژێك لەسەر داوای بەرێزی سەردانم کرد لەبالوێزخانە پێکەوە دانیشتین وتی ئەگەر پێویستت بەپارەی چارەسەرکردن هەیە لەنەخۆشخانە ئێمە ئامادەین ئەو ئەرکە بگرینە ئەستۆ، منیش سوپاسم کردو وتم لەو رۆژەوە لەدۆزەخەی سەدام حسەین رزگارم بووە تەندروستیم بەجۆرێك باشە کەپێویستیم بەحەبی سەر ئێشەش نیە.

لەکاتی کۆبوونەوەم لەگەڵ بالوێزی لیبیا بۆ جاری سێیەم بەرێزیان وتی: حکومەتی لیبیا بەناوی میوانداریەوە داوا دەکا، ئەگەر دەتوانی سەفەر بکەی ئەوا ئێمە هەموو خەرجیەکەت دەگرینە ئەستۆ، دووبارە سوپاسی جەنابی بالوێزم کردوداوای لێبوردن لی کردو هیوای تەمەن درێژیو سەلامەتیم بۆ ئەوو سەرۆك معەمەر قەزافیو گشت گەلی لیبیا پێشکەش کرد.

## ديدار لەگەڵ ريكخراوى ليبوردنى نيودەولەتى

پاش ماوەيەك كاكە د. لەتيف رەشيد ئاگادارى كردم كە لەكاتيكى ديارىكراودا ديت بۆ لام بۆ ئەوەى بەيەكەوە بچين بۆ ميوانداريەك، ئەوەبوو چوومە خزمەتى و چووينە چيشتخانەيەكى لاچەپى بچووك كەپينج ميزى نانخواردنى لى بوو كەتەنها ئيمەو دوو ئينگليزى لى بوو، بۆيە چووينە ئەو چيشتخانەچۆلە تا لەمە ترسى رژيمى بەعس دوركەوينەوە چونكە لەو كاتەدا هەموو ولاتە زلهيزەكان چاوپۆشيان لەتاوانەكانى بەعس دەكرد بەتايبەتى روسياو ئەمريكاو بەريتانياو فەرەنساو ئەلمانياو چين، ئەو ولاتانە بەرژەوەنديان هەبوو لەو بىّ دەنگى يە لەبەرامبەر كوشتو برو تاوانەكانى بەعس بەرامبەر بەكوردو كوردستان، بەلاّم بۆ ئەو رۆژە زۆر گرنگ بوو ميوان دارىكردن لەكوردو، جىّى سوپاسە كەعەم ناجى باسى چۆنيەتى گرتنى منى دەكرد لەلايەن رژيمى بەعسەوە.كاكە د. لەتيف رەشيد ئاگادارى كردم كەكاتيكيان بۆ داناوم لەئەمنيستى بۆ ئەوەى چاوپيكەوتنم لەگەڵبكەن، كچيك كەنوينەريان بوو بۆ ماوەى دوو سەعات گفتوگۆى لەگەڵ كردم منيش هەموو بەسەرهاتى خۆم بەدووروودريژ ى بۆ گيرايەوە، كە لەبەرگى يەكەمىكورد دوژمنى خۆت بناسە باسم ليوە كردووە.

كچەكە وتى: ئيمە ئەو رووداوە لاى خۆمان تۆمار دەكەين بەلاّم بلاّوى ناكەينەوە لەگۆڤارەكەمان دا، چونكە ئەمە لەسالى ١٩٧٧

رووی داوە ئیستاش سالی ١٩٨١ ە منیش وەڵامم دایەوە وتم لە١٤/٩/١٩٧٦ گیرام و لەسالی ١٩٧٧دا بەردرام وەبەم شیوەیەی کەبۆم باس کردی منیان ئازارو ئەشکەنجە داوە، ئەوەی لەگەڵ من کراوە لەگەڵ ئاژەڵدا ناکریت، وا ئیستاکەش روو بەرووی ئیوە راوەستاوم کەگوایە دەزگاکەتان بەرگری لەمافی مرۆڤ دەکات لەجیهاندا ئەوەش وەڵامی ئیوەیەن. پاشان ئەو رۆژەم هینایەوە بەرچاوی کەپاسەوانەکانی دیکتاتۆری بەغدا چۆن ئازاریان دەدام، کچکەدوای ئەوە گۆرانیکی سەیری بەسەرداهات، رەنگی دەمو چاوی گۆرا ئەوجار وتی من ناونیشانی د. لەتیف رەشیدم لایە هەر کاتیك بەشیکی سیاسی ویستی لەسەر پیشیلکردنی مافی مرۆڤ لەعیراق زانیاری کۆبکاتەوە ئەو کاتە پەیوەندی بەدکتۆرەوە دەکەم بۆ ئەوەی ئاگادارات بکاتەوە.

## دیدار لەگەڵ BBC دا

هەر لەگەڵ د. لەتیفدا سەردانی BBC بەشی پانۆراماماں کرد، میستەر RICHARD جیگری بەشی پانۆراماماں بینی ئەویش هەموو پرسیارەکانی کە لەئەمنیستی و چیشتخانەکە لییان کردبووم سی بارەی کردەوە بەزیادەوە، منیش وەڵامەکانم دایەوە، وتی: لەم رۆژانە تەلەفۆنت بۆ دەکەم. دوای چوار رۆژ میستەر RICHIRD بەتەلەفۆن ئاگاداری کردم کەدەیەویت بم بینیت. لەسەر داواکردنی خۆی یەکترمان بینی و وتی: ئامادەیت

تیدایە کە لەBBC وینەت بلاوبکەینەوەو لەسەر رژیمی عیراق بدوێی‌و، لامم دایەوە وتم زۆر خۆشحال دەبم‌و سوپاستان دەکەم کە لەسەر بارودۆخی عیراق بدویم، چونکە بۆ بەرژەوەندی ولاتەکەم مایەی سود بەخشینە.

بۆ ئەم مەبەستە کاتمان دانا، بەریوەبەرایەتی بەشی وینەو تۆمارکردنی BBC هەر هەموویان هاتنە لام لەئاپارتمانەکە وەلە چواردەوری ئەو ناوچەیە پاسەوانیان دانابوو بۆ پاریزگاریکردن، لەکاتی وینە گرتن‌و تۆمارکردنی قسەکانمدا دوو جار ئەو قسەیان دووبارە کردەوە بەم جۆرە قسە بکە ئینگلیزیەکەت پچر پچر بیت، چونکە وینەکانی پیشووت ئەلێی لەئاهەنگدایت، ئەو بەرنامەیە زیاد لە٤٠ ملیۆن کەس دەی بینیت، بەم جۆرە خەلك بروات پێ ناکات.

پاش تەواو بوون وتی: پرسیاریکم هەیە لەجەنابت ئایا تۆ دەوری ئەکتەریت بینیوە؟ لەوەلامدا وتم کورد ژمارەیان زیادلە ٤٠ ملیۆن کەسە، تەنها لەعیراق نزیکەی ٢ ملیۆنمان زیاتر لەم بارەی مندان بەدەست دوژمنانی کورد. لەکۆتایدا هەر هەموویان خۆشحال بوون بەناسینم، چەند وینەیەکیان لەگەلّ گرتم بۆ یادگاری وتیان: دوای یەك هەفتەی‌تر پەخشی دەکەین لە BB C بەشی پانۆراما، لەمانگیکدا شەش جار تەلەفۆنیان لە BB C یەوە بۆ دەکردم، ئەیان وت ئەم هەفتەیە پەخشی دەکەین.

ئەم کارە سەرنجی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو کاکە عەلی کەمالی را کیشاو، دەیان وت ئەو خەلکە بەجۆریك تەماشای خودیەتی تۆ دەکەن‌و ریزت لی دەگرن کەپیشتر وینەی نەبووە،

منیش دەم وت جیاوازی پیاوان لەگوندی هەرموتەش هەیە. هەر ئەم هۆیە وای کرد بێ ئەوەی داوای پەنا بەری سیاسی بکەم خۆیان ئەم پیشنیازەیان پیشکەش کردم، کەتەنها دوو برای تری بەریزی کورد بەم جۆرە نووسراویان ئاراستە کرابوو، بەلام من پەنابەری سیاسیم وەرنەگرت و ئەوەبوو لەندەنم بەجێ هیشت و گەرامەوە کوردستان، خۆم هاویشتەوە ناو ئەو دۆزەخ و ئازارو ئەشکەنجەیەی کەداگیرکەرانی ئەم ولاتە بەسەر کوردیان سەپاندووە، بۆ ئەوەی بتوانم لەناوەوە خزمەتی کوردو کوردستان بکەم و لەپیناوی گەلەکەمدا گیانی خۆم ببەخشم.

حکومەتی بەریتانی بۆ مەبەستی بازرگانی لەگەل رژیمی عیراق ریککەوتن لەسەر پرۆژەیەك بەنرخی ٥٠٠ ملیۆن دۆلار، هەر ئەمە وای کرد پرۆگرامی پەخشی BBC دوا بکەوێ و، لەکاتی پەخشی چاوپیکەوتنەکەی مندا ٨٠٪ی وینەو قسەکانی منیان بڕی بوو. لەسالی ١٩٨١ لەBBC بەشی پانۆراما بەرنامەکە پەخش کرا لەژیز ناوی پیشیلکردنی مافی مرۆڤ لەعیراق، لەدریژەی بەرنامەکە باسی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە کرا کەرژیمی بەعس دەیبارینیتە سەر گەلی عیراق، پیشکەش کەری بەرنامەکە وتی: ئەمەش نمونەی ئەو حالەتە خراپەی گەلانی عیراقە بەدەست رژیمی بەعسەوە، لەو کاتەدا وینەی بەندەی خزمەتکاری کوردستانیان پیشاندا بەجل و بەرگی کوردیەوەو جامانەیەکم لەسەر بوو، لەخوارەوە بەخەتیکی گەورە نوسرابوو پشدەری، ئەو رووداوە بۆ ئەو کاتە وەرچەرخانیکی گەورە بوو لەهەلدانەوەی لاپەرەی‌تاوانەکانی بەعس بەرووی جیهاندا،

هەروەها بۆ کوردیش دەسکەوتیی گەورە بوو لەچوار چیوەی گەیاندنی دەنگی کورد بەجیهان.

*تیبینی:*

١-جیگای باسە هەر لەو ماوەیەدا ریکخراویك بەبۆنەی جەژنی نەورۆزی ١٩٨١ ئاهەنگیکی سازدا لەلەندەن، کاتیك چوومە هۆلەکە ئەوەندەی نەمابو دەرم کەن، لەبەر ئەوەی من ئەم جۆرە رەفتارانەم زۆر بەرامبەر کرابوو تەقەی سەرم دەهات. ئەم رووداوە لەسالی ١٩٨١دا بوو کەمن لەسالی ٢٠٠٠دا باسی دەکەم، ئومیدەوارم ئەو مامۆستایەی ئەو کردەوەیەی بەرامبەر کردم ئیستا پشتی لەنیشتمان نەکردبێ و لەناو نازو نیعمەتی لەندەن ولاتەکەی خۆی لەبیر نەچوبیتەوە.

٢-پاش بلاوبوونەوەی چاوپیکەوتنەکەم بەم هەموو کەم و کووریەوە لەBBCلە گەڵ میستەر ریچاردۆ بۆ جاریکیتر کۆبووینەوە. داوام لیکرد کەدانیشتنیکم لەگەڵ کار بەدەستیکی حکومەتی تاتچەر بۆ ریك بخات بۆ ئەوەی لەگەڵیان کۆببمەوە، لەوەلامدا وتی ژمارەی تەلەفۆنەکەت لامە بۆ ئەم مەبەستە ئاگادارت دەکەمەوە، دوای ٤٨سەعات تەلەفۆنی بۆ کردم و پییراگەیاندم کەکۆبوونەوەکەی بۆ ریکخستووم، لەو کاتەی ئەوان دایان نابوو لەهەمان شوینی دیاری کراو لەگەلیاندا کۆبوومەوە، کەبیجگە لەمیستەر ریچاردۆ دوو کەسیتری لیبوو، لەم کۆبوونەوەیەدا ئەم گفتوگۆیەمان کرد:

سەرەتا من وتم:- بۆچی کوردستانتان کرد بەچوار پارچە؟ لەو کاتەدا لەسەر کاغەزیکی سپی ئیشارەتی +م بۆکردن کەمەبەستم لەچوار پارچەی کوردستان بوو.

لە وەڵامدا وتیان: باپیرە گەورەکانمان ئەو کارەیان کردووە، لەئیستاشدا راستکردنەوەی ئەم هەلەیە کاریکی زەحمەتە چونکە ئەو چارەسەرە هەلومەرجی دەولی پیویستە.

ئەوجا وتم:- ئایا ئیمە دەبین بەحکومەت؟

ووتیان:- دوای چارەسەرکردنی کیشەی فەلەستین.

ووتم:- یانی هەزار سالیتر.

ووتیان:- کەی کیشەی فەلەستین چارەسەر بوو گەورەترین کیشە لەرۆژهەلاتی ناوەراست الشرق الاوسط کیشەی کورد دەبیت، لەو کاتەدا ئیوە دەبن بەحکومەت.

ووتم:-ئەی دیکتاتۆر سەدامحسەین سەرۆك کۆماری عیراق دەمینیٚ؟

ووتیان:- رژیمی سەدامنامینیٚ بەلام گرنگ ئەوەیە ئیوە یەك ریز بن.

لە دریژەی قسەکانمدا وتم:- پیویستە ئیوە لەهەموو روویەکەوە یارمەتیمان بدەن و، هیچ نەبیت حکومەتی ئەمەریکا لەکیشەی کورد ئاگادار بکەنەوە، چونکە وا پیدەچیت ئەوان زانیاریان لەسەر ئەو کیشەیە کەم بیت، لەگەڵ ئەوەی ئەمریکیەکان باش دەزانن لەچ کون و قوژبنیکی جیهان زیری رەش هەیە مەبەستم نەوتە تا هەلی بلوشن.

دوای ئـــەم گفتوگۆیـــە ریزیکـــی زۆریـــان لینـــام وەنـــانیکی ئاکـەزایمان خـوارد، گومـــانم نیـــە ئـەو کۆبوونەوەیـــە لای ئـــەوان تۆمار کراوەوالله أعلم.

من سـەرەتا ویستم بەتـەنیا نـەچم بـۆ ئـەم کۆبوونەوەیـە، بـەلاّم کـەس ئامادەگیری تیدانـەبوو لەگـەلمدا بیـت چ وەك گویگـر یـان وەرگـیر ! لـەکاتی گفتوگـۆ کانمـاندا پرسـیاری ئـەوەیان لیکـردم کەئەگـەر سـەدام حسـەین دانـی بەچارەسـەری کیشـەی کـورد دانـا ئەوا هەلویستم چی دەبیت؟

لـەوەلاّمدا پیم وتن هـەر دوو دەسـتی مـاچ دەکـەم، چونکـە مـن هیچ کیشـەیەکی خـودیم لەگـەلّ دانیـەو، هـەر کـاتیك ئەمـە بکـات ئەوا کورد بەگشتی وەك دۆستیکی خۆی تەماشای دەکات.

هەر لەکاتی گفتوگۆ کانماندا وینەیەکی خـودی زۆریـان گـرتم، کـەدوا جـار بـۆم دەرکـەوت و بـۆم ئاشـکرا بـوو کـەگرفتی ئیمـە لەوەدایـە کـەخاوەن کیـانیکی سیاسـی سـەربەخۆ نـین، ئەگـەر نـا سیاسـەت مـەدارانیکورد گـەلیك زانـاترو دیبلۆماسـیترن لەسیاسـەت مـەدارانی بیگانـەو، زۆر بەئاسـانی دەتوانـن گفتوگۆیان لەگەلّ بکەن و بروایان پیبینن.

لە سەران سەری ئـەو ماوەیـەی کـە لەلـەندەن مامـەوە، لەخزمـەت ئـەو مـامو برایانـەدا چـەندین کـاری گرنـگ و باشـمـان ئـەنجامدا، کەوا لەخوارەوە بەکورتی هەندیکیان باس دەکەم:-

لـەو ماوەیـەدا هەفتـەی جـاریك لەگـەلّ مامۆسـتا ئیـبراهیم ئەحمـەدو کاکە عـەلی کـەمال و کاکـە عومـر مسـتەفا و کـاك دکتـۆر لەتیف رشیدو دکتۆر حمە صالح سعید پیکەوە سـەردانی بـەریز

مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ مان دەکرد، هەندێ جار کاک عومرو کاک لەتیف لەبەر ئەوەی لەدەرەوە بوون بۆیان نە دەکرا لەگەڵماندا بیت، هەروەها مانگی دووجار یان سێ جار لەسەر سفرە رازاوەو خواردنە خۆشەکەی دادە گەلاویژ خان کۆدەبووینەوە، بەقسە خۆشەکانی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو خواردنە بەتامەکەی دادە گەلاویژ کاتیکی خۆشمان بەسەر دەبرد، هەروەها کاکی کاکان و کاکە دکتۆر لەتیف هەمان جۆر میوانداریان بۆ دەکردین منیش هەفتەی جارەك ئەو دەعوەتەم بۆ دووبارە دەکردنەوە، لەکاتی کۆبوونەوەکاندا باسمان لەکیشەی کوردو ریگاچارەی دەکردەوە، بەم جۆرە کاتمان دەبردە سەر، کاتیك دەگەراینەوە مالەوە مات و مەلول چاوەرێی رەحمەتی خوامان دەکرد.

ئەو ماوەیە بەخۆشی ئەو برادەرانە پربوو لەلەش ساغی و تەندروستی، بەجۆریك کەلام گران بوو ئەو برا ئازیزانە جیبهیلم لەندنیش بەگیرفان پریەوە خۆشترە لەوەی خوینەری بەریز بەخەیالی دادێ حزب فەقیر میللەت دەولەمەند. چەند کەسانیکی تری نیشتمانپەروەر کەریکخراو بوون دەیان وت: تۆ بۆ سێ مانگ هاتوویت وا یەك سالە لیرەیت.

لەو بەریزانەی کەوایان پێدەوتم مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو دکتۆ لەتیف رەشیدو کاك عەلی کەمال.

## زانای كورد تۆفیق وەهبی بەگ

مامۆستاو زاناو مێژوونووسی بەناوبانگی كورد تۆفیق وەهبی بەگم بەهۆی خوالێخۆشبوو هاوسەرەكەم شیرین مەعروف رۆستەم بەگی بابانەوە ناسی، لەرێگای خزمایەتی یەكەیانەوە. لەزەمانی مەلەكیەت دووجار بەخزمەتی گەیشتم، تەماشای دەمو چاوویم دەكردوو بێدەنگ دادەنیشتمو گوێم لەفەرموودەكانی دەگرت، لەسالی ١٩٨١یش لەلەندەن بەهەمان شێوە گوێم بۆ دەگرت، زۆر جار برادەران پێیان دەووتم بۆ قسەیەك ناكەیت. منیش وەلامم دەدانەوە ئەو رووداوەی ئەو باسی دەكات لەزەمەنێك دابووە كەهێشتا ئیمە لەدایك نەبووبووین.

بۆمن جێگای شانازی بوو كە لەگەڵ ئەم زاتە مەزنەدا تێكەلاویم پەیدا كردبو،بەرادەیەك كەجێی سەر سورمان بو هەتا لای كورە كانیشی سزاو سروشت، كورە كانی بەوە رازی نەبوون كەئیمە هەموو هەفتەیەك بەكۆمەڵ ئەچووینە لای، زۆر جار پێی دەووتم حیسابی تۆ جیایە، هەر رۆژێنا رۆژێ سەرم بدەیت.

تێكەلیمان بەرادەیەك پەیدا بوو كەجاریكیان هەر دوو كورەكەی لەیەكتر تورە بووبوون مامۆستا تۆفیق داوای لەمن كرد ئاشتیان بكەمەوە، دوو جار دوای كات ژمێر چواری شەو كورەكانی تەلەفۆنیان بۆ كردمو پێیان دەووتم باوكمان تووشی نارەحەتی دڵ بوووەو بەپەلە داوات دەكات. كەئەگەیشتمە خزمەتی داوای لێدەكردم گۆرانی بۆ بلێم، منیش بەم دەنگە

ناخۆشەی خۆم ناچار دەبووم گۆرانی بۆ بلیم، چەندین جار بەدەستی خۆم پەردەپلاوم بۆ لیناوە. ئەم زاتە مەزنە کەبەرامبەری دەوەستایت هەستت بەشەرم دەکرد، وات دەزانی لەبەرامبەر باوکت یان باپیرت یان مامۆستایەکی گەلیك مەزن وەستاویت، کەئەچووینە خزمەتی هەر هەموو مان دەستمان ماچ دەکرد، یەکەم کەس کاکە عەلی کەمال دەستە بەنرخەکانی ماچ دەکرد، لەسەرەتادا لام سەیر بوو کاك عەلی کەمال کە(حاتەمی تەی)ی کوردان بوو بەلکو زیاتریش چۆن دەستی خەلك ماچ دەکات،

بەلام لەدوایدا وام لیهات رۆژی وائەبوو دووجار ئەچوومە خزمەتی و هەردوو دەستەکانیم ماچ دەکرد، لەکاتی گفتوگۆ لەگەلیدا هەولمدا هەندێ لەرابردوو و نهینیەکانی بزانم، کاتیك بمزانیایە تەندروستی باشە هەر پرسیاریك بەمیشکم هاتبایە لیم دەکرد، بەلام هەموو کات ئەو لەمن زاناتر بوو، ئەو قەسپەی من دەم خوارد دەنکەکانی لەگیرفانی ئەو دابوون، هەموو کاتیك ئەگەر پرسیاریکی هەستیارم لیکردبا ئەوا بەفەرەنسی وەلامی دەدامەوە، پاشان دەیووت رەفیق ئەوە وەلامی نیە لەکاتیکدا دەی زانی کەمن فەرەنسی نازانم. لەهەمان کاتدا من ئەوەندەم سوود لەو پیاوە وەرگرتووە کەنانوسریت بەتایبەت لەبواری سیاسەتو چۆنیەتی مامەلەکردن لەگەڵ بیگانەدا. ئەو کتیبانەی کەمن بلاوم کردوونەتەوە ئەگەر ئەم زاتە لەژیاندا مابا هیچیانی نە دەخویندەوە، چونکە لەسالی ١٩٨١ هەمویم بەدەمی بۆگیرابوویەوە، کە لەراستیدا زۆر پێ خۆشحاڵ بوو، بەلام رازی

نەدەبوو بڵاوی بکەمەوە بەڵکو پێیدەوتم بینوسەو لەشوێنێکی ئەمینی دابنێ، با پاش خۆت هەر کاتێك وەختی هات با کورەکانت بڵاوی بکەنەوە. جار جارەش ئەگەر پرسیاریکم لیکردباو بەدلی بووبا ئەوا بەکوردی وەڵامی دەدامەوە لەو ریگایەوە هەندێ نهێنیم پێ درکاند.

رۆژێکیان پێم وت: ئینگلیزەگان وتیان ئێوە دەبن بەحکومەت، بەدورو درێژی هەموو گفتوگۆکانم بۆ ئینگلیزەکان بۆ گیرایەوە وە پێم وت دەمەویت رای تۆش بزانم وتی: من ئەمرم و ئەو حکومەتە نابینم رەنگە کوردکانمان ئەو رۆژە ببینن، لەبارو دۆخێکی وەك ئیمرۆدا بەریتانیەکان بەرژەوەندیەکانی خۆیان بۆ هیچ گەلیك تیك نادەن، وتم بەرای تۆ ئەمریکیەکان یارمەتیمان نادەن؟ لەوەڵامدا فەرمووی ئەمریکیەکان لەکارەکانیاندا تازەن، رەنگە لەدوا رۆژدا لەوردەکاری کیشەی کورد شارەزا بن ئەو کاتە گرنگی کوردستانیان لەرووی دارایەوە بۆ دەردەکەویت.

رۆژێکیان فەرمووی: ( رەفیق من سەرانسەری هەموو ژیانم بۆ خزمەتی کوردو کوردستان بووە، تۆ رۆژێکیان لام بووی کەچەند پزیشکیك لەسەرم کۆبوونەوەو دانیشتنیان بۆ کردووم و، خۆت ئاگات لییە کەرایان وابوو من تەنیایم پێوە دیارە، ئەوەش لەدوای نەمانی دایکی سزاو سروشتەوە بەسەرم هات، من لەژیاندا عاشقی سێ شت بووم بەلام هەرسیکیان دەکەم بەیەك ئەویش کوردستان و کتیبەکانمە. بەداخەوە لەدوای رووخانی مەلەکیەت هیشتا خۆمان نەگرتبوو شۆرشمان بەرپا کرد، ئەوە

بوو لەماوەیەکی کەم دووبەرەکی کەوتە ناومانەوە، کەبەیاننامەی ١١ی ئادار بڵاوکرایەوە هەموو بیرو بۆچوون و هەڵویستی خۆم لەنامەیەکدا رەوانەی مەلا مستەفای بارزنی کرد، داوام لیکرد ئەم دەسکەوتە گەورەیە لەکیس نەدەن ئەویش لەریگای یەکبوون و یەکریزی ناوخۆتانەوە دەستە بەر دەبیت، بەتایبەت لەگەڵ جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد، ئەوە بوو یەکیان گرتەوە، پاشان لەسالی ١٩٧٤ شەردەستی پیکردەوە تا سالی ١٩٧٥، کە لەو سالەدا ئاشبەتاڵ روویدا کەگەورەترین کارەسات بوو بەسەر کوردا هات، بۆیە ئەو بیرو بۆچوونەی پیشتر بەرامبەر مەلا مستەفا هەمبوو گۆراو، بۆم ئاشکرا بوو کە کابرایەك سەرۆکی عەشیرەت بیت ناتوانیت حکومەتی کوردی دابنیت و بەریوەی بیات. من هەر کاتیك لەگەڵ سیاسەت مەداریکی بیگانە گفتوگۆم کردبیت یەکەم قسەو ئاخیر قسەی ئەوەبووەکە پیویستە خۆتان یەك خەن ئەوجارداوای یارمەتی لەووڵاتانی بیگانە بکەن. بۆیە ئەم شۆرشەی ئەورۆ (واتە سالی ١٩٨١) لەکوردستان بەرپا بووە دلخۆشکەرەو جیگای باوەرە، بەمەرجیك بتوانن هەموو کوردیکی ناوچەکە لەدەوری ریکخراوەکەیان کۆببنەوە یەك ریزیان بپاریزن).

جەنابی تۆفیق وەهبی بەگ لەدریژەی قسەکانیدا وتی: (رەفیق چوار ئەفسەرەکان عیزەت عەزیزو مستەفا خۆشناوو محەمەدقودسی و خیروڵا کەبەفەرمانی عبدالالە لەسیدارە دران لەوەسیەت نامەکەیاندا ئیشارەتیان بەمەلامستەفا کردووە بەڵام بەناو نا).

کاتێك کەچوومە خزمەتی و خوا حافیزیم لەخۆی و کورەکانی کرد کەببوون بەهاورییەکی دلسۆزو خۆشەویستم هەر هەموویان دلگرانی خۆیان دەربری بۆ ئەم کۆچکردنەم، هەزار رەحمەت لەگۆرەکەت ئەی ئەو پیاوەی هەموو ژیانی خۆت بۆ خزمەتی گەلەکەت تەرخان کرد.

## مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد

هەرچی مامۆستاو برای گەورەو کورد پەروەر ئیبراهیم ئەحمەدە ئەوا سەرەتای ئاشنایەتیم لەگەلیدا بۆ زەمانی مەلەکیەت دەگەریتەوە، ئەو کاتەی پاریزەری جوتیارە چەوساوەکان بوو دەهاتە قەلادزێ، ئەو کاتە من ناویم بیست پاش ئەوەی ناوبانگی لەناوچەکەدا بلاوببووەوە، ئەو کاتە من دەمم نەبوو قسە بکەم تەنها گویم دەگرت، بەلام ئەوەم دەزانی کەمن کوردمو سەر بەنەتەودو ولاتیکی داگیر کراوم بۆیە لەکانگای دلمەوە حەزێ کوردایەتیم پەیدا کردبوو. سەرەتای ناسینم بەهۆی دوو برای بەریزەووە بوو کەحەمە سوری مینا عارەب و کوری پورم عەلی مام رەزا بوو، کەئیوارەیەکی بەهار لەگەڵ چەند کەسانیك دەرۆیشتن وە بەمنیان وت دوامان کەوە، پاشن ماوەیەك لەرۆیشتن گەیشتینە بەردەم پیاویك کەتەماشای گردی حوسنی دەکرد، ئەو پیاوە دەیەویست هۆی ئەوە بزانیت کەبۆچی ناوی ئەم گردەیان ناوە حوسنی! ئەم ئیوارەیە حەوت کەس دەبووین بەلام دیار بوو کەئەم پیاوە عەلی و حەمە سووری

دەناسی، کاك عەلی وەڵامی پرسیارەکەی دایەوەو وتی:لە سەردەمی دەسەڵاتی تورك لەم ناوچەیەدا، تورکیکی زاڵم خەڵکی ئەم دەڤەرە دەچەوسینیتەوە بۆیە بابەکر ئاغای گەورە ئەنیریت بۆلایو نامەیەکی دەداتێ، هەڵگری نامەکەناوی‌حوسنی‌بەگ دەبیت لەکاتی خویندنەوەی نامەکەدا بۆ کابرای تورکی زاڵم دەیدەنە بەر دەمانچەو دەیکوژن،وە گوایە لەو گردە کوژراوەو نیژراوە.

رۆژگار هاتو رۆییشتو من بوم بەیەکیك لەو چوار کەسە نزیکەی مامۆستای خوا لیخۆش بوو، ئەم پیاوە لەسەرانسەری کوردستاندا جیگای دەستی دیار بوو، هەر بۆیە کاتیك لەسالی ٢٠٠٠ کۆچی دوای کرد تەرمەکەی بەو هەموو شکۆیو ریزەوە هیندرایەوە خاکی وەتەن تا لەباوەشی دایکی گەورەدا کوردستان ئارام بگریّ. منیش وەك هەر هاوڵاتیەك و کورد پەروەریك لەپیشوازی تەرمەکەیدا بەشدار بووم، ئەویش بەهۆی برایەکی دلسۆزی خاوەن ئۆتۆمبیل. لەمەراسیمی ناشتنی تەرمی پیرۆزیدا لەپەنایەك راوەستا بووم، کابرای تەنیشتم باسی ئیبراهیم ئەحمەدی بۆ خەڵك دەکرد، لەو کاتەدا هەستم بەغەریبی دەکردا بەهاوسەرەکەم ئیران فەیزوڵا بەگو کچەکەم رووبارم وت:- بچن سەرەخۆشی لەدادە گەلاویژ خانو دایکی کاکە باقل بکەن، کاتیك ئەگەنە بەردەمی هیرۆخان بەدادە گەلاویژخان ئەلیت ئەمە هاوسەرەکەی رەفیق پشدەرییە، ئینجا گەلاویژخان ئەحوالی من لەهاوسەرەکەم دەپرسیت، خۆشم کاتیك لەپرسەکە هاتمە دەرەوە برای خۆشەویستم دکتۆر لەتیف

ـشـیدکە منـی بینـی خۆشـحالی خـۆی نیشـانداو ئـەولاولای یـەکتریمان مـاچ کـردو وتـی: کـاتیك مامۆسـتا ئیـبراهیم ئەحمـەد ـەنەخۆشخانە بوو ئاگاداریان کردەوە کەرەفیق پشدەری کتیبیی نووسـیوە، لەناوەرۆکەکـەیدا دووجـار داوی لیکـردووی کـەواز ـەسیاسـەت بینـی، بـەلام مامۆستا وتبـووی: وەلامـی بـۆ بنـیرن بابنوسییت چونکە زۆر شت دەزانیت.

کاتیك ویستم لەریگەی دۆستیکەوە جاریکیتر چاوم بەدکتۆر ـەتیف بکەویتەوە، ئـەم دۆسـتە تەگـەرەی هینایـە بـەر ریـی دیداردکەو لەئەنجامدا نەمتوانی بیبینمو گفتوگۆی لەگەلدا بکەم. لەبـەر هەلویسـتی نـامۆی ئـەم دۆسـتە، بریـارمدا بـۆ یـەکجاری پەیوەندی لەگەلدا داببرم. کاك هـەلۆ یەکیك بوو لەوانـەی لەگـەل تەرمەکەدا بوو، کاتیك بینیمی زۆر دلخۆش بووو بانگی هاوریی برای خۆی کردو بەقاو وتی: ئەمە مامتە وەرە بەپیشوازییەوە.

* * *

بنەندە لەگـەل ئـەو بنەمالەیـە تیکەلاوییـەکی زۆرم هـەبووو، زۆرمـان بەسـەر یەکـەوە هەیـە رابردوویـەکی دوورو دریـژو چـەند سالەمان بەیەکەوە بەسەر برد، بەلام ئیستا بەنامەش لەگەل ئەو بنەمالەیە بەسەرکردنەوەی یەکترمان نەماوە، بریارم داوە انشـاء الله دوای تـەواوکردنی بـەرگی پینجـەمی زنجـیرە کتیبـی "کـورد دوژمنـی خـۆت بناسە" کتیبیکـی سـەر بـەخۆ لەسـەر ئـەو پیـاوە مەزنـە بنوسم، بۆ ئـەوەی بتـوانم بـەتیرو تەسـەلی بـاس لـەو زاتـە گەورەیە بکەم هەروەها بۆ خوینەری خۆمـی روون بکەمـەوە بۆچـی

ئاشقی ئەو پیاوە مەزنە بووم. بەڵام لێرەدا پێم باشە ئەگەر بەکورتیش بێت هەندێك لایەنی مەزنی ئەو پیاوە بخەمە روو.

لەرووی زیرەکی و شارەزییەوە ئەم زاتە پرۆفیسۆریکی سەربەخۆ بووو، کاتێك لەگەڵ سیاسەتمەدارانی بیگانەی دۆست و دووژمن دادەنیشت ئەوا دەکەوتنە پرسیارکردن لەماموستاو پێیان دەوت چی بکەین باشە؟ وەکو قوتابی لەبەر دەستی‌دا بێ دەنگ و بەریزەوە گوییان بۆ شل دەکرد، لەوانە: یاسر عەرەفات، سالح مەهدی عەمماش، سەدام حسەین، ئەحمەد ئەمین مەحمود، ناجی تالیب، رەجەب عەبدولمەجید، سەدیق شەنشەل، ئەحمەد حەسەن بەکرو چەندین کەسایەتیی ناسراوی‌تری پێیە بەرز.

من لەنزیکەوە ئاگادار بووم کەئەو خەلکانە چ ریزیکیان لەو پیاوە دەگرتو، من هەموو ئەوەی کەفیری بووم‌و زانیم لەو زاتە پیرۆزەوە بوو، هەروەها یارمەتی دام‌و پشتی گرتم بۆ ئەوەی بمپاریزیت لەهەلەو لەهەمان کاتدا پییبگەم، بۆیە هەرچەند لەسەر ئەو پیاوە بنوسم کەمە. جاریکیان دوای هەشت سەعات بیرکردنەوەو خۆ ماندووکردن بۆ دارشتنی نامەیەك بۆ سەرۆکی لیبیا دۆستی دیرینی نەتەوەکەمان، کاتیك نامەکەم تەواو کرد بەماموستای خۆم بەریز ئیبراهیم ئەحمەدم نیشانداو پیم وت: تکایە ماموستا چاویکم بۆ بەم نامەیە بخشینە، کەتەماشای کرد پیکەنی و نامەکەی گۆری‌و، لەبری ئەوە نامەیەکی‌تری نوسی کە لەچوار دیر پیك هاتبوو، کاتیك چوومە لای بالوێزی لیبیا و نامەکەم دایە دەستی بەریزیان نامەکەیان بەرز کردەوە بۆ

شوێنی مەبەست، لەدوایدا دلنیا بووم بەهۆی ئەو چوار دیرەی ئامۆستاو، بالویزو حکومەتی لیبیا ئەو ریزە زۆرەیان لەمن گرت.

ئەم زاتە لەگەڵ ئەو پیی‌ە بەرزەی کەهەی بوو لەهەمان کاتدا پیاویکی سادەو ساکارو لووت بەرز نەبوو، جل‌و بەرگ‌و خواردن بەلایەوە هیچ کرنگیەکی نەبوو، زۆر جار پیم دەووت ئەوجل‌و بەرگە لەتۆ نایەت، لەودلامدا دەی وت ئەلیی تۆو کاك تەها محیەدین بران، چونکە هەردووکتان حەز بەجل‌و بەرگی جوان دەکەن، چەند جاریکیش بەیەکەوە لەدوای چوونە دەرەوەمان لەمالەوە پیم فەرمووە کەبرسیمە بابرۆین لەم چیشتخانەیە نان بخۆین، بەلام ئەو دەی فەرمووو برسیتە یان حەز دەکەی کریکارەکانی ئەو چیشتخانەیە لەخزمەتت راوەستن‌و، رەبابچینە ئەم لا کۆلانە خواردنەکەی لە٨٠٪ هەرزانترە، ئەم پیاوە بەجۆریك رەفتاری لەگەڵ دەورو بەری خۆیدا دەکرد کەوات دەزانی لەهەموویان بچووکترە.

خەمی هەرە گەورەی ئەو پیاوە ئەوەی ئەمن شارەزای بووم و ناسیم تەنهاو تەنها رزگارکردنی کوردستان بوو، ئەو بەجەستە لەلەندەن دەژیا بەلام بەگیان‌و دڵ لەکوردستاندا دەژیا، نیوەرۆیەکیان سەعات دووی پاش نیوەرۆ لەمالی ئەوان لەWALTIONG لەهۆلەکە دانیشتبووم، مامۆستا لەمەدبەخەوە بانگی کردم‌و وتی: بیستوومە لەکوردستان زۆر گەراوویت‌و زۆربەی شوینەکانیت بینیووە، ناوی گوندیکی کوردستانم پیبلی کەجوان بیت وەکو ئەو نمە بارانەی ئیستا لەدەرەوە

بەسەر ئەو درەختە سەوزەو گلە پاكو گولە جوانانە دەباریت ببیت، منیش هەر چەند بیرم كردەوە كە لەكوردستاندا چ گوندیكم بینیوە كەوەكو ئەم دیمەنە سروشتییە جوانو سەرنج راكیش بیت هیچم بەخەیالدا نەهات، لەم كاتەدا مامۆستا وتی ناخۆشترین گوند لەكوردستان كەهاتبیتە بەر چاوم و تەنها بۆیەك شەو تیا مابمەوە گوندی(      )ە ، بەلام هەموو ئیرە بەقوربانی ئەو گوندە ناخۆشە بیت، رەفیق پیت وایە رۆژیك دابیت كوردستان سەربەخۆ بیتو مالی ئیمە لەو گوندە بیت !

ئەو پیاوە مەزنە ئەوەندە كەسیكی رۆشنبیر بوو ئەگەر پارەی بەشی نان خواردنی رۆژیكی لەگیرفان دابا نیوەی ئەدا بەكتیب، شەویكیان دوو بەدوو لای كاك عەلی كەمال دەگەراینەوە، لەناو پاسیك لەتەنیشت یەك دانیشتبووین، باسی كوردستانمان دەكرد لەو كاتەدا جابیەكە پیی وتین: ئیوە دەبوو لەویستگەی ڤیكتۆریا دابەزینایە، بەلام سێ خال لەو ویستگەیە تیپەرینو ئیوە دانەبەزین، دەمو چاویشتان لەوە ناكات بۆ پارەكە بێ ! مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدوەلامی دایەوە تاپارەكەی بداتێ، كچە جابیەكە وتی مێن بۆ پارەم نەبوو، ئیمە هەر دەگەریینەوە ڤیكتۆریا ئەو كات دابەزن، پاشان بەمامۆستام وت تۆچیت بەو سەر ئیشەیە داوەو، للەی ئەگەر بەندە دەستی شیعرم هەبوایە یان دەستی نووسین ئەوا هەرگیز سیاسەتم نەدەكرد، مانەوەی تۆ لەلەندەن گومت دەكات جیگای شیاوی تۆ شاخەبەرزەكانی كوردستانە، هەر بۆیە كاتیك گەیشتمەوە ناوزەند بارەگای سەركردایەتی یەكیتی بەناوی مامۆستائیبراهیم ئەحمەدەوە

ئاگاداری مام جەلال و کاکنەوشیروان مستەفام کرد کەراسپاردەی مامۆستا ئیبراهیم ئەوەیە دەیەوێت کەژیان لێرە لەناو ئەو شاخانە وەکو پێشمەرگەیەکی ئاسایی بەسەر بەرێت.

دوایی لەرێگای کاك شازاد صائیب وەلآمی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدم دایەوەو پێم راگەیاند کەمام و کاك نەوشیروان دەڵێن ژیان لێرە زۆر سەختەو، لە ترسی دووژمن زوو زوو لەم شاخ بۆ ئەو شاخ دەگوازینەوە، ئێرە بەهیچ شێوەیەك بۆ نووسینەکانی مامۆستا ئیبراهیم نابێت.

رۆژێکیان مامۆستا پرسیاری لێکردم وتی: من هەموو شتێکی تۆ دەزانم، نهێنیت نەماوە لای من ئاشکرا نە بێت و، باشیش دەزانم رۆژێك لەرۆژان یاداشتنامەکانی خۆت تۆمار دەکەیت و، هەر چیەك دەربارەی من دەنووسی گەردەنت ئازا بێت، بەلآم حەز دەکەم دڵی خۆتم بۆ بکەیەوە تا بزانم ئەوە چیە لەدڵتایەو شەرم دەکەی پێم بڵێیت، ئەو رۆژەودی دەستت داوەتە سیاسەت کام رۆژو ساڵەت بەردەوام لەبیرەو لەیادت ناچێت؟ ئازارو ئەشکەنجەی سەدامحسەینە یان چییە ؟ زۆر خۆشحاڵ دەبم ئەو راستیانەم پێ بڵێیت.

منیش وتم: ئەوەی بیری لێدەکەمەوەو هەرگیز لەیادم ناچێت، ئەوە نیە کەسەدامحسەینئازارو ئەشکەنجەی داوم، چونکە من توانیوومە تۆڵەی لێبکەمەوە چی خراپە بەرامبەری کردوومە. من ئەوەی بیر لێدەکەمەوەو خەفەتی پێوەدەخۆم ئەوەیە کەماوەیەکی دوورودرێژ ی تەمەنم بەخۆرای رۆیشت، ئەویش جەنابت و هەموو برادەرانی ئێرە ئاگادارن لەیەکەم رۆژی کەکاك

حلميى ومام جەلال تەشريفيان هێنا بۆ بەغداد، تا لەگەڵ عەبدولڕەحمان عارف رێك بكەون، تاكو ئەو رۆژەی بەياننامەی ١١ی ئادار دەرچوو وە تا دوای ئەوەی كەئێوە خۆتان بەدەستی خۆتان رێكخراوەكەتان تواندەوەو چونە پاڵ شۆڕشەكەی مەلا مستەفا، لەو كاتەدا ئێوە داواتان لێكردم كەبۆ بەرژەوەندی گشتی لەگەڵ حكومەت و لەناو دامودەزگای ئەمنيدا بمێنمەوە، دوای سێ ساڵ مام جەلال رووبەروو پێی وتم لەرێگەی خۆتەوە راستەوخۆ پەيوەندی بەخودی مەلا مستەفاوە بكە، راستە بەهۆی ئێوە بەتايبەتی جەنابت توشی هيچ هەڵەيەك نەبووم و خەڵكێكی زۆرم ناسی بەتايبەتی سياسەتمەدارانی عەرەب و خزمەتێكی زۆری میللەتی خۆم كرد، بەلام لەساڵی ١٩٦٦وە تا ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ هەمو ئەوەی لەو ماوەيەدا كردمان بەبادا چوو، چونكە بنەماڵەی بارزانی توانييان سەركەوتن بەدەست بهێنن و سەروەت و سامانێكی زۆر كۆ بكەنەوە، بەلام من بەپێچەوانەی ئەوان ئەوەی لەحكومەتيش دەستم دەكەووت لەگەڵ ئەوەی هەم بوو لەپێناوی بارزانیدا سەرفم كرد.

مامۆستا ئيبراهيم وتی: رەفيق لەبيرتە لەساڵی ١٩٦٧ پيم وتی مەلا مستەفا سەركەويت و ژيركەويت كورد ناميٽيت، بەيانيەكەی هاتيەلام و نانی بەيانيمان بەيەكەوە خواردوو هەوليكی زۆرم لەگەڵ دای تا بروات بەو قسيە پيبينم، ئيستاكە ساڵی ١٩٨١دو وا ديارە بروات بەو قسەيە هيناوە !! دوای ماوەيەك لە گفتوگۆ ، بێ ئەوەی تەواو قايل بم بيدەنگيمان لە باسەكە كرد ، بەلام ئەوەی لە ساڵی ١٩٩٦دا رووی‌دا وای ليكردم بروا بە قسەكانی

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بکەم چونکە کارەساتی ٣١ی ئاب وای لیکردم بە روونی بروا بەوە بینم کە هەم سەرکەوتن هەم تیکشکانی بارزانی ، تیاچونە .

پیش رۆیشتنم لەلەندەن چومە خزمەت مامۆستا ئیبراهیم و بنەمالەکەی، یەکە یەکەخوا حافیزم لیخواستن و سوپاسمکردن کەئەو ماوەیە بەم جۆرە میوانداریان کردم و ریزیان لیگرتم، کەرەنگە لەو ماوەیەدا زیاتر لە ١٥٠جار یەکتریمان بینیبێ، لەکاتی خوا حافیزیدا دوعای تەمەن دریژی و بەختەوەرم لەدلیکی پاکەوە بۆ دەخواستن، بەتایبەتی بۆ مامۆستاو مامی دلسۆزو خۆشەویستم ئیبراهیم ئەحمەد.

## دکتۆرلەتیف رەشید

کە لە فرۆکەخانەکەی هیثرۆ لەلەندەن دابەزیم، کاکە هەلۆی کوری مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بەدکتۆر لەتیفی ناساندم کە لەم کتیبەدا زۆر ناوی ئەو زاتەم هیناوە بەلام ئەو گەلیک لەوە زیاترە پیویست بەمن بکات باسی بکەم.

دکتۆر پیاویکی رۆشنبیرو سیاسەتمەدارە، یەکەم دانیشتنمان لەچیشتخانەیکدا بوو کە لەگەڵ هەندیک لەبیانیە ئینگلیزەکان دانیشتین، کەپیشتر لەم کتیبەدا باسم کرد، لەکاتی وتو ویژ پرسیاریان لە . دکتۆر کرد خەلکی چ شاریکی لەئینگلترا؟ وەلامی دانەوە وتی من کوردم، دوبارە هەمان پرسیاریان لی کردەوە، ئەمجار وتی: من تەمەنم ١٧سالان بوو

هاتم بۆ ئینگلترا بەنیازی خوێندن، ئیستا ئەندازیارم، بەڵام من کوردمو لەدایك بووی سلێمانیم لەکوردستانی عێراق. من پێم سەیر بوو کەبۆچی ئینگلیزەکان ئەو پرسیارەیان لەدکتۆر کرد، بەڵام کاتێك وتیان ئەمە یەکەم جارە مرۆڤێکی بیگانە کەخەلکی ئێرە نەبیت بەم جۆرەی تۆ بەزمانی ئینگلیزی بدوێت، بڕوات شەبیت ئینگلیزیکی ردسەنی خەلکی ئیرە ئاوا ڕ ..ئۆ پیك قسەناکات. ئەو جار تێگەشتم بۆچی ئینگلیزەکان پێیان سەیر بوو کەدکتۆر وەلامی دانەوەو وتی من کوردم. ئەو ئینگلیزیە باشەی دکتۆر ببووبە کیشەیەکی گەورە بۆمن، چونکە ئینگلیزیەکەی من لەچاو هیی ئەو دووکەلی دەکرد، هەر کاتێك پێکەوە دانیشتنمان لەگەل ئینگلیزەکان بکردبا من تەنها گوێم دەگرت و وەلامی هیچم نەئەدایەودگەر چی باشیش لەپرسیارەکان ئەگەیشتم، هەر چەندە کاکە هەلۆ ئەیوت مامە ردفیقئینگلیزیەکەی باشەو، هەر کاتێ بەتەنیا لەگەڵ ئینگلیزەکان دانیشتبام بەئاسانی تێك دەگەیشتین و هیچ کیشەیەکمان نەبوو، کو چەند دانیشتنیکی سیاسیم بەتەنیا لەگەلیاندا ئەنجام دا. ئەو هەموو ماوەیەی لەگەڵ ئەو بەریزانە پێکەوە بووین بەبێ فەرمانی ئەوان نەجولامەوە، بۆ نموونە یەکەم جار لەلەندەم لەئاپارتمانیك بووم، بەریز د. لەتیف پێی وتم: لەبەرئەوەی فلانە کەس بەئیرە دەزانی پیویستە بگوازیتەوە، نابیت لەگەلی دابنیشیت، شەر بۆیە بەیانیەکەی زوو لەو شوینە گواستمەوە.

ئەو برا دلسۆزە بەفەرمانی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو مام جەلال لەهەموو رویکەوە کۆمەکی دەکردمو هەمیشە بەیەکەوە بووین، بەلام لەپرسەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد چاوەروانی ئەوەم دەکرد بۆ پینج دەققەش بەسەرم بکاتەوە، بەلام لەبەرئەوەی زانی بووی من یەکیتی نیمو سەربەخۆمو وردە وردە دەستم کردوە بەنوسینەوەی یادوەریەکانم بەبێ لایەنانەو راستگۆیانە هەموو ئەو نهینیانەی کەدەی زانم دەخەمە سەر کاغەز وەکو خۆو بەبێ دەستکاری، لەهەمان کاتدا کابرایەکی لی قەوماوو دەست کورتمو خاوەنی دوانزە سەر خیزانمو لەیەك خانوو داین بۆیە خۆی لی بەدوور دەگرتم. هەروەها گوومانم نییە لەوەی کەجەنابی مامۆستای خوالێخۆش بوو کاتێك فەرموو بووی تەلەفۆن بۆ من بکە من وا دەکەم یەکتر ببینین. هەر ئەو د لەتیف وای کرد ئەو کارە سەر نەگرێ، هەرچەندە ان بعض الضن اثم. ئەو ماوەیەی لەخزمەت کاکە لەتیف دابوومو یارمەتی زۆری دام پیم وە ماندوو بووو، هەمیشە ئۆتۆمبیلو مالەکەی بۆ من لەهاتوچۆو بەردەست دابوو، هەرچەندە من کتیبەکانم بۆ نارد بۆ ئەوەی بیخوینیتەوە بەلام ئەو تەنها لەسالی ١٩٨١ وە دەیخویندوە چونکە هەر هەموو نهینیەکانم بەدوورودریژ ی دەزانێ.

## کاك عەلی کەمال

ئەو پیاوە یارمەتی زۆری هەژارو لێ قەوماوانی کوردی داوە، بەتایبەتی خویندکارە کوردە ئاوارەکانی لەندەنو، زۆر خویندکاری لەدەرەوەی ولات پێ گەیاندوە، بۆیە هەر چەند لەسەر خانەدانی ئەو پیاوە بنوسین تەواو نابیت.

دوای گەیشتنم بۆ لەندەن بەحەوت رۆژ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو کاك عەلی کەمال تەشریفیان هینا بۆ لامو، لەو ماوەیەی کە لەلەندەن بووم هەموو هەفتەیەك دوو جار یان سێ جار یەکترمان دەبینی بۆیە زۆر چاك شارەزایی نهینیەکانی ژیانی یەکتر ببوین، ئەگەر ئیستا لەژیاندا ما باو کتیبەکانی منی کەوتبا بەر دەست ئەوا دلنیام لەدوای سالی ١٩٨١ دەوە دەیخویندەوە چونکە هەموو ئەو شتانەی ئەو کاتە دەم زانی بۆیم گیرابووەوە. ئەو پیاوە دەیزانی من رۆژیك لەرۆژان یاداشتەکانی خۆم بلاو دەکەمەوە، بۆیە رۆژیکیان پیی وتم: کورە رەفیق کەمردیشم نهینییەکانی من بلاومەکەرەوە، بۆ سەباحی کورم زۆر خراپە لەو کاتەدا دەستی بۆ ئەو دووکەسە دریژ کرد کەدانیشتبوون، تا ئیستاش یەکیکیان لەژیاندا ماوە، لەوەلامدا منیش وتم: لەقینی صەباح و سزاو سروشت هەرچی دەیزانم لەسەر تۆو مامۆستا تۆفیق بەگ دەینوسمەوەو بلاوی دەکەمەوە.

ووتــی: کــەگیرابووی یەکــەم جــار لــەوە دە ترســام باســی نهێنییەکانی من بکــەی و بــەگرتم بــدەی و، لامــم دایــەوە وتم: ئــەو نهێنیــەی تۆ کــەدەم زانــی و ئەم درکانــد یــەکێك لــەو هــەزار شــتەی لەگەڵ خۆمدا پاراستبووم.

پاشان بەکاك عەلیم وت من بەدروو ریـژی ئـەوەم خستە بـەردەم مەکتەبی بـارزانی کەپارەیـەکی زۆر دەتـوانم چـەند ســەرکردەیەکی رژێمــی بەعســی بــۆ لای خۆمــان رابکێشــین و لــەرێگای ئەوانــەوە کێشەی کورد بەرەو چارەسەرکردن بەرین، لەراپۆرتەکاندا ئـەوەم بەبارزانی راگەیاندبوو کەئـەم کـارە لـەگرتنی هـەولێرو سـلێمانی گرنگترە، بەڵام مەکتـەبی بارزانی ئـەوە بـوو ئێمـە بەبـەرتیل مـافی کــورد وەرنــاگرین، ئێمــە شــۆرشمان هەیــەو بــەهێزی پێشــمەرگە ئەژنۆ بەخەڵکی عۆجەو تکریتـدا دەدەیـن، ئـەو پارەیـەش بەسـەر خێزانی پێشـمەرگەدا دابەش دەکـەین، مـن تـا دوای ئـاش بـەتاڵ و دەرچوونــی کتێبەکــەی د. مــەحمود عوســمــان لەســالی ١٩٧٧ ماهیــەتی ئــەو بنەماڵەیــەم بــۆ دەرنەکــەوتبوو وەنــەم دەزانــی ئــەوانیش وەکـو ئاغاکـانی عۆجـە پـارەو دەسـەڵات لایـان هـەموو شتێکەو ئەوەی لای حیسـابی بـۆ نـەکریت خـێزانی پێشـمەرگەو جەماوەرە.

کاکە عەلی وتی: من نەم دەزانی کـە لـەرێگای پـارەو پوولـەوە دەمانتوانی ئەو کارە ئەنجام بدەین، هـەروەها نەشـم دەزانــی کـە لەرێگای تۆوە دەتوانین بەم کارە هەستینو، لڵاهی مـن درەنـگ بـەم شتەم زانی دەنـا ئامادەیم تیدا بـوو بۆ ئەم مەبەستە ملیۆنێك تـا دوو ملیـۆن دینـارت بدەمـێ. کـاتی خـۆی بـەرێز کـاك عـەلی کـەمال

داوای لێ کردبووم کەزەعیم صدیق مستەفا تیرۆر بکەم چونکە دەستی لەخوێنی گەلی کورددا سوور ببوو، هەروەها ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری خەلکی دەداو خەلکیکی بێ تاوانی زۆری زیندە بەچاڵ کرد، بەمەبەستی تیرۆرکردنی ئەم تاوان بارە من زۆر خۆم لێ نزیك کردەوە زوو سەردانیم دەکرد، من دەم ویست لەدوای تیرۆرکردنیدا مە ترسی بۆ سەر من و کەمالی برام نەبیت، چونکە ئەو خزمەتە جۆراو جۆرەی کەمن بەشۆرشم دەکرد، گەلی گەورەتر بوو لەتیرۆرکردنی تاوانباریك، لەهەمان کاتدا ئەم کابرایە مالەوەی جێنەدەهیشت بەبێ ژمارەیەك لەپاسەوانان، بۆیە تەنها ریگای تیرۆرکردن ئەوە بوو بۆی بچمە مالەوەو لەکاتی میوانداریدا بیکوژم، کەئەم کارەش لەسەدا سەد بەم شیوەیە ئاشکرا دەبوو، بۆیە دەبوو راکەین و ریسەکەمان بکەینەوە خوری.

*تیبینی:*

کاتیك لەتەموز سالی ١٩٦٨ بەعسیەکان هاتنە سەر حوکم، ماهیەتیان بۆ خەلك دەرکەوت و خالی لاوازییان (نقطة الضعف) بەئاشکرا زانرا کەبریتی بوولە پارەو جنس، من لەگەڵ دووەمیان بەهیچ جۆریك پەیوەندیم نەبوو، هەرچی پارەیە ئەوەبوو کاریگەری بەسەر بەعسیەکانەوە لەوە سەرچاوەی دەگرت کاتیك ئەوان هاتنە سەر دەسەلات بەشی هەرە زۆریان هەژار بوون و دەتوانم بلیم خاوەنی هیچ نەبوون، من لەو کاتە ژمارەیەکی

زۆریانم دەناسی وەتوانیم لەریگای ماستو پەنیرو هەنگوینو گوێزو جار جارە فەرشیش خۆم لێیان نزیك ببمەوە، پاشان دەستیان کرد بەپارە کۆکرنەوەو کۆمپانیا دانان، من لەراست خۆمەوە وام زانی کەئیتر تێریان خواردو گیرفانیشان پر بوو کەچی لەدوایدا بۆم دەرکەوت ئەوان هەر دەلێن هل من مزید پاشان رۆژگار هاتو رۆیشتو هەموو گەلی عیراق بۆیان دەرکەوت ماهیەتی بەعس پارەوسیکس و دەسەلاتە، بۆ نموونە چەند جاریك نازم گزار ئەیووت کاکە رەفیق: ئەمانە کەی تێر دەخۆن،

هەروەها سەرکردەیەکی تری بەعس رۆژیکیان وتی: پارچە ئەرزیك لەگەرەکی مەنسوریە هەیە بەناوی عەبدوللا لوتفیە، بزانە پیی نالێی بم داتێ چونکە من خزمەتی کوردم زۆر کردوەو ئامادەم زۆر زیاتریش بکەم.

ئەو تازە دەولەمەندانەی ئیستا پەیدا بوو ون دەستکردی بەعسن، من خەلکی وام پێ شك دیت دوای ١٤ ملیۆن دۆلاری جیهیشتو کەس هەر باسیشی ناکات.

هەزار رەحمەت لەگیانی پاکت کاکە عەلی کەمال وە ئینشائەللا جیگای ناوەراستی بەهشتە لەکاتیکدا ئەوەم دەنووسی دەربارەی خوالیخۆش بوو لەرۆژی هەینی لەبەرواری ٢٠٠٠/٩/٢٩ بازیانو رەوەزی کورمو نەوەکەم کاکە باوان هاتنە لامو وتیان ئەمرۆ هەینییە لەکام مزگەوت نویژ بکەینو، لامم دانەوەو وتم دەچینە مزگەوتی عەلی کەمال.

عومەر مستەفا ناسراو بەعومەر دەبابە.

برادەران بەگشتی ناویان کاکی کاکان ئەهینا، ئەوەش لەخۆشەویستی ریزەوە بوو، ئەو پیاوە مامۆستایەکی رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرو سیاسەتمەداریکی ناسراو بوو، چالاکیو فیداکاری خۆبەختکردنی ئەم زاتە داستانیکی سەربەخۆیە کەمن بەکورتیو بەچەند دیریك باسی دەکەم، ئەوەی کاکە مەم لەکتیبی یەکەمیدا لەسەر ئەو زاتەدا بلاوی کردۆتەوە زۆر کەمە ئەوەی یەك رۆژ لەنزیکەوە لەگەڵ ئەم زاتە ژیابیت وەشارەزایی رابردوی ببوبیت دەزانێ کەبەکتیبیکی سەربەخۆ تەواو نابیت، هەر چەندە من لەبەرگی یەکەمو دووەمدا باسم لیوە کردوە بەلام من دووبارە لیرەش باسی لیوە دەکەمەوە.

کاتیك گەیشتمە لەندەن دووەم ماڵ کەسەردانیم کرد مالی خوشکی گەورەو بەریزم سورەیا خانی کچی مەلای گەورەی کۆیە بوو، دوای چەند رۆژیك کاکە عومەر تەلەفۆنی بۆ کردمو دوای سلاو ریز پیی وتم سەردانی سورەیاو مندالەکانیت کردوە: وتم دووەم ماڵ سەردانی ئەوانم کردوە، نانی بەیانیو نیوەرۆو ئیوارەم لەگەڵ خواردون ئینجا گەراومەتەوە مالەوە، کاکە عومەر هەر کاتیك چووبا بۆ دەرەوەی لەندەن لەکاتی گەرانەوەیدا یەکسەر پەیوەندی پیوە دەکردمو، کو لەکتیبی یەکەمو دووەم باسم لیوە کردووە، کاتیك کاك عومەر دەبابە کۆچی دوایی کرد کاکەنەبەزی کوری گەرایەوەو سەردانیم کرد، ئەویش زۆر

تەماشای کردمو نەی ناسیمەوە هەتا لەپر پیم وت من رەفیق پشدەریم، بەدلیکی پر لەگریانەوە وتی ئەوە مامە ردفیقە.

*تیبینی/*

لەسەرەتای گەرانەوەی بارزانیدا لەهەموو دانیشتنیکدا باس باسی عومەر دەبابە بوو، چونکە بارزانی زۆر پیی موعجیب بوو، بەلام لەدواییدا دوای دووبەردکیەکە بوو بەعومر تەنەکە. تا ئیستا کەسانیك هەن قسەی ناشیرین بەم سەرکردە کوردە دەلین، ئەمانە جۆرە خەلکیکن هەق و ناهەق جودا ناکەنەوەو هەموو خەمیکیان کۆکردنەوەی پارەو دەسەلات گرتنە دەستە، هەروەها رازی کردنی مەسعودو نیچیرڤانی سەرۆکیان هەر بەو پییەی کە بارزانی پیرەوی دەکرد، بەلام من لە یادی ئەم شۆرەسوارە دا دەلیم هەزار رەحمەت لەگیانت ئەی کەلەپیاوی شۆرشگیرو گەورە.

## ڕۆیشتنم بۆ سوریا

کاتێك لەفڕۆکەخانەی سوریا دابەزیم برایانی بەڕێز کاك شازاد سائیب* و کاك ئاوات عەبدول غەفور** و دارۆی شێخ نوری پێشوازیان لی کردم، لەسەر داواکاری خۆم وتم لەبەر ئەوەی ئێستاش دوو هەزار پاوەنم پێ ماوە دەچمە ئوتێل، بەیانیەکەی کاك شازاد صائیب تەشریفی هێنا بەشوێنمدا بۆ ئەوەی نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین، بەڵام لەپرسگەی ئوتێلەکە چوار کارمەندی ئاسایشی سوریایی لی بوو پاش ئەوەی کەناوی منیان پرسی منیان برد بۆ بەڕێوەبەرێتی ئاسایشی گشتی سوریا، هەرچەندە کاك شازاد هەولیدا کەمنیان لەدەست دەربهێنێت بەڵام بەقسەیان نەکرد، لەوێ کاربەدەستێکی ئاسایش بەتوندییەوە وتی: تۆ لەلەندەنەوە لەلایەن موخابەراتی عیراقیەوە نێردراوی و، ئێمە هەموو زانیاریکمان لەسەر تۆ هەیە، بۆیە واباشە خۆت دان بەتاوانەکان دابنێی ئەگینا تووشی ئازارو

---

* شازاد سائیب: دەرچووی کۆلیجی ماف، تێکۆشەرێکی شۆڕکێڕو چاو نەترس، زیرەكو ڕۆشنبیرێکی خۆراگر، نیشتمانپەروەرو سیاسەتمەدارێکی ناسراوی کوردستانە، لەبنەماڵەیەکی ناوداری شاری سلیمانییە.

** ئاوات عبدولغفور پیاوێکی زیرەكو ئازاو نیشتمان پەروەرو ڕۆشنبیر بوو، لەبەندی خانە یەکترمان ناسی، لەناوزەند یەکترمان گرتەوە لەسوریاش کەوتینەوە لای یەك، لەبەندی خانەدا نموونەی خۆراگری بوو لەدەروەشدا نموونەی شۆڕشگێری. پرشنگ خانی هاوسەری لەبەندی خانەدا لەناو خزشکانیتردا دیار بوو، لەچالاکی و خزمەت گوزاریدا وەختە بلێم گەلێك لەئاوات بەوەفاترە.

ـی ڤیزە لەسوریا سەردانی بالویزخانەی ئیرانم کرد ـتی.

ـەتا من وام ئەزانی وەرگرتنی ڤیزەی ئیران لەریگەی ـە ئیرانییەوە کاریکی ئاسانە، چونکە ئەمە یەکەم جار بوو ـتی بارەگایەکی رەسمی حکومەتی ئیرانی بکەم بۆ کاریکی ـە بەلام پاش ئەوەی ١٥ جار بالویزی ئیرانم بینی بۆ ـرتنی ڤیزە بێ سوود بوو، ئەو کابرایە هەر چەندە هەتا ـتی بالویزم بکردبا بەپیرمەوە دەهات و پیشوازی گەرمی ـردم بەرادەیەك کاتیك دوو کوردی لیقەوماو هاتن و بینیان ـی بالویزخانەی ئیران ئاوا پیشوازیم لی دەکات، وتیان: ـە دەسەلاتت زۆرە بۆیە ئاوا بەگەرمی پیشوازیت لی دەکەن، ـەم کابرایە هەموو جاریك کەپیم ئەوت ڤیزەم ئەویت هەر ـوت چشم هەر زووش ئەیووت فردا. بۆیە ڤیزەکەیان هەر بۆ ـردم لەگەڵ ئەوەی چوار مانگ هاتوو چۆمکردن، بەلکو بەم ـە ئاهەفتەکەی تر خۆیان لەم کارە دەدزیەوە. لەو رۆژەوە من ـزمدا جاریکیتر بۆ هیچ کاریك روولە بالویزی ئیرانی ـەمو، بەبرادەرەکانی خۆم وت: با بەهەموومان یەکیك ـنەوە تاکو تیمان بگەیەنیت وشەی (چشم و فردا) لە چ ـیکدا بەکار دیت و بۆ وا شوومن. بالویزی ئیرانی ئەو کات ـی محتشمی بوو، کە لەدوایدا بوو بەوەزیری ناوخۆی ـزی ئیسلامیو، لەبەر ئەوەی کابرایەکی توند رەو بوو لەکار ـخرایەوە. ئەو چوار مانگەی سوریا زۆر بەخۆشیو ـرانی بەسەر چوو، ئەویش بە هۆی ئەو برا بەریزانەی لەوی

ئەشکەنجەی زۆر دەبی. وتم راستە من لەموخابەرات بووم بەلام لەسالی ١٩٧٦ دوە لەلایەن رژیمی عیراقیەوە گیرامو، کاتیک لەلەندەن بووم سەردانی بالویزی سوریم کردوەو خۆم پێ ناساندوە، چوار رۆژ پیش ئیستاکە ملحق العسکری السوری لەندەن هاتە لامو سەردانی کردمو داوای لی کردم کەبەیانیەکەی پیکەوە بچین بۆ سوریا، بەلام من لەبەر چەند هۆیەك نەم توانی ئەو کاتە بەقسەی بکەم لەو کاتەدا ژمارەی تەلەفۆنی ملحەقەکەی دایێ بۆ ئەوەی خۆی تەئکید لەو مەسەلەیە بکات، هەروەها پێ وت: پاشان من کادیریکی یەکیتی نیشتمانی کوردستانمو ئەو برایانەی دوینی پیشوازیان لی کردم نوینەری یەکیتین لیرە، من لەدەستی رژیمی بەعسی عیراقی رام کردووە ئیستا ئیوە بۆ پیشوازیم لی دەکەن ؟ دوای چوار سەعات منیان بەردا بەلام ئەو شتانەی کەپیم بوو هەر هەموویان بەسەر خۆیان دابەش کردبوو کەهەموویان کەلو پەلی زۆر چاك بوون، بۆیە دەستم کرد بەکۆکردنەوەیان یەك شتم بەجێ نەهیشت، ئینجا داوای بەرتیلیان لی کردم منیش وتم خۆشم سیخورم فلسیك نادەم لەدوای ئەوەوە چوار مانگو دە رۆژ لەسوریا مامەوە.

## ئاگاداری

کاتیك کە لەلەندەن بوم، جاریکیان مامم بینیو فەرمووی ئەگەر ڤیزەت هەبایە لەگەل خۆم بۆ ئیرانم ئەبردی. بەلام لەبەر ئەوەی ڤیزەم نەبوو نەم توانی لەگەلیدا بچم، بۆیە بەنیـ

-ی عیراقین و لە ترسی رژێمی بەعس هەڵاتووین و هاتین بۆ
- کاتێک لێرە دائەنیشن گفتوگۆ لەسەر رژێمی عێراقی
-ین و یەکمان خۆی دەکات بەدکتاتۆر سەدام و ئەوەی ترمان
-ی دەکات بەموعارەزە. کەکابرا ئەوەی لی بیستین زۆر کەیفی
-ە هات و خۆشحاڵ بوو.

- بارەگای یەکێتی لەسوریا چەند کەسێکمان لەخۆمان
-وو بەلێپرسراوی هەمیشەیی، من عایدی خواردن
-دکردن بووم، هەر کادیرێک لەدەرەوەی سوریا هاتبا دەبوو
-ی نان بخوات، هەندێک لەو کادیرانەی دەهاتن لە ترسی بۆلە
-ی من ئەگەر لەدەرەوەش نانی بخواردبا کاتێک ئەهاتە لای
-ە دووبارە نانی دەخواردەوە. هەرچی د. شادمانبوو
-راوی قاپ و قاچاخ شتن بوو، جار وابو ئەوەندە بێزار
-ی پیی ئەوتم رەفیق گیان خواردن لی مەنێ، هەفتەی یەک جار
-ـ ئەخۆین بەسە.

-وارەیەکیان کابرایەك هاتە بارەگای یەکێتی داوای منی کرد،
-یش لەگەڵیدا چووم، پاش ماوەیەك کەگەرامەوە باش بوو
-امیکی مەکتەبی سیاسیی لی بوو، ئەویش برای بەرێز کاك
-یر دەبابە بووکە لەماڵی خوالیخۆش بوو د. خالید حەمە
-مید دابەزی بوو. منیش ئاگادارم کرد لەوەی کەئەم کابرایە
-چی هات بۆ لام و بۆ کوێ چوو، پێم وت ئەم کابرایە نێردراوی
-ریە المخابرات العامە هی سوریا بوو منی بۆیە برد، لەوێ
-وای ئەوەیان لیکردم کەبۆیەکجاری لێرە بمێنمەوە و ببمە
-یخوری رژێمی سوریاو، پێم وتن ماوەی چوار سعات گفتوگۆم

بوون‌و، كـو د. مـه‌حمود عـه‌لى عوسمـان* و ئـاوات عه‌بدولغه‌فو
مالى د.خاليد حه‌مه سه‌عيدو مالى د. فواد مه‌عسومو خوشـ
نه‌رمين عوسمـان خوشكى شـه‌هيد جه‌عفـه‌رو عـه‌زيز عـه‌قر
كه‌ميوانى حكومه‌تى سوريا بوو له‌يانه‌ى سه‌ربازى دابه‌زى‌بوو
هـه‌ر به‌هۆى ئه‌مـه‌وه عـه‌بدولائۆجئالانم ناسـى، بـه‌لام ئـه‌و كاتـ
شاره‌زايه‌كى باشم له‌سه‌ر نه‌بوو. له‌و كـاتدا – ١٩٨١ – تـازه نـ
پارتى كريكارانى كوردستان بلاو ئه‌بووه‌وه.

له سـوريا به‌شـى زۆرى ئيواره‌كـان له‌گـه‌ل د. شـادمان مه‌ســ
به‌يه‌كـه‌وه ئه‌چووينـه چاخانه‌يـه‌ك دائه‌نيشـتين، بـۆ كـات بـه‌ـ
بـردن‌و گفتوگۆ. شـه‌ويكيان كـابراى خـاوه‌ن چاخانه هاتـه لامـ
وتـى ده‌مـه‌ويت چـه‌ند پرسـياريكتان لى بكـه‌م، چونكـه به‌راسـ
سـه‌رم لـه‌ئيوه سـورماوه، پاشـان وتـى مـن ئيـوه هـه‌ر به‌يه‌كـ
ئه‌بينم، به‌يه‌كه‌وه ده‌رۆن‌و به‌يه‌كـه‌وه دينـه‌وه‌و به‌يه‌كـه‌وه هـه‌ر قـ
ئه‌كه‌ن، توخوا پيم نالين ئيوه چ كـاره‌ن‌و كيـن ؟ پيمـان وت: پـ

---

* دكتـۆر مـه‌حموود عـه‌لى عوسمـان: ده‌رچـووى كۆليجـى پزيشـكييه، مرۆڤيكـى رۆشـ نيشتمانپه‌روه‌رو سياسه‌تمه‌داريكى ناسراوه. كاتيك له‌سوريا بوو، هه‌فته‌ى دوو جـار ده‌مبينـى له‌مالى ئه‌ودا ده‌خوارد، چ خواردنيكم به‌دل بوايه بۆيان ئاماده ده‌كردم. يه‌كيك وتبووى: تۆ نـ يه‌كيتيى نيشتمانيى كوردستانيت، كه‌چى ده‌بينـم ئـه‌وه‌نده‌ى ســه‌ردانى دكتـۆر مـه‌حموود ـ ـ ئه‌وه‌نده سه‌ردانى ئيمه ناكه‌يت. پيم وت: خيزانى دكتۆر مه‌حموود كچى كاكـه‌زياد ئاغايـه. ـ له‌پاريسه‌وه ته‌له‌فونى بۆ كردووه كه‌من ديمه سورياو ده‌بيـت چـاوديرى‌و خزمـه‌تم بكـه‌ن، ئـ وتبووى: ئيمه قه‌رزارى ره‌فيقين‌و هه‌رچه‌ند خزمه‌تى بكه‌ين له‌چاكه‌ى ده‌رناچين.

دكتۆر مه‌حموود ده‌يوت: ئه‌گه‌ر شوقه‌كه‌مان بچووك نه‌بوايه بۆ يه‌كجارى ميوانداريمان ده‌كرديت داواى ليبوردنت لى ده‌كه‌ين.

ـەگەڵکردن بۆ ئەوەی بڕوایان پێ بینم کەمن ناتوانم ئەم کارە بکەم، بۆیەکاتێك دڵنیا بوون من نابمە پیاوی ئەوان وتیان: دوای ٤٨ سەعاتی‌تر دەبێت سوریا بەجێ بێلیت. کاك عومەر کەزانی ـدزعەکە چۆنە بڕیاری‌دا ٢٠٠٠ دۆلارم بۆ سەرف بکات، هەر ئەو شەوە چوومە الخگموگ الجویە البولندیەو بلیتێکم کڕی بە٧٠٠دۆلار، بەیانیەکەی زوو چوومە بالویزخانەی پۆڵەنداو ئەویش ڤیزەیەکم بۆ سێ‌مانگ وەرگرت.

دوای تەواوکردنی کارەکانم‌و خۆ ئامادەکردنم بۆ سەفەر، بۆدڵنیایی زیاتر هاتمە مالی برای گەورەم مام جەلال ئەوانیش بێ ئەندازە خزمەتیان کردم‌و بۆ شەوی دووەم سەعات ٢ بەئۆتۆمبیلەکەی مام جەلال چوومە فرۆکەخانەو رۆیشتم. کەگەیشتمە وارشۆی پایتەختی پۆڵەندا لەئوتیلFOURMدابەزیم، دوای ٧ رۆژ لەوێ گواستمەوەو چوومە دەرەوەی شار لەوێ ئاپارتمانیکم گرت، لەو ماوەیەدا برای دڵسۆزم کاك حەمە فەرەج بۆ گەشتوگوزار سەردانی ئەوێی کردبوو، ئەوەبوو یەکترمان بینی‌و چەند رۆژێك بەیەکەوە بووین‌و، لەبەر ئەوەی من زمانی ئینگلیزیم ئەزانی ببومە چاو ساغیان. لەو ماوەیەدا کوردەتای سەربازی لەپۆلنەندا رووی دا لەئەنجامدا بڕیاریاندا هەرچی بیگانەیە نەهیلن بیتە ناو ولاتیانەوەو ئەوانەش کە لەناوەوەن بەتایبەتی رەش پیستەکان هەر هەموویان دەربکرین، من بۆ ماوەی ٤٢ رۆژ دوای ئەم بڕیارە مامەوەو کەس پرسیاری لی‌نەکردم، چونکە جل‌وبەرگم وەکو

ئەوان بوو، بەراددیەك كەكاتیك كاك حەمەی فەرەج یەكەم جار منی بینی نەی ناسیمەوە. ئینجا هاتمە ئەستەنبوڵ.

كە گەیشتمە ترانزیت لەتوركیا بۆ ماوەی ٢ سعات زیاتر دانیشتم، چونكە توانام نەمابوو ریگا بجرم لەبەر ئەوەی لەكاتدا مەشروب خۆر بووم شەورۆژ یەك بتڵ ویسكی یەك چارەك قۆدگام ئەخواردەوە. دوای تەواو بوونی ریو رەسمیترانزیت سواری ئۆتۆمبیل بوومو هاتمە ناو شاری ئەستەنبوڵ لەوێ لەئوتیلی یوزن دابەزیم. كەهاتمەوە سەر خۆم و ماندوی سەفەرم نەما خۆم بەخۆم وت: رەفیق تۆ باوكت حاجیو دایكت حاجی عەیب ناكەی ئەو مەشروبە ئەخۆیتەوەو، رە پیاو بەو مەشروب تەرك كە. ئینجا خۆم بەخۆم وت: ناتوانم، پاشان وتم كورە پیاوبەو مەخۆرەوە. دوای ئەوە هەستامو ئاویكم بەخۆم داكردوو دەست نویژم گرتو دوو ركاعەت نویژی سونەتم كرد، پاشان وتم: خوای گەورە پەیمانت ئەدەمێ هەتا لەژیاندا مابم نەیی خۆمەوە. ئیوارەكەی بۆ پیاسەكردن هاتمە دەرێ، لەریگا چاوم بریە ئەو شووشە مەشروبانەی دانرابوون ویسكی، شیریو، جن، عارەقو شەراب، چەند دەقیقەیەك وەستامو بەخۆمم وت: تۆ پەیمانت بەخوا داوە بۆت نیە بیشكینی، لەو رۆژەوە دەمم لی ی نەداوەتەوە كەوابزانم مانگی یەكی سالی ١٩٨٢بوو.

دوای ئەوەی ٤ رۆژ لەئەستەنبوڵ مامەوە هاتمە دیار بەكر، لەوێ هەموو ئەوشتە بەنرخانەی پیم بوون فرۆشتم، لەو كاتەشدا ١٠٠ پاوەنم لەWESTERN BANK بەحەوالە بۆم هات بۆیە پارەیەكی باشم دەست كەوت. دوای ئەمە بەهۆی كەسیك

کەناونیشانەکەیم لابوو هینامیە ماردین، بەپارەی خۆم‌و بەیارمەتی ئەو برا بەریزانە ئۆتۆمبیلیکی مونشەئە مان گرت، کەبرایەکی ئەرمەنی کورد سایەقی بوو کەسەر بەریکخراویکی ئەرمەنی بوو کەلیپرسراوەکەیان لەسوریا بوو وە دۆستیکی دیرینی یەکیتی بوو. لەریگەی خۆیانەوە شتیکی وایان تەرتیب کرد کەگوایە وەفدیکی ئەرمەنی لەعیراق هەن و ئەو ئەچیت ئەیان هینیتەوەو، منیش کابرایەکی عیراقیم‌و مافی گەرانەوەم بۆ عیراق هەیە، بەریّ کەوتین‌و سەعات ١٠ ی شەو گەیشتینە ئیبراهیم خەلیل، لەویّ لەخالی گومرگ لەبەر ئەوەی هیچم پیّ نەبوو بەئاسانی دەربازم بوو.

دوای ئەوە هاتینە بەشی جەوازات، تەماشای سجلەکەیان کرد بینیان هیچ کاریکی قەدەغەم لەسەر نیە، بەلام سیخورەکە پرسیاری لیکردم‌و وتی: حاجی هۆی چییە ئەوەندە لەدەرەوەی ولات ماویتەوە؟ منیش وەلام دایەوە وتم من پارەدارم‌و پیویستم بەپشوودان هەبوو چونکە نارەحەتی دلم هەیە. دوای ئەمە هەندیّ شتی بیّ نرخم دانیّ بۆیە هەموو سەعاتیکم پیّ نەچوو ریگایان پیّ داین برۆین. بەرەو موصل کەوتینە ریّ، کەگەیشتین ئەو برا بەریزانە لەگەلم دابوون کاغەزیکیان پیّ نوسیم‌و پیان ئیمزا کردم کەبەسەلامەتی گەیشتومەتە جیّ، هەر ئەو شەوە چوومە هەولیرو لەمالی شەفیقی مەلایان باوکی خەرمان خانی هاوسەری کەمالی برام مامەوە، بری ٢٥ دینارم لەکاك شەفیق وەرگرت، بەیانیەکەی زوو چوومە مالی برادەریك، لەویّ کەمالی برام هاتە لام‌و بەهۆی ئەویشەوە چوومە بەستەستین لەویوە

خۆم گەیاندە ناوچەی ئازادکراوی قەلاتوکان، ئەوجار چوومە ناوزەنگ کەبارەگای سەرکردایەتی یەکیتی نیشتمانی لی بوو، لەپرسگەی مەکتەبی سیاسی کاك حەمە دیارو کاك ئاسۆ لیپرسراوانی پرسگەکە زۆر ریزیان لی گرتم، جەنابی مام جەلالیش هەر هەمان شەو دووجار تەلەفۆنی بۆ کردمو ئەحوالی پرسیم، دادە هیرۆخانیش تەلەفۆنی لەگەلّدا کردم، هەر لەهەمان ماوە کاك د. کەمال خۆشناو سەردانی کردم، دوای دوو شەو جیگایەکی تایبەتیانبۆ دابین کردم.

لەو کاتەدا بەفریکی زۆر باریبوو کەژیانیکی سەختو سەرمای بەدوای خۆیدا هینابوو، ئیمەش تازە لەو نازو نیعمەتەی ئەوروپاوە هاتبووینەوە، کەبۆ من وەزعیکی ناخۆش بوو. هەمو بارەگایەك زەخیرەی زستانی بەشی خۆی دانابوو، لەنەوت دارو ئاردو شتومەکیتر تەنها ئیمە نەبیت، کەشەش کەس بووین کورو براو خوشکەزاو کورە پور. یەکەم شت تەوالیتو گەرماویکم بەو زستانە سەختە دروست کرد، کەناچار بووین بەو زستانە سەختە تەنها بەرۆژ خۆمان بشۆین چونکە حەمامەکە بەلایلۆن چوار دەوری گیرابوو شەوانەش بەهۆی تیشکی روناکی گلۆپەکان دەردەکەوت. دوای ئەوەی خۆمان ریکخستو کەلو پەلی پیویستمان بۆ زستان دابین کرد کەوتینە حەسانەوە، دوای ئەوە هەموو ئەو سەرکردانەی ریزیان لی گرتینو دەعوەتیان کردین روو بەرووی پیم وتن: چی زەحمەتەو پیتان ناکریّ بەبەندەی بچوکتانی بسپیرن ئامادەم بۆتانی ئەنجام بدەم.

وەتیان: سەختترین شت و گرنگترینیان لای ئیمە، کەبەئیمە هەلناسووریت زەخیرەیە. یەکسەر ئیمە دەستمان کرد بەگواستنەوەی خواردەمەنی لەقەلادزێوە بۆ ناو زەنگ وەبەنرخی حکومەت دەمان فرۆشتەوە، ئەم خواردەمەنیانە لەناو شاردا لەریگای جەمالی برام و فەخریەی خوشکم کۆئەکرایەوە وەبەهۆی بازیان و جەلال و مەریوان و محەمەد بەولاغ ئەیانگەیاندە ناو زەنگ.

لەناو بەشیکی سەرکردایەتیی و کادیرانی یەکیتی‌دا مقۆمقۆی ئەوە بلاوبۆوە کەرەفیق پشدەری چۆن لەسووریاوە هاتەوە عیراق و گەیشتەوە ناو زەنگ و چۆن ئەو هەموو کەل و پەلەو خۆراکە لەناو قەلادزە کۆدەکاتەوەو دەیهینیتە ناو زەنگ و بەنرخیکی زۆر هەرزان دیفرۆشیتەوە! رۆژیکیان مام جەلال ئەو پرسیارانەی لی کردم منیش وەلام دایەوە وتم: من کەچومە قەلادزێ و حەوت رۆژ مامەوە ۲۱ کەسم بینی، کەبەشی زۆریان پارتی و شیوعی بوون بەشەکەی‌تریشیان یەکیتی بوون. پاشان ناوەکانیم پێ گووت، بەناوی خۆم داوام لیکردن کەخۆراکمان بۆ کۆبکەنەوەو، پیم وتن لەبری ئەوەی پارەم بدەنێ بۆ ئەوەی بیگەیەنمە شۆرش زەخیرەم بەنرخی حکومەت بۆ پەیدابکەن.

لە لایەکی‌ترەوە لەلایەن خزمان و برادەران و بەشیك لەریکخراوە حزبیەکان توانجیان تێ‌دەگرتم و دەیانوت: رەفیق بۆتە کاروانچی و خەریکی چیشتخانەو هوتیل دانانەو ئازوقە دەفرۆشیتەوە وە لەو ریگایەوە سامانکیکی زۆری کۆکردۆتەوەو، دەشیان وت ئەو خواردنەی رەفیق لەریگای بەعسەوە دیت و

ردنگە لەداهاتودا هەمووومان ژەهر خواردو بکات، لەگەڵ ئەوەی لەبەرئەوەی لەشەمو ناوزەنگدا دوو کەس ڤیدیۆو تەلەفزیۆنی هەبوو کەمام جەلال و من بووین، شەوانە پیشمەرگەکان بۆ پێشوودان ددشاتنە لام و مالەکەم ببو بەقەلەبالغترین بارەگای پیشمەرگە قاردمانەکان، جگە لەچەندین خزمەتی‌تر، جاریکیان هاوسەرەکەی جەنابی شیخ عزەدین سیاسەتمەداری کوردستانی ئیران وتی: ئەم بارەگایە زۆر ریك و پیکە ئەگەر لەمەهاباد بوو بەکرییەکی باشی دەکرد، ئینجا بەم جۆرە پیشوازی لەپیشمەرگەکان دەکەن ؟

رۆژیکیان خواردنیکی تایبەتی و خۆشم بۆ نەخۆشخانەی شۆرش برد، کەبریتی بوو لەدوو جۆر برنج و دوو جۆر شلەو گۆشت و کاستەر، پیشتریش تەلەفزیۆن و ڤیدۆیەکم پیشکەش کردبوو. جەنابی مام جەلال دوای رۆژیك لەم کارە پرسیاری لی کردم و وتی: رەفیق دوینی چیت بۆ نەخۆشخانەی شۆرش کردوە ؟ منیش زۆر لەسەرخۆ وتم: شتیکی هاکەزایی، وتی: دەك خوا موەفەقت نەکات، دەبووە ئەو کارە من بیکەم بەلام بەمن ناکریت، بەراستی تۆ حاتەمیتەی کوردانی، دەبوایە نیوەی سەروەت و سامانی کورد هی تۆ بوایە.

## شەڕی نێوان هێزەکانی
## کۆماری ئیسلامیو پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران

لەکاتی ئەوەش کەشەڕی نێوان یەکێتی نیشتمانیو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەساوان ڕوویدا مام وتی: ڕەفیق بزانم چیمان بۆ دەکەی، منیش شەش فەردە ئاردم بەهۆی خزمانی گوندی شینێوە کرد بەناوساجیو بەرەو دەشتی ساوان بەریم کرد، کەمام جەلال سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد، کاتێك پێ ڕادەگەیێنن ئەوەیان بۆ هاتووە بەپێشمەرگەکان دەڵێن سەرە بگرنو بەدەستە بەنرخەکانی خۆی دابەش دەکات.

هەر چەندە من بەگشتی ئەم شەڕانەم بەزیانی گەورەم دادەنا بۆ گەلەکەمانو، کاتێك شەڕ لەنێوان حزبە کوردییەکانی کوردستانی عێراق ڕوویداو هەواڵی شکانی حزبی شیوعیو پارتیو سۆشیالیستم بیست زۆر پێم ناخۆش بوو بەکارێکی خراپم دانا بۆ ئەوساو داهاتووی ڕۆژی کورد. لەوکاتە د. خدر مەعسوم کەپیاوێکی ئازاو زیرەكو نیشتمانپەروەرو لەخێزانێکی کوردی کۆیی ناسراو بووو، ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوو سەردانی کردمو بەدوور ودرێژی باسی شەڕکەوتنەکانی یەکێتی بۆ کردم بەسەر پارتیو حزبی شیوعی دا.

باسی بەدیل گیرانی کەریم ئەحمەد ی بۆ کردم و تێك شکاندنی چەند مەفرەزەیەکی پارتی کە لەدەشتی هەولێر بوون بۆ کردم. منیش وتم: کاکە خدر ئەم قسانە لای من مەکە، چونکە

من دژی شەری برا کوژیم و لەداهاتووشدا زیانی گەورەی بۆ گەلەکەمان دەبیت، من بمزانی بایە ئەوە وەزعی شۆڕشی کوردە هەرگیز رووم نەدەکردە ئیرە. ئینجا سەردانی برای بەریز مام جەلالم کرد، دوای ئەوە گەرامەوە بارەگاکەی خۆم و بەمالەوەم گوت: لەم رۆوە سەردانی هیچ بارەگایەکی یەکیتی مەکەن و، خەتی تەلەفونیشم پچراندو، کاتیك کاکئەحمەد حداد کەکادیریکی حزبی دیموکراتی ئیران بوو بەمەبەستی ئاشتی هاتبووە ناوزەنگ بینیم و پیم وت: من ئەمەویت لەیەکیك لەشاخەکانی کوردستان چادریك هەلدەم و لەویوە بۆ بەرژەوەندی ولاتەکەم بەپیی توانا کار بکەم٥. رۆژیك پیش گواستنەوەم لەناوزەنگ برای زۆر بەریزم کاك مولازم عومەر عەبدوللا نانی نیوەرۆی لەگەلّ خواردین، دوای نان خواردن بۆم روون کردەوە کەمن هەر چەندە لیرە ئەرۆم بەلام لەهەر شوینیك بم لەخزمەتی یەکیتی دام و، بەوچەند کەسەی لەگەلم دایە ئەتوانم خزمەت بکەم. ئەو ماوەیەی لەریزی یەکیتی دابووم، پەیوەندییەکانم لەگەلّ هەموو ریکخراوو حزبەکانیتردا پچراند بوو، سەردانی بارەگای هیچیانم نە دەکردو، بەبێ فەرمانی سەرکردایەتی یەکیتی نەدەجولامەوە.

---

٥ لەو ماوەیەدا داوام لەهیچ کەسیکی یەکیتی نەکرد یەکیتی بەجێ بهیلیت، بەلام ئەوانەی سەردانیان دەکردم بەئاشکرا پیم ئەوتن کەئەم شەرە لەبەرژەوەندی گەلەکەماندا نییەو پیویستە هەر هەموو مان دژی بوەستین.

ئەو ٧ ڕۆژەی لەقەڵادزێ بەنیازی دەست وەشاندن لەبنکەی پۆلیسی قەڵادزێ و گرتنی شارەکە بووو مامەوە لەپەیوەندی بەردەوام دابووم لەگەڵ مام جەلال. ئەوانەی بەریز خالە هەمزە سەر پەرشتی دەکردن، ئامادەنە بوون بەشداری بکەن چونکە بەئاشکرا لایەنگیری حکومەت بوون. خالە هەمزە هەرچەندە بەناو پۆلیس بوو، بەڵام دلسۆزو بەدەسەڵات بوو، لیپرسراوی بنکەی پۆلیسی قەڵادزێ بوو.پی جیبەجیکردنی کارەکە خالە هەمزە وتی چەند کەسانی هەن کەگوایە لەو کارەدا بەشدار دەبن، بەڵام جێی گومانن. بۆیە ئیمەش وازمان لەکارەکە هینا. من گەرامەوە بۆ ناوزەنگ و مەسەلەکەم بۆ مام جەلال گیرایەوە.

دوای ماوەیەك ناوزەنگمان بەجێ هیشت بەهەشت ولاخەوە بەئاشکراوو بەرۆژ بەبەر چاوی خەلکییەوە هاتینە دەرەوە، سەرەتا چوینە گوندی شینێ و لەویش لەماڵی دۆستی دیرینی بنەماڵەکەمان کویخا عبدولا ماینەوە، دوای ئەوە چووین بۆ گوندی وەردە لەناو کوردستانی ئیرانی ئازاد کراو، لەوێ بووینە دراوسێی کاك سەعید کویستانی رابەری تەشکیلاتی سەردەشت، دوای ئەوە یەکسەر بۆ بەرژەوەندی گشتی دەستم کرد بەسەردانی بارەگاکانی حزبیی شیوعیی و سۆشیالیست و دیموکراتی ئیران، ئەوانیش بەگەرمی پیشوازیان لی کردم.

لەلایەن حزبی دیموکراتی کوردستانی ئیرانەوە موهەندیس ئاریان لەبارەگای خۆی لەبیتووش چاوی پیمان کەوت، وتیان چەك و یارمەتیت ئەدەین و، داوات لی ئەکەین کەهەندیك خەلك هەن لەقەڵادزێ زۆر دژایەتی مان ئەکەن بۆمان لەناو بەریت.

منیش پیم وتن: ئایە ئیوە ئامادەگیریتان تیدایە تا لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان ئاشت ببنەوەو.من ببمە ناو بژیکەر لەنیوانتان دا. بۆ ئەم مەبەستە نوسراویکم ئاراستەکردن و وینە یەکیشم ئاراستەی کاك مەسعود کرد لەریگای بازیانی کورمەوە، لەم نوسراوەدا بارودۆخی ئیستای کوردستانم لەسایەی شەری برا کوژی یەوە باس کردبوو، نیازی خۆم ئاشکرا کردبوو بۆ ئەوەی بەکاری ناوبژیوانی هەلبستم و، لآمی بارزانی ئەوە بوو کەوا ئیمە لەئیستاوە شەرمان راگرت و، وتبووی: ئیمە هەموو یارمەتیەکتان ئەدەین تا سەرکەوتوو بن لەکارەکانتان. هەر چەندە بارزانی بۆ ماوەی چوار رۆژ بازیانی کورمی لای خۆی هیشتبووەوە ریزیکی زۆری لی گرت بوو، بەلآم ١٪ بەلینەکانی جیٓ بەجیٓ نەکرد.

بۆ هەمان مەبەست پەیوەندیم بەهەموو ئەو کەسانەوە کرد کە لەمالی خۆیان دانیشتبوون و پەیوەندییان بەهیچ ریکخراویکەوە نەبووو، داوام لیکردن بەئەرکی نیشتمانی خۆیان هەلبستن بۆ ئەوەی بتوانن هەموومان ئاویك بەو ئاگرە دابکەین کەخەریکە هەموو خەرمانی کورد دەسوتینیٓ، ئەوانیش هەر هەموویان وەلآمیان ئیجابی بوو، هەر چەندە ئەو کاتە ژمارەی هەر هەموومان٦ کەس زیاتر نە ئەبووین بەلآم لەدوارۆژدا ٧٥٪ جەماوەر پالپشتی دەکردین، کەئەمەش ریژەیەکی گەورەبوو بۆ سەر ئەو حزبانەی کەپییان ئەوتن حزبی شەش کەسی.

برایانی یەکیتی کەبەم جموجۆلە ئاشکرایەی منیان زانی بوو، بەهەرەشەیان دانابووبۆ سەر خۆیان و، پیشتر کاتیك بەمام جەلال

ێـن وتبوو فەرمووبووی کە خەبەریان دامێ ڕەفیق جیا دەبیتەوە پێم وتن باجیا بیتەوە هیچی پیناکرێ، بەڵام کەزانی خەلکی ئاوچەکە وا لەدەوروم کۆدەبنەوە بڕیاری گرتنی دام و فەرمووبووی: ئیستا ڕەفیق خەتەرە. سوپاس بۆ خوا کەهاتن بۆ گرتنمان تەنها من و موختار عبدوڵا حاجی غەریب لەوێ مابووین، چونکە ئەگەر برادەرانی‌تر لەوێ بوویان تەسلیم نە ئەبوین و ئەوانیش ئیمەیان دەکوشت.

سەعات چوار یا پینجی ئیوارە بەبەند کراوی گەیشتینە ناوزەنگ، لەوێ لەیەکتریان جیا کردینەوەو یەکسەر موختار عبدوڵا حاجی غەریب یان گولە باران کرد، منیش بەفەرمانی مام جەلال زیندانی کرام. دوای بیست و چوار سەعات دایکم و رووبارو ڕەوەزو قادری برام سەردانیان کردم، یەکسەر کەچاوم پییان کەوت گریام، ئەمە یەکەم جار بوو لەزیندانا چاوم بەدایکم بکەویت و بگریم، چونکە پیشتر لەهەموو ئەو بەندی خانانەی بینی بووم بنکەی پۆلیس، ئاسایش، موخابرات نەگریابووم، بۆ نموونە لەزیندانیەکانی ئەمن و فەلوجەو ڕومادی و خانەقین و کفری و کەرکوك و هەولیرو موسل کەدایکم ئەهاتە لام بەخۆشحالیەوە بەپیریەوە ئەچووم و دەستە پیرۆزەکانیم ماچ دەکرد، بەڵام بەندکردنی ئەم جارەم جیاوازە لەبەر ئەوە هۆی گریانەکەم سێ شت بوو:

١-هەرگیز بڕوام نەدەکرد کەکورد دەسەڵاتی هەبیت لەبەر هەر هۆیەك بیت من بگریت.

٢-ئەو رەفتارەی لەو زیندانیەدا لەگەلم کرا لەهیچ بەندیخانەیەکی‌تردا نەم بینی بوو.

٣-پیشتر لەدوژمنانی گەلی کوردم بیستبوو کەهەر کاتیك کورد دەسەلاتی هەبیت زالمە، ئەو رۆژەدا باوەرم بەو رۆژەهات.

دوای ٢٦ رۆژ بەبەند کراوی گواسترامەوە بۆ باوزێ، لەوێ ١٠ رۆژ لەژوریکدا بەتەنها مامەوە، کەئازاریکی دەرونی زۆرم بینی، ئینجا گواسترامەوە بۆ بەرگەلو رابەری بەندی خانەکە کاك عومەر عەزیز وتی: تۆ بەفەرمانی سەرکردایەتی لیرەیەت بۆیە من هیچ دەسەلاتم نییە، بەلام لەگەل ئەوەشدا خزمەتیکی زۆری کردم کەهەرگیز لەبیرم ناچیت. ئینجا منیان هینایە ناو بەندیخانەی گشتی کەهەموو جۆرە بەند کراویکی تیابوو، بۆیە ناچار بووم لەنان خواردن مان بگرم، لەو کاتەدا کاك ئاوات عبدولغفور هات و مان گرتنەکەی پیشکاندم و ژووریکی تایبەتی بۆ دروست کردم، لەو ژوورەدا لەگەل دوو بەندکراوی‌تری سیاسیدا بووم، کاك ئاوات حەیوانیکیشی بۆ ناردم کە لەگەل دووبەندکراوەکەدا خواردم. دوای پەنجا رۆژ لەبەندکراوی بەر بووم.

برایانی بەریز (٦) کاك مستەفا چاورەش و کاك عومەر عەبدوللا فەرموویان: لەم رۆوە سەربەستی بەکەیفی خۆت دەتوانیت روویەکەیتە هەر شوینیك و، ئەگەر بریاری دەرەوەی ولاتیشتدا ئیمە یارمەتیت ئەدەین. منیش وتم بۆ هیچ لایەك

---

٦ برای بەریزو دلسۆزم کاك مستەفا چاو رەش لەیەکەم رۆژی بەبەند کراوی گەیشتمە سەرگەلو هەلویستیکی بێ وینەو زۆر جوانی بەرامبەر بەمن هەبوو کەهەرگیز لەیادم ناچێ.

ـارۆم‌و ئـیره بـه‌جێ نـاهیلم، چونکـه دلنیـام ئیـوه لـه‌دوا رۆژدا گفتوگۆ له‌گه‌ڵ حکومه‌تدا ده‌که‌ن، ئه‌و کاته منیش به‌یاننامـه‌تان ـه‌سـه‌ر ده‌ر ده‌که‌م. ئـه‌وه بـوو پـاش ماوه‌یــه‌ك گفتوگـۆ لـه‌نیوان یه‌کیتی حکومه‌ت ده‌ستی پێکرد له‌هه‌مان کاتدا جه‌ژنی نه‌ورۆز ـاته پیشێ، مـن هـه‌ر له‌سـه‌رگه‌لو مامـه‌وه‌و نه‌هاتمه خواره‌وه، مـن ـای خۆم بۆ خه‌لکانی ده‌ورو پشتم ده‌ربری‌و وتم: ئه‌و کۆبوونـه‌وه زۆره‌ی خــه‌لك بــه‌ده‌وری ســه‌رکرده‌کانی یــه‌کیتی بــه‌و شــیوه ئاشـکرایه زیـانیکی گه‌وره به‌یـه‌کیتی ده‌به‌خشـیت، چونکـه ئه‌مـه ده‌بیته هۆی ئه‌وه‌ی سه‌دام حوسین‌و به‌عسی یه‌کان به‌گشـتی مه ترسی یه‌کیتی بـۆ سه‌ر خۆیـان بزانـن. لـه‌دوای‌دا به‌یـه‌ك جـاری له‌گوندی سه‌رگه‌لو جیگیر بووم.

خـه‌لکی سـه‌رگه‌لو که‌بــه‌م جـۆره یارمــه‌تی‌و خزمــه‌تیان کـردم هه‌رگیز لـه‌بیرم ناچیتــه‌وه، به‌تایبـه‌ت برایـانی خۆشه‌ویسـت کـاك ئه‌حـمه‌د حـاجی حه‌ســه‌ن و عـه‌بدولره‌حمان وه‌سـتا محه‌مـه‌د کـه تائیسـتا دۆسـتایه‌تی‌و برایه‌تیمان هه‌ر به‌رده‌وامه.

گونـدی سـه‌رگه‌لو لـه٤٠٠ مـاڵ پیکدیـت که‌به‌گشـتی خانـه‌دان‌و نیشتمانپه‌روه‌ره‌نو، ماله‌کانیان هه‌موو کاتیك شـوینی حه‌وانـه‌وه‌ی هـیزی پیمه‌رگـه بـووه. کـاتی وا هـه‌بووه ٣٠٠٠ هـه‌زار پیشـمه‌رگه لــه‌و گونــده‌دا نــان دراوه. جــێی خۆیــه‌تی گــه‌ره‌کیك یــان قوتابخانه‌یـه‌ك یان شــه‌قامیك بـه‌ناوی ئـه‌م گونـده‌وه نـاو بنریت. دوای ئه‌وان چوومه قه‌لادزێ‌و ماوه‌یـه‌ك له‌خزمه‌تی مامۆسـتا مه‌لا ده‌لگه‌ی مامـه‌وه، کـه له‌هـه‌موو روویکــه‌وه خزمـه‌تی زۆری کـردم، دوای دوو هه‌فته له‌خزمه‌تی ئه‌و برا به‌ریزو به‌وه‌فایه چوومه لای

جەنابی مام جەلال، ئەویش بەفەرمانێك منی وەك نوێنەری یەکێتی داناو وە ناردمی بۆ چاو پێکەوتنی مستەشارەکان، بۆ ئەودی بێنە ناو ڕیزی شۆڕشەوە، تەنها بۆم نەبوو لەگەڵ دوو سەرۆك جاشدا دانیشتن بکەم ئەویش تەحسەین شاوەیسی و قادر فەرەج بوون.

بەڵام لەگەڵ زۆربەی سەرۆك جاشەکان کۆبوونەوەم کردو، کو لەپێشتردا بەدرێژی باسم لێوە کرد، ئەوەی لێرەدا پێم باشە باسی بکەم ئەو گفتوگۆو چاو پێکەوتنانەیە لەگەڵ دووسەرۆك جاشدا ئەنجامم دا.

**یەکەم/ حەمە خانی حاجی دارا لە زەرایەن:**

شەو سەعات نۆ بەمەبەستی جێبەجێکردنی فەرمانی مام جەلال گەیشتمە گوندی زەرایەن، لەوێ چوومە مالی حەمەخان ئەوانیش بەپەلە پێشوازیان لێکردمو سەرەتا وایان زانی کوری حاجی ئەحمەدمو لەبەغداوە هاتوومو زەویم داگرکراوە بۆ ئەوە هاتم زەویەکەم بۆ وەرگرنەوە، بیە یەکسەر پێی وتم: بەیانی ئەچم زەویەکەت بۆ وەردەگرمەوە، هەر چەندە ویستم خۆمیان پێ بناسێنم بەلام بەهۆی مشتومری ناوخۆیان بواریان نەدام، دوای منیش بیرم کردەوە وام پێ باش بوو لێیان گەریم لەناو خۆیاندا درێژە بەقسەکانیان بدەن لەسەر کێشەی زەوی و زارەکانیان، کەبۆمن هەر هەمووی نهێنی زۆر گرنگ بوون.

لەئەنجامدا بۆم دەرکەوت کە لەناو خۆیاندا کێشەی زەوی و زاریان زۆرەو لەلایەکی تریش لەگەڵ ڕژێم، هەروەها بۆم دەرکەوت کەبەچ جۆرێك ئازارو ئەشکەنجەی خەلك ئەدەن بۆ پارە

پەیداکردن و، بۆ ئاشکرا بوو کەناکۆکی یەکانیان لەناوخۆیاندا لەسەر دابەشکردنی دەسکەوتەکانە، هەروەها هەموو پیلانەکانیانم بۆ دەکرکەوت کەبۆ داگیرکردن و دەست بەسەرا گرتنی سەرو سامانی خەلك دایان نابوو. ئینجا باسی رژیمی بەعسیان کرد کەبەچ جۆریك سووکایەتیان پێ دەکات و وە دوای ئەوەی خزمەتیك بۆ بەعس ئەنجام ئەدەن چەند بەسووکی تەماشایان ئەکەن، هەروەها لەناوخۆیاندا وتیان لەکاتی هیرش بردن سەر مۆلگەی سوپای ئیرانی یان بارەگاو بنکەی هیزی پیشمەرگە، ئیمە قوربانی ئەدەین و پاك سازی ئەنجام دەدەین و، هەوالەکان بەبروسکە ئەگەیەنینە ئامیر فەوج، ئەویش دەیکاتە پیاوەتی خۆی و بەسەروی خۆی دەلیت من ئەو شەو دەستم لەدوژمن وەشاندو فلانە جیگام ئازاد کرد، دوای بیست و چوار سەعاتیش کەئەمانەویت سەردانی ئامیر فەوجەکە بکەین پاسەوانەکەی پیمان ئەلیت: جەنابی ئیستا لەحەمامە یان ئەلیت ماندوەو خەوی لیکەوتوە بۆیە ناتوانێ کەس ببینیت.

لەو دانیشتنەدا ئەوەندەیان لەم جۆرە قسانەکرد کەبەچوار لاپەرە تەواو نابیت، کاتیك سەعات بوو بە١٢ی شەو حەمەخان وتی: ئیستا ئەچین ئەخەوین و بەیانیەکەی انشاالله زەویەکەت بۆ وەردەگرمەوە.

منیش وتم: قوربان ریگام پیئەدەیت دوو قسە لەخزمەتتدا بکەم و خۆمت پێ بناسینم، من کوری حاجی ئەحمەد نیم و ناوم رەفیق پشدەری یە، نوینەری کیشەی زەوی و زاری کەس نیم و نوینەری کیشەی هەموو زەوی کوردستانم لەعیراقدا، نیردراوی

هیچ ئاغایەك نیمو نیردراوی یەكیتی نیشتمانی كوردستانمو بەفەرمانی مام جەلال هاتوومە لات. كەوام وت كابرا رەنگی گۆڕاو تف لەقورگیدا گیر بوو. وتی: بڕۆن گیسكیك سەر بڕنو چامان بۆ لینین.

بەیەكەوە ددەستمان كرد بەگفتوگۆ تا چواری بەیانیو، پیم وت: بۆ بەرژەوەندی خۆت وا باشە كاغەزیكی سپی بكەینەوە، هەر چی من ئەمووت ئەو لەوەلامدا ئەیووت مام جەلال هەموو ریگایەكی لەمن گرتووە. لەدوای ئەو هەموو گفتوگۆ دوورو دریژە وتی: شەرم لەگەڵ مەكەنو مەیەنە سەرم منیش شەرتان لەگەڵ ناكەمو پەلامارتان نادەم. لەكۆتاییدا بانگی خوارزاكەی كردوو پیی وت لەگەڵ رەفیق دابە تاكو بەسەلامەتی دەیگەیەنیەوە مالی خۆی لەسلیمانی یان هەر شوینیك كەخۆی ئەیەوی.

دووەم/ خدر رەشید بەحری:

ئەم كابرایە شان بەشانی رژیمی بەعس چەكی دژی كوردو كوردستان هەلگرتبوو، ئەویش بەفەرمانی بنەمالەی بارزانی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان. برایەكی ئەم سەرۆك جاشە بەناوی ئیبراهیم رەشید بەحری لەباروودۆخیكی نادیاردا تیرۆر كرابوو، ئەویش لە ترسی گیانی خۆی دوو هاولاتی گرت بوو بۆ ئەوەی سەرنجی یەكیتی بەلای خۆیدا رابكیشیّ. یەكیان ناوی مامە رەزای ناوگردان بوو ئەوەیتریشیان ناوی حاجی سابر باوكی كاكە حەمەی پیشمەرگە بوو. بەندە لەگەڵ جەنابی برای گەورەو بەریز كاكە حەمەی كوری خوالیخۆش بوو شیخ قادری چویسە چووینە لای كاك خدر لەناوچەی پینجوین، كە لەموجەمەع

شانەدەری لەمەکتەبێك دابوو لەگەڵ ٢٥ چەکدار دا. قسەو گفتوگۆمان دەستی پێکرد، سەرەتا باسی بارودۆخی ئێستاو گفتوگۆکانی نیوان رژێمی بەعس و یەکیتیم بۆ کردو، تیمگەیاند کەناتوانیت دژی شۆرش بوەستیت وە پیم وت وا باشە لەگەلماندا ریك کەوی و، دەربارەی گرتنی ئەم دوو هاولاتییانە کەهیچ تاوانیکیان نییە پیم راگەیاند ئەم کارە بۆتۆ زیان بەخشە. جەنابی کاکە حەمە وتی: من بەفەرمانی جەنابی شیخ هاتووم، ئەو زۆر نارازیە بەرامبەر ئەو کارەی تۆ کردووتە، هەروەها مەحمودی براشت.

خدر وتی: من برام کوژراوە بۆیە ئەم دوو کەسەم گرتووە. وتم: کاکە حەمە تاوانی نییە لەکوشتنی ئیبراهیمی براتدا، ئیوەش لەناوخۆتاندا دوژمناتیتان زۆرە، ئەگەر بیت و ئەم دووهاولاتیە بکوژن ئەوا خۆتان توشی دوژمنایەتی هەموو یەکیتی ئەکەن. بەلام من ریگایەکت نیشان ئەدەم کەزۆر ئاسانە وە ئەگەر جەنابت ئەنجامی بدەیت ئەتوانیت تولەی براکەت بکەیەوە، ئەویش ئەوەیە یا لەمالەوە دانیشەو خەریکی کارو کاسبی خۆت بەیان وەرە ناو ریزی شۆرشەوەو لەپیناوی کوردو کوردستان تیبکۆشە. دوای ئەم گفتوگۆیە خواحافزیمان خواست و گەراینەوە بۆ خزمەتی جەنابی شیخ قادری چوویسە. لەوێ بەناوی یەکیتی زۆر سوپاسم کردو پیم وت ئەم سەرکەوتنەمان بەهۆی جەنابی کاکە حەمەو فەرمانی ئیوەی بەریزەوە بوو.

تێبینی/

ئەو قسانەی لەحەمەخانی حاجی دارام بیست لەسەر خراپەکاری حزبیی بەعس و رژیمەکەی لەهەموو سەرۆک جاشەکانم ئەبیستەوە، بەڵام ئەوەی جێی سەرسورمان بوو ئەمانە لەگەڵ ئەوەشدا پیاوی بەوەفای بەعس بوون.رەنگە هۆی سەرەکی ئەوەی ئەم هێزو سەرۆک جاشانە نەئەهاتنە پاڵ شۆرش ئەو ناکۆکییە بووبێ کە لەنیوان یەکیتی و پارتیدا هەبوو، کەبنەماڵەی بارزانی هۆی سەرەکی بوون. هەر بۆیە لەکاتی راپەرینەکەی بەهاری ١٩٩١ سەرۆک جاشەکان و موستەشارەکان رۆڵی سەرەکیان بینی لەدەرپەراندنی رژیمی بەعس و، لەپیشتریشدا باسی ئەوەم کرد کەعیزەت دووری لەکاتی کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆک جاشە هەڵاتووەکان لەبەغدادا چۆن پییان دەڵێ ئیوە هۆی سەرەکی لەدەست دانی کوردستان لەبەعس.

*　　　*　　　*

## كورد بۆ نەبووە بەدەوڵەت؟

یەكێك لەو پرسیارانەی بەردەوام مێژوونوس و رۆشنبیرانی ئێمە دووبارەی دەكەنەوە،وە هەریەكە لەروانگەی خۆیەوە وەڵامێكی بۆ دیاری دەكات و هۆكارەكانی ریز دەكا، ئەو پرسیارەیە كەكورد بۆ نەبووە بەدەوڵەت؟ هەموومان دەزانین كورد یەكێكە لەگەلە هەرە دێرینەكانی ئەم ناوچەیەو، دوو هەزار ساڵ بەر لەئێستا خاوەنی دەوڵەتێكی فراوان و بەهێز بووە كەبەدەوڵەتی "میدیا" ناسراوە. بەڵام لەدوای رووخانی ئەم دەوڵەتەوە كورد پەرشوبڵاو بووەو هەرچی هەوڵێكی لەو پێناوەدا داویەتی بێ سود بووە.

هەندێك لەنووسەرو رۆشنبیران پێیان وایە كەئیسلام هۆكاری سەرەكی پەرتەوازە بوونی كوردو دروست نەبوونی دەوڵەتی‌كوردییە، بەڵام بەرای مـن ئـەو هۆكارە ئـەو كاریگەرییە گەورەیەی نییە كەئەوان دەیلێن، چونكە فارس و تورك وەكو كورد موسڵمان بوون و ئیسلام نەك نەبوو بەرێگر لەبەردەم دروست بوونی دەوڵەتی سەربەخۆدا، بەڵكو بوو بەباشترین هۆكار بۆ چەسپاندنی ئیمپراتۆریەتەكانیان و داگیركردنی گەلانی‌تری موسڵمان بەناوی ئاینەوە. فارسەكان لەسایەی ئاینی ئیسلام، ئیمڕۆ موزایەدە بەسەر هەموو جیهانی ئیسلامییەوە دەكەن و خۆیان بەخەم خۆری ئەم ئۆمەتە دەناسێنن، هەر چی توركەكانیشن، كەمێژوویان لەم ناوچەیەدا

لە٦٠٠ ساڵ زیاتر نییە لەریگای ئایینی ئیسلامەوە توانییان گەورەترین ئیمپراتۆریەت لەرۆژهەلاتدا دابمەزرینن و زمان و ئەدەب و ریو رەسمی تورکی لەهەموو ناوچەکاندا بلاوبکەنەوە، کەئیستاش هەموو تورکیك فەخر بەو رۆژەوە دەکات. کەتوانییان سنووری دەسەلاتیان بگەیەنن بەبۆسنەو هەرسك و ئەلبانیا لەرۆژهەلاتداو لەرۆژئاواشدا خۆیان لەئیتالیاو فەرەنسا نزیك بکەنەوە. بۆیە راست نییە بلیین ئیسلام هۆی سەرەکی دروست نەبوونی دەولەتی کوردییە، بەلکو کورد خۆی نەیتوانیوە کەلك لەئیسلام وەربگریّ و بۆخۆی بەکاری بهینیت وەکو عەرەب و تورك و فارس.

ئیسلام بوونی کورد کەم و کورتییەکەی لەوە دایە کەتەنها لەبواری نویژو رۆژو خویندنی زانستە شەرعیەکاندا بووە، بەلام هەر چی نەتەوەکانی ترە لەگەل ئەم کارانەشدا لەناو ئیسلامدا سیاسەتیان بۆ بەرژەوەندی نەتەوەکەی خۆیان کردووە. کورد پیش موسلمان بوون و دوای موسلمان بوونیشی خەمی دروستکردنی دەولەتی نەبووەو، ئەگەر بشبووبیّ ئەوا خیانەت و دوژمنی ناوخۆ نەی هیشتووە سەر بگریّ. ئەو گلەیانەش کە لەسەلاحەدین ئەیوبی دەکریّ لەجیّی خۆیدا نییە، چونکە ئەو کاتە ئەو رابەرە کوردە ئەرکە ئایینیەکانی خۆی رایەراندووەو، هەرگیز بەبیریدا نەهاتووە دەولەتیك بۆ کورد دروست بکات.

هەندیکی تر پییان وایە رۆژئاواو ئەوروپا رقیان لەکورد داگرتووە بەهۆی سەلاحەدین ئەییوبی یەوە، چونکە ئەم کابرایە لەکاتی خۆیدا لەشەری خاچپەرستەکاندا زیانی زۆری لیداون،

ئەم رایە بەرادەیەك لەراستی یەوە دورە كەهەر قسەیەو هیچی تر. چونكە ئەگەر كورد یەك جار لەریگای سەلاحەدینەوە زیانی بەرۆژئاوادابێ، ئەوا توركەكان كەئیمرۆ نزیكترین دۆستیانن چەندین جار زیانی گەورەیان لێ داون. راستە رۆژئاوا لەمیژووی تازەدا رۆلی سەرەكی هەبووە لەدروست نەبوونی دەولەتی كوردیو پەرتەوازە بوونی كوردو پارچەپارچە بوونی كوردستان دا، بەلام ئەمە بەواتای ئەمە نایەت رقیان لەكورد بێ، بەلكو ئەم كارەیان بۆ بەرژەوەندی ئابووری خۆیان ئەنجام داوە.

هەروەها رۆژئاوا لەریگای پارچە پارچەكردنی كوردستان باریكی وای ناوەتەوە لەناوچەكە كەهەر كاتیك بیەویت ئاژاوە بنیتەوەو دەست لەناوچەكە وەردا ریگای لەبەردەمدا كراوەیە.

بەرای من سەرەكیترین هۆی دروست نەبوونی دەولەتی كوردیو، ك لەچەندین جیگادا باسم كردوە، بوونی دووژمنی ناوخۆیە.

چونكە نابیت چاوەرێی دووژمنی دەرەكی بكەین بیتو دەولەتمان بۆ دروست بكات، لەو بوارەدا پیویست بەوە ناكات گلەیی لەبیگانە بكەین، كوردیش دەلێ دار كرمی لەخۆی نەبێ نارزێ. كورد تا ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم خاوەنی چەندین ئەمارەتی سەربەخۆ بووە، كە لەسایەی هەر دانەیەكیاندا سەدەها هەزار كورد دوور لەدەسەلاتی بیگانە ژیاون، بەلام هەرگیز سەرۆك هۆزو ئەمارەتەكان نەك هەر ئامادە نەبوون لەگەڵ یەكتری ریك بكەونو دەولەتیك دروست بكەن بەلكو بەردەوام لەبیری لەناو بردنی یەكتردا بوون. زۆر جار ئەو سەرۆك هۆز و

دەسەڵاتدارانە بۆ لەپشت دانی برا سەرۆك هۆزو دەسەڵاتدارە کوردەکانی‌تر پەنایان بردۆتە بەر دوژمنانی گەلی کوردو، دەستیان راکیشاوەتە سەر مالی براکەیان. ئیمارەتە کوردیە گەورەکان سۆران- بابان- ئەردەلان- جزیرە- بۆتان هەرگیز لەگەڵ یەکتر تەبا نەبوون‌و شەرلە نیوان یاندا بەردەوام بووە، بگرە لەناو خۆشیاندا برا برای دەکوشت بۆ وەرگرتنی دەسەڵات، بۆ نموونە لەمیرنیشینی باباندا لەماوەی ٣٧ سالدا ٥ برا لەسەر دەسەڵات یەکتریان کوشتوە بەپشت بەستن بەبەغدا یان تاران. لەکاتیکدا ئەگەر تەنها دوو ئەمارەت یەکیان گرتبا دەیان توانی دەولەتی کوردی رابگەیەن‌و تورك‌و فارس ملکەچی خۆیان بکەن.

یەکەم هەولی راستەقینەی ئیمە بۆ دروستکردنی دەولەتی کوردی لەشیخ مەحموودەوە دەست پیدەکات لە١٩١٩/٥/٢٣، بەلام کاتیك لە١٩٢٠/٦/١٧ ئینگلیزەکان ویستیان حکومەتی بەعس عەرەبی دابمەزرینن، هاتن کوردستانی باشووریان خستە سەر عیراقی عەرەبی، بۆ ئەوەی پارسەنگی سننە لەعیراقدا راست بکەنەوەو نەهیلن شیعە بەشی هەرە زۆری عیراق بن.

بەم شیوەیە خەونی دەولەتی کوردیان تیکدا وە ریگەیان نەدا هیچ کەس لەو بوارەدا سەرکەوتوو بیت. ئینگلیزەکان بەم کارە دوو ئامانجیان پیکا، یەکەمیان درووستکردنی هاوسەنگی لەنیوان سونی‌و شیعە لەعیراقدا، دووەمیان پارچە پارچەکردنی کورد بوو، کەبەهەر دوو ئامانج مەبەستیان بوو باریکی وا دروست بکەن کەپر بێ لەئاژاوە، بۆ ئەوەی هەر کاتیك مەبەستیان بوو دەست لەناوچەکە وەر بدەن. بۆ نموونە کاتیك

ئینگلیزەکان پارمەتی شیخ مەحمودیان ئەدا مەبەستیان ئەوە بوو پەستان بخەنە سەر تورکەکان تا گوێ رایەلی فەرمانەکانیان بن و، کاتیك زانیان تورکەکان هاتوونەتە ناو بازنەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان نەك یارمەتیەکانیان راگرت، بەلکو بەئاگرو ئاسن شۆرشەکەیان تواندەوە شیخیشیان دەست گیر کرد. دوای دروست بوونی دەولەتی عیراقی لەگەڵ هەردوو دەولەتی ئیران و تورك ریککەوتن لەسەر لەناو بردنی کورد. بەشیوەیەکی گشتی وەکو لەم کتیبەدا باسم کردووە هەلویستی هەر چوار ئەو حکومەتانەی کوردیان بەسەر دابەش کراوە هەلویستیکی سلبیە، ئەم دەولەتانە لەکاتی توندترین شەرو هەرای نیوان خۆیاندا نەسەر لەناو بردنی کورد کۆك و تەبان. هەرچی حکومەتی بەعس یە لەهەر سێ دەولەتەکەی‌تر توندترو دوژمن کارانەترە بەرامبەر بەگەلەکەمان، بەجۆریك کەئەوەی رژیمە یەك لەدوای یەکەکانی عیراق بەسەر کوردیان هیناوە، نەك هەر سێ دەولەتەکەی‌تر بەرامبەر بەکورد ئەنجامیان نەداوە، بەلکو لەجیهاندا شتی وا نەبووە، بەتایبەتی دوای هاتنی حزبی بەعس بۆ سەر دەسەلات و پاش ئەوەی دکتاتۆر سەدام حسەین دەسەلاتی گرتە دەست، لەو کاتەوە کورد روو بەرووی پرۆژەی گەورەی جینۆسایدی بەعسیەکان بۆتەوە، لەو چوار چیوەیەشدا سەدەها گوندو چەندین شار کاول کران و چەندین ناوچە کیمابارن و ئەنفال کرا. ئەوەش تەنها بەمەبەستی قرکردنی گەلی کورد بوو.

بەڵام سوپاس بۆ خوا سەدامله ١٩٩٠/٨/٢ گەورەترین گەمژەیی کرد کاتیك کویتی داگیرکرد، ئەو دەوڵەتە عەرەبییەی تا دوینی بەملیۆنان دۆلاری دەبەخشیە بەعسیەکان لەدوای داگیرکردنی کویتەوە خرایە سەر عیراق و کرا بەپاریزگاری نۆزدەهەمین و، تاوانبارترین پیاوی سەدامیان کردە پاریزگاری کویت عەلی حەسن مەجید، ئەویش کاریکی پیکردن کەئیسرائیل بەفەلەستینیەکانی نەکردووە. ئەمە وای کرد رۆژئاوا بەسەرکردایەتی ئەمەریکا کۆببیتەوە بۆ لیدانی عیراق و دەرپەراندنی لەکویت، ئەوە بوو لەشەوی ١٦-١٩٩١/١/١٧ پەلاماری لەشکری بەعسیاندا لەکویت و کاریکیان پیکرد با بەدەواری شەری نەکردبێ. شایەنی باسە تائەو کاتە حکومەت و حزبە عەرەبەکان ماهیەتی راستەقینەی بەعسیان نەدەزانی و، پییان وابوو سەدامتەنها دووژمنی گەلی کوردە، بەڵام خوای گەورە وای کرد ئەو لەشکرە بەعسیەی بەپاسەوانی عەرەبیان دەزانی و بەپارەو سامانی ئەوان دروست ببوو، رژایە سەر خۆیان و ماڵ و سەروەت و سامانیانی تالان کرد. تاکە سەرکردەی عەرەب کەهەڵویستی بەرامبەر کورد باش بیت سەرۆك موعەممەر قەزافی‌یە، کە لە١٩٧٩/١٠/١ لەکۆنگرەی بن غازی لەلیبیا پشتگیری بۆ کورد راگەیاندوو وتی: کورد مافی خۆیەتی سەربەخۆ بیت. هەرچی سەرکردە عەرەبەکانی‌ترە ئەوە نەك بەباشە بەلکو بەخراپەش ناوی کورد ناهینن. تایبەت بەحزبە بەناو ئیسلامییە عەرەبەکانئیخوان موسلمین و هەموو حزبە ئیسلامییە عەرەبە توندرەوەکان و پیاوە ئاینی یە

ئاسراوەكانیان وەكو د. یوسف ئەلقەرزاوی بێ دەنگ بوون بەرامبەر ئەم هەموو تاوانەی بەعس بەناوی ئیسلامەوە بەرامبەر كورد ئەنجامی داو، كو ئەنفال. كەئەمڕۆ دریغی ناكەن لەیارمەتی دانی حزبە ئیسلامییەكانی كوردستان. كەئەمەش بریتییە لەنەخشەیەكی گەورەتری حكومەتە عەرەبیەكان. بۆ نموونە (الاغاثة الاسلامیة العالمیة) كەریكخراویكی رژیمە عەرەبەكانەو بەناوی ئیسلامەوە پارە لەعەرەبە موسلمانەكان كۆدەكاتەوە،ئەم ریك خراوە كار بۆ ئامانجە سیاسی یەكانی عەورەب ددكات نەك بۆ ئیسلام. لیرەدا پیم باشە هەندیك پرسیار لەئیسلامیە عەرەبەكان بكەم، بۆچی هیچ حزبیكی ئیسلامی رۆژیك لەرۆژان نەیگووت كوردیش وەكو عەرەب و فارس و تورك و هەر نەتەوەیەكی موسلمانیتر مافی ئەوەی هەیە دەولەتی هەبیت؟ لەكاتیكدا ئیمە بەناوی ئەنفالەوە ١٨٢هەزار هاولاتیمان بێ سەروشوین كرا بۆچی كۆنگرەی ولاتبانی ئیسلامی بەیاننامەیەكی دەرنەكردوو روونی نەكردەوە كەئەم كارە دژی شەریعەتی ئیسلامی بووە ؟ ئەو ریكخراوە ئیسلامیانەی كەدین مزگەوت لەكوردستاندا دروست ئەكەنەوەبۆچی رۆژیك نەیان پرسی ئەم مزگەوتانە كی رووخاندوونی و بەچ ناویك وایان لیكراوە؟ بۆچی لەدوای راپەرینەوە چەندین ریكخراوی رۆژئاوای خیرخواز بەژداریان كرد لەئاوەدانكردنەوەی كوردستان دا، بەلام هیچ ریكخراوی عەرەبی ئیسلامی بەریالیك بەژداری نەكرد؟ئەم دەولەت و حزبە ئیسلامیانە كوردستانیان بەجۆریك پشت گوێ خستووە كەتەنها بۆ بەرژەوەندیو كاری تایبەتی خۆیان نەبیت

ئاوری لێ نادەنەوە، لەوە سەیرتر ئەوەیە کەحزبە ئیسلامیەکانی کوردستان بەدۆست و لایەنگرانی خۆیان دەزانن، بۆ نموونە کاتێك حزبی یەکبوونی ئیسلامی کۆنگرە ئەبەستێ لەهەلەبجە، پرس بەئێران ئەکەن تا یەکێك بکەن بەرابەر، ئێرانیش داوایان لێ دەکات کەعەلی عبدولعەزیز بکەن بەرابەر، بەڵام کاتێك کوردێکی موسلمان داوایان لێ دەکات لەسەر خیانەتی ۳۱ی ئاب هەڵویستیان هەبێت دەڵێن ئێمەرای‌سەر بەخۆی خۆمان هەیەو ملکەچی قسەی خەلکی نابین. بەهەمان شێوە حزبە عیلمانیە کوردستانیەکانیش لەبری ئەوەی کێشەکانیان لەناوخۆدا و لەکوردستاندا چارەسەر بکەن، دەچن لەلەندن یان لەواشنتۆن بەئامادەبوون و لەسەر دەستی لیپرسراوە بیگانەکان کیشەکانیان چارە سەر دەکەن و، کو ئەوەی مام جەلال و مەسعود بارزانی کردیان لەواشنطۆن و لەندەن و ئەستەمبوڵ.

بەهەر حاڵ، کورد لەسایەی ئەم ڕێسوابوونەی ڕژێمی بەعس لە١٩٩١/٣/٥ ڕاپەڕیو توانی ناوچەیەکی بەر فراوانی کوردستانی عیراق ئازاد بکات. دوای ڕاپەڕین ڕۆژئاوا بەناوی پاراستنی مافی مرۆڤەوە هێلی ٣٦ی دژە فرینی لەکوردستان دانا، کەتەنها ناوچەیەکی کەمی کوردستانی گرتەوەو، هەروەك و لەبەشەکانی پێشوودا باسم کردوە ئەم کارە تەنها بەمەبەستی دورخستنەوەی دەسەڵاتی کوردی بووە لەبیرە نەوتییەکانی کەرکووك.

ڕاپەڕین ئەو فورسەتە گەورەیە پاش لاوازبوونی ڕژێمی عیراقی و کرانەوەی دەرگاکانی جیهان بەرووماندا، نەمان توانی

وەکو پێویست کەلکی لێ وەربگرین. ڕاستە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و وڵاتانی ڕۆژئاوا ڕۆڵی خراپیان هەبووە لەو بارەیەوە، بەڵام لەهەمووی گرنگترو کاریگەرتر، ناتەبابوون و نەگونجانی ناوخۆمانەو، دوژمنی ناوخۆ زۆر ترسناکترە لەدوژمنی دەرەکی. هەموومان ئەزانین دوای ڕاپەرین حزبە کوردستانییەکان لەسەر دەسەڵات و پارە شەڕیان دەست پێکردو، هەموو دەسکەوتەکانی ڕاپەڕین بەپەرلەمان و حکومەتی هەڵبژێراویشەوە خرایە بەردەم هەڕەشەی لەناوچوون. بەتایبەتی دوای ئەوەی بنەماڵەی بارزانی لە٣١ی ئابدا ڕەنجی چەند ساڵەی کوردیان لەسەر سینییەك داناو خستیانە بەردەم سەدامحسەین و ڕژێمە گڵاوەکەی، تەنها بۆ بەرژەوەندی بنەماڵەکەی خۆیان.

## میرابۆی کورد

لە خوێنەری خۆمی ناشارمەوە کە من سەر لەسەرەتای نووسینی بەرگی یەکەمی کورد دوژمنی خۆت بناسە مەبەستم پێی لەبنەماڵەی بارزانی بووە، چونکە گەلەکەمان هیچ پێویستییەکی بەوە نییە کەپێی بوترێ ڕژێمی عیراقی یان تورکی یان ئێرانی یان سووری دوژمنتە، هەموو کوردێك هەر کە لەدایك دەبێت و ڕاست و چەپی خۆی لەیەك جیا دەکاتەوە دەزانێ ئەمانە دوژمنی سەر سەختی کوردن. بەڵام دوژمنی ناوەخۆ، ئەو کەسەی خائینە و لەبەرگی شۆڕشگێردایە، ئەوەی نیشتمان ئەفرۆشێت تەسلیم بەدوژمنی دەکاتەوە وەك

ئاشبەتاڵ و خیانەتی ٣١ی ئاب و ناوی لەخۆی ناوە نیشتمانپەروەر، ئەوەی هەر خەریکی پارە کۆکردنەوەو دزینی سامانی خەلکە وەك داهاتی ئیبراهیم خەلیل و خۆی بەخەم خۆرو دەم راستی گەلی کورد ئەزانێ، ئەوەی پیاوی بیگانەیە موساد- ئتلاعات- موخابەراتی عیراقی- میتی تورکی- سی ئای ئەی و دەلێ من سەربەخۆم و لەپێناوی گەلدا تێ دەکۆشم، ئەو دوژمنە پێویستی بەروونکردنەوەو ئاشکراکردن هەیە، کورد وتەنی گورگەو لەپێستی مەردایە.

لە مێژووشدا نموونەی لەو جۆرانە زۆرن، کەماوەیەك لەرێگای درۆو فیلەکانیانەوە خەلکیان چەواشە کردووەو تەفرەیان داون، بەلام هەرگیز نەیان توانی وە ئەم درۆیە هەتا هەتایە لەخەلك بشارنەوە. میرابۆی فەرەنسی نموونەیەکی ئاشکرای ئەم جۆرەیە، کەرۆشنبیری گەورەو نیشتمانپەروەرو مێژوونووسی بەناوبانگی گەلی کورد کاکە د. کەمال مەزهەر لەکتێبی زانستی مێژوو یان مێژووی مێژوودا باسی کردووە. میرابۆ لەسەرەتای شۆرشی فەرەنسیدا لەرێگای فرتو فیلەکانیەوە وای لەخەلك گەیاندبوو کەئەو خەم خۆری شۆرشەو بەوەفای گەلی فەرەنسییە، خەلکی فەرەنسا ناویان نابوو بەخەتیبی شۆرش. کاتیك ئەم کابرایە مرد سەرجەم گەلی فەرەنسی غەمباری خۆی راگەیاندو بەهەزارەها کەس لەگەلیدا چوون بۆ گۆرستان و، لەگۆرستانی پیاو چاکان و پیاوە گەورەکاندا ناشتیان. بەلام کاتیك شۆرش سەرکەوت و دەسەلاتی پاشایەتی لەفەرەنسا بەدەر نرا، هەموو ئەرشیف و نهێنیەکانی کۆشکی پاشایەتی کەوتە دەست

جــەماوەری شــۆرش گــێر، دوای ئــەوەی جــەماوەر ســـەیری نوســراوەکانی پاشــایەتییان کــرد بینیــان مــیرابۆ لــەژێرەوە و بەنـهێنی هــەموو خزمــەتیکی دەســەلاتی پاشــایەتی کــردووەو، بــەردەوام هــەواڵو زانیــاری گــەیاندوە بەکۆشــکی پاشــایەتی و فەرمانــەکانی جیبــەجی کــردوون، لەبەرامبــەر بەخششــی زیــرو زیوی پاشایەتی. هەر بۆیـه جـەماوەر سـەر سـام بـوون و لـەرقان چـوون لەگۆرەکـەی دەریـان هینایـەوەو لەگۆرسـتانیکی لاچـەپ ناشتیان و ناویان لەدەفتەری خیانەتدا نووسی.

د.کــەمال مەزهــەر لەگیرانــەوەی ئــەم رووداوەوە دەیــەویت وانەیــەکی میژوومــان فــیر بکــا، کــەخۆی هــەر لەســەرەتای گیرانەوەی ئەم رووداوە دەلیت کەس بۆی نییە تـا سـەر میـژوو هەلخەلەتینی بۆیـه ئەم رووداوە دەکاتە بەلگەی سـەلماندنی ئەو رایـەی خـۆی. کـەوا منیـش بـۆ هـەموو میلـەتی کـوردی ئاشـکرا دەکەم کەمـەلا مستەفای بارزانی و بنەمالەکەی میرابۆی کوردن، چۆن میرابۆ نەیتوانی تا سەر فیل لـەمیژوو بکات، بەهـەمان شیوە بنەمالــەش نــاتوانیت. جیــا لــەو هــەموو کــەم و کورتیــەی لەکتیبـەکانمدا لەسـەر ئەو بنەمالەیە دەرم خسـتووە، وا لـیرەدا - خوینـەری بـەریز - هـەندیکی تر لەو بەلگانـەت بـۆ دینمـەوە تـا گومانت نەمینی لەو راستیە.

لە دوای دامەزراندنی حکومەتی عیراق و پاش ئەوەی کوردیان بەزۆر بەعیراقـەوە لکـاند، لـە١٤/تـەموزی/١٩٥٨ بەسـەرکردایەتی عبدولکریم قاسم شۆرش بەرپا بـوو دژی دەسـەلاتی پاشـایەتی، ئەم سەرکردەیە لەو کاتەدا دانی بەمافی کورد داناو وتـی (العـرب

والاكراد شركاء فی هذا الوطن) ئەمە گەورەترین ڕووداو بوو بۆ گەلەکەمان لەو کاتەدا.

ئەم سەرکردەیە بەکردەوە سەلماندی کەدۆستی گەلی کوردە وە تا ئیستا کورد سەرۆکی عیراقی وای بەخۆیەوە نە دیووە، بەلام دوای ئەوەی بارزانی لەدەرەوە هینایەوە کوردستان، کەنزیکەی ١٠ ساڵ بوو لەدەربەدەری دابوو وە هەموو دەولەتە ئیقلیمیەکان بەتایبەتی ئیران دژی هاتنەوەی بوون و، هەر لەو کاتەدا بارزانی بەعبدولکریم قاسمی وت قەیتانی پیلاوەکەتم، سەرکردەی ئەو کاتەی عیراق بۆ زیاتر سەلماندنی نیاز پاکی بەرامبەر بەگەلی کورد ریگای دابە بەبارزانی تا پارتی دیموکراتی کوردستان دروست بکات و بەرەسمی کاری خۆی بکات، بەلام بارزانی لەبری سوپاسکردنی عبدولکریم قاسم پاش ماوەیەکی کەم دەستی کرد بەپەیوەندیکردن بەسەرۆک عەشیرەت و ئاغاکانەوە بۆ چەك هەلگرتن لەدژی حکومەتی عبدولکریم قاسم، ئەمەش بەدەسیسەی کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانی، چونکە لەو کاتەدا تاکە دۆستی گەلەکەمان عبدولکریم قاسم و دەولەتەکەی بوو. لەو کاتەدا حزبی شیوعی لەسەر ئەم جموجۆلانەی بارزانی بەیاننامە یەکی دەرکرد کەتیایدا هاتبوو چەند سەرۆك عەشیرەتیك یەکیان گرتووە بۆ ڕووخاندنی حکومەتی عبدولکریم قاسم، ئەمانە کۆنەپەرستن و دەستکردی کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانین لەو کاتەدا من وەك هەر هاولاتیەك بڕوام بەوە نەهیناو وام زانی حزبی شیوعی درۆلەگەل خەلك دادەکات. بەلام پاش ئەوەی ١٩٩٧ کتیبی (النفط و الاكراد)ی پرۆفیسۆر د. کمال مجید

بینی، بۆم دەركەوت كەئەم بەیانەی حزبی شیوعی راست بووەو، ئەم كاردی بارزانیش میرابۆ ئاسا فیلیكی گەورە بوو. لەكتێبیی ناوبراودا لاپەرە ۱۷٥ دا هاتووە (*الأستعمار الذي حث مصطفى البارزاني على العصيان ضد الحكومة العراقية سنة ۱۹٦۱و ۱۹۷٤ هو اللذي فرض اتفاقية الجزائر*).

هەر بۆیە لە۱۹٦۱/۹/۱۱ بریاری شۆرشی ئەیلوول درا، كە لەبەرگی دووەمی ئەم كتێبەدا بەدورودرێژی باسم كردووە. دوای ئەمە مەلا مستەفا بەنهێنی لەگەڵ دكتاتۆر عبدولسەلام عارف لەرێگەی هاولاتیەكی خەڵكی سلیمانی كە رێككەوتنیكی بەپەلەی ئەنجام دا، بەمەبەستی دەست بەسەراگرتنی شۆرش و دوور خستنەوەی بالی مەكتەبی سیاسی جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد.

پاشان بەهۆی رووداني بارودۆخیكی تایبەت و دروست بوونی هەردشە لەسەر دەسەڵاتی بەعس پیرماكۆف كەئەو كاتە عیراقنوسیكی رووسی بوو وە لەدوای بوو بەسەرۆك وەزیران و، ك نیردراوی حكومەتی سۆڤیەت گەیشتە بەغدا. هەمو ئەمانە وای كرد بەیانی ۱۱/ئازار دەر بچیت، كەبۆ كورد دەسكەوتیكی گەورە بوو پێویست بوو بپارێزێ. بەڵام بەهۆی خوێن رێژی سەدام و پاشان هەلوێستی نا بەرپرسانەی بارزانی و خۆ تەسلیمكردنی بەئیران ئەو دەسكەوتە گەورەیە لەبار چوو. هەر لەو ماوەیەدا لەسالی ۱۹۷۳ بارزانی بۆ جاری دووەم سەردانی ئیسرائیلی كرد، ئەمە وای لەبەعسی و عەرەبەكان كرد قینی

زیاتر لەگەڵی کورد هەڵبگرن و بیر لەوە بکەنەوە کەچۆن زیاتر گەلی کورد لەبەین بەرن، بۆیە ئەگەر سەردانی یەکەمی بارزانی بۆ ئیسرائیل لەسالی ١٩٦٨دا قازانجیکی بەگەلی کورد گەیاندبێ ئەوا لەسەردانی دوەمدا زیانی گەورەی لەگەلی کورددا، چونکە دوای ئەو سەردانە یەکسەر لە١٩٧٤ شەرلە نیوان رژیم و شۆرشدا دەستی پیکردەوەو، دوای ئەوەی لەجەزائیر ریککەوتن لەنیوان سەدامحسەین و شای ئیراندا ئەنجام درا. هەر لەو ماوەیەدا بارزانی بریاری ئاشبەتالیدا. لەدوایدا بنەمالە لەریگای پاراستنەوە وایان پروپاگەندەکرد کەگوایا ئەو کارەساتە موئامەرەیەکی دەولی بووە بۆ سەر شۆرش. لەسالی ١٩٧٧ کتیبیك لەژیر ناوی (تقیم مسیرة الثورة الكوردية و انهيارها، والدروس و العبر المستخلص منها) لەلایەن (اللجنة التحضيرية) ی پارتی دیموکراتی کوردستان بلاوبووەوە کەتییدا پەرەی لەسەر چەندین نهینی گەورە هەلدرایەوە. لەو کتیبەدا لەلاپەرە ٩٢دا هاتووە (*يقولون بأن الشعب الكردي تعرض الي مؤامرة دولية وكانت السبب الرئيسي من حدوث النكسة، حتي يزرعو اليأس في نفوس ابناء هذا الشعب، بينما الذي حدث كان مؤامرة محلية لتامين مصالح النظام الرجعي الايراني و الحكم التكريتي في العراق على حساب شعبنا. وباركت الولايات المتحدة الامريكية والجهات الرجعية في المنطقة هذة المؤامرة. ولعبت بعض الدول دور الوسيط بين بغداد وطهران، والاسباب الرئيسية*

حدوث ماحل بالثورة داخلية، ولو كنا نحن ثورة بمعنى الكلمة نملك قيادة مضحية لم تكن حركتنا لتزول حتي لو حيكت مؤامرة ضدها بل ربما كانت تضعف فقط. ان اقوالهم كلها هي بالطبع للتستر على فشلهم و لتغطية اخطائهم و عدم تحملهم للمسؤلية عن طريق اتهام الغير) دوا بەدوای ئەم ئاشبەتاله گەورەیە وە دوای ئەوەی ئەم هەمو سەروەت و سامانەی لەگەڵ خۆیدا برد (استلم البارزاني مبلغ مليون دينار من ايران بعد النكسة مباشرة، ان هذا الامر يعتبر متاجرة بمصلحة الشعب، كما انه منافي للشرائع السماوية والانسانية و الضمير والوجدان، ولم يوزع من هذه المبالغ على عوائل الشهداء و العجزة) (هەمان سەرچاوە لاپەرە ٩٠-٩١).

پاشان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی بنەماڵەکەیان هانی خەڵکیاندا تاکو بچینە ئێران (انهم حضوا كل المخلصين لجلب العزيز من ابناء شعبنا الي ايران لكي يتشرد الجميع في بلاد لاتحترم حقوق الانسان ولا يسمح فيها بأي نشاط سياسي) (لاپەرە ٨٦) بۆ ئەوەی ئەم کارەشیان بۆ سەر بگرێ دووبارە وەکو عادەتی خۆیان دەستیان کردوە بەدرۆکردن و گوتیان دەمانەویت درێژە بەشۆڕش بدەین بەڵام کاتێک (عبر المسؤلون في ايران عن عدم موافقتهم على ذلك تركوه فعلا، ولم يدافعو كما يجب حتي عن الذين عوقبوا من قبل ايران بأعتقالهم او تسليمهم للعراق بسبب هذا النشاط، ولم يقولو لهذه الدولة انهم المسؤلون عن الوضع وليس هؤلاء. ولم يبقى كمؤيدين لهم سوى بعض عناصر جهاز

*الباراستن المعروف، الذی یشکل الان عماد حزبهم وعائلتهم)* (لاپەرە ٨٨). نەك هەر ئەوەندە بەلکو بەعەقلی عەشائیری خۆیان ئەیانوت کەس بۆی نییە بیجگە لەئیمە باسی سیاسەت بکاتو، هەر حزبیك لەژیر هەر دوشمیکدا جگەلە پارتی سیاسەت بکات ئەوە دیارە دژایەتی بنەمالەی بارزانی دەکات *(ان بارزانی وابنائه واتباعهم القیادیون لازالوا یعتبرون انفسهم قیادة الشعب الکردي، ویعتقدون خاطئین من لیس معهم لا یملك حق القیام بنشاط سیاسی ولا هو بمخلص،و ان هذا الموقف هو موضع استغراب و شجب کل کردی)* هەر بۆ چەواشەکردنی خەلك تەحسین شاوەیسو قادر فەرەجیان ناردەوە ناو رژیم، لەناو خەلکیشدا وایان بلاوکردەوە کەئەمانە بەفەرمانی ئیمە بۆ کاری ریکخستن هاتونەتەوە کوردستان، کە لەراستیدا مەبەستیان ئەوە بوو لەریگای ئەوانەوە بەچەکی رژیم دەست لەشۆرشی نوێ بووەشینن و، کو چۆن مامە ریشە یان شەهید کرد، ئەو بنەمالەیە هیچ کات دریغی نەکردووە لەدژایەتی گەلی کورد *(وصلوا في محاربة من یخالفهم الرأی الي حد التشهیر و استعمال السلاح و القتل، وابرز مثال علی ذلك هو تحریضهم لعناصر عشائریة موالیة لهم لاتفهم واقع الوضع الذی یعیشه شعبنا لقطع الطریق و الأعتداء المسلح علی مفرزة من البشمرکة تتکون من اربعین شخصا کانت مکلفة بمهمة وطنیة فی کردستان العراق من قبل الاتحاد الوطنی الکوردستانی الامر الذی أدی الي استشهاد معظمهم و فقدان اثر الاخرین، اظهرت هذه المجموعة عن حقدها*

*علـى كـل فئـة او قـوة وطنيـة تنـاضل بمعـزل عمـا تريـده قيـادة البارزانى)* (لاپەرە ١٠٣).

ئەم کارە شەرانگێزیو ئاژاوە گێرانەی بنەماڵە هەرگیز لەزیان زیاتر بەکوردی نەگەیاندوە. هەر بۆیە کاتێك لیڤی ئەشلولی نوێنەری ئیسرائیل لای بارزانی دوای گەرانەوەی بۆ ئیسرائیل دەپرسێت ئامانجی کوردەکان چییە؟ وەڵامی ئەداتەوەو ئەڵێت *(ان البـارزانى يرغـب في الحفـاظ علـى الوضـع الراهـن، ولا يرغـب بمعالجـة المشـكلة الكورديـة ولا يحمـل لقـب الثـائر الابـدى)* *(الموسـاد فـى العراق و دول الجوار – تأليف شلومو نكديمـون –* ت. بدر عقيلي– ص ١٨٨).

بارزانی لەگەڵ ئەوەی بۆ کورد ئاوا بووە بەڵام بۆ بێگانە ملکەچ و گوێ رایەڵ بووە، من گلەی لەبارزانی ناکەم کەبەدۆستی گەلی کورد عبدولکریم قاسم دەلی قەیتانی پیلاوەکەتم، هەر چەندە درۆی لەگەڵ کرد دوژمنی سەر سەختی بوو، بەڵام بۆ بەرامبەر شای خائین وتوویەتی *(عندمـا ابلغ الشـاه البـارزاني ان اتفاقيـة الجزائـر تلزمـه –أي الشـاه– بقطـع مسـاعدات ايـران عـن الثـورة الكردية وكذلك كل المساعدات التي كانت تأتيها عن طريق ايران ...... الخ. واراد ان يعرف رأي ورد فعـل البـارزاني حـول هـذه المسألة وماذا سيفعل؟ كان جواب البارزاني باختصـار مـايلي: نحن شعبك وما دمت راضيـا عن اتفاقيـة الجزائـر وتؤمن مصالح ايران التي هـي وطننـا الأم، لايوجد لدينـا ايضـا شـيء ضدمـا ونحن رهن اوامرك، اذا قلت لنا موتوا نموت او عيشوا نعيش.*

*لقد كنا مخلصين لك ولانزال وسوف نبقى في المستقبل ايضا ونأمل ان تستمر رعايتكم لنا ولقضيتنا دوما*). (هەمان سەرچاوەی لیژنەی ئامادەکار لاپەرە ١٠٤).

خوێنەری بەڕێز،خوشك و برای هاوزمان و هاو خەمم. هەمومان دەزانین کەخوێندنەوەی مێژوو زۆر جیاوازە لەخوێندنەوەی حیکایەتی بەر ئاگردان. چونکە ئەگەر حیکایەت نووسینێکی خەیالی بێ و بەشی زۆری بۆ کات بەسەر بردن و خۆش گوزەرانی بێت،ئەوا مێژوو ئەرکی سەرەکی لەخوێندنەوەیدا پەند لێ وەرگرتن و هەڵویست وەرگرتنە. مێژوو ڕووداوەکانی ژیانە لەڕابردوودا کەدەبێ ببێتە تاقیکردنەوەو ئەزمون لێ وەرگرتن بۆ داهاتوو.وە کەسێك لەمێژووەوە چاکەو خراپەو دۆست و دوژمن لەیەکتری جیا نەکاتەوە، ناکرێت بەمرۆڤێکی تەندروست و ساغ دابنرێت. ڕەنگە فێربوون لەڕووداوەکانی ڕابردوو خاڵێکی جیاکەرەوەی ئینسان بێت لەگیانلەبەرانیتر. مرۆڤێك هەڵەیەك بکاو دووبارەو سێ بارەی بکاتەوە، دیارە هەرگیز باش نابێ و خۆی لەچاڵەکانی بەرپێی پێ ناپارێزێ. پێغەمبەریش فەرموویەتی (المؤمن لا يلدغ من جحر واحد مرتين) واتە ئیماندار دووجار لەکونێکەوە پێوەنادرێ، هەرکاتێکیش ئەوە ڕوویدا، دیارە ئیمانداری تەواو نییە بەواتایەکیتر مرۆڤێکی سروشتی نییە.چونکە بەپێی قورئان مرۆڤی بێ ئیمان و کافر بەئاژەڵ و بگرە کەمتریش دانراوە انهم كل انعام بل هم اضل سبيلا. بۆیی ئاساییە کەمێگەلە مەڕێك کاتێك یەکەمیان لەشوێنێك هەڵدەدێرێ و بەر دەبێتەوە ئەوانیتر پەندی لێ وەرنەگرن و

تووشی هەمان هەڵدیران بـبن، خۆ ئەگەر شـوانەکە فریایـان نەکەوێ دانەیەکیان لێ دەرناچێ. بەڵام مرۆڤ بەهۆی عەقڵو پەند وەرگرتن لەئەزموونەکانی پێش خۆی خۆی لەو چاڵانە دەپارێزێ کەئەوانەی پێش خۆی تێی کەتووبوون. ئەو بیرەوەریو راستیانەی منیش لەم کتێبەمدا نووسیوومن و تۆش – خوێنەری بەڕێز– کاتێکی زۆرت بۆ تەرخان کردوو هەموویت خوێندەوە هیوادارم کەڵکی بووبێو ببێتە مایەی هەڵوێست وەرگرتنو بەکارهێنانی، چونکە زانیاری بەبێ کردەوە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ کردەوەی بێ زانیاریێ، هەروەك ئیمامی شافیعیش دەفەرمووێ:

*لو كان العلم بدون عمل شرف*

*لكان اشرف خلق الله ابليس*

خوێنەری خۆشەویستو بەڕێز، تۆ دەزانی من ئەم کتێبەم بەخوێنی خۆم نووسیوە، بەبێ ئەوەی کەس کۆمەکم بکاو دەستم بگرێ بەم کارە هەستاوومو ئامادەشم لەپێناوی راستیو خزمەتکردنی گەلەکەمدا خۆم بخەمە بەردەم هەموو مەترسییەك. چونکە من لەبەرامبەر ئەو بنەماڵەیەدا، کەسێکی بێ تواناو بێ دەرامەتو بێ هیچ عەشیرەتیکی وام کەبەرگریم لێ بکات، حزبەکانیش گەرچی فەریەکەو هەندیکو بەشێك لەقسەکانی پێ خۆشە، بەڵام من بۆ هیچیانم نەنووسیوەو سەر بەهیچیان نیم. من تەنها لەگەڵ جەماوەرمو بۆ جەماوەر دەنووسم.

من خاوەنی دوانزە سەر خێزانمو لەیەك خانوودا دەژینو حالی حازر خاوەنی هیچ سەرچاوەیەکی دیاریکراوی-مادی نینو بەدریژایی گەرمای هاوین نەمان توانی موبەریدەیەك بکرین. بەلام بنەمالەی بارزانی سەدەها قەسرو هەزارەها سەیارەو ملیۆنان دۆلاریان هەیە. پاسەوانی من خۆمو دوو کورەکەمن، هی ئەوان هەزاران چەکدارو پیاو کوژ، ئەوە جگە لەوەی لەکاتی پیویستیدا دەولەتە ئیقلیمیەکانیش بەفریای ئەو بنەمالەیە دین.

بەکورتی ئەوەی من هەمەو ئەوان نیانە، تەنها بیرو باوەری رزگاریکردنی هەموو کوردستانە لەریگای ئاگادارکردنەوەی جەماوەر لەهەموو راستییەکانی شۆرشی کوردو دەست نیشانکردنی دوژمنی ناوخۆ. بۆیە ئەوەی من بەقەلەمە سێ دیناریو میزە شرو لایلۆنە کۆنەکەم کردوومەو لەداهاتووشدا دەیکەم، ئەوان لەتاونایاندا نییە.

بە هەموو ئەو کتیبانەی کەنووسیومن ئەوەندەم بەسە کەخۆم ویژدانی خۆمو جەماوەر لیم رازی بێ، سوپاس بۆ خوا کەچەندین جار منی لەمەرگی راستەقینە پاراست،ئینشا اللە بۆ ئەوە بووە کەپەیامی خۆم بەگەلەکەم رابگەیەنم چم دیووەو چم زانیوە بیخەمە سەر کاغەزو بیدەمە دەست رەشو رووتی گەلەکەم تا ببیتە مایەی بەرچاوو رۆشنیو دواجار چارەسەرکردنی کیشەی گەلی کورد. تەنها تکام لەبەریزت -خوینەری خۆشەویست- ئەوەیە کەچیتر لەمافەکانی خۆت بێ دەنگ نەبی، تاکەی ریگا دەدەی بنەمالەیەك موزایەدە بەخوینی تۆوە بکاو لەسەر شانی تۆو لەسایەی رەنجی تۆوە سەروەتو

سامان و کەلەکە بکاو بەملیۆنان دۆلار لەبانکەکانی جیهاندا قایم بکا ؟!

هەموو دیوەخانە گەورەکانی ئەوان کەناهیلن لەدەرگاکەی بچیە ژوور، هەموو سەیارە گرانبەهاکانی ئەوان کەبەبێ ئەدەبی بەلاتدا رەتدەبن، هەموو قەسرو بارەگاکانیان کەچەندین پاسەوانی هەیەو بەسەعات لەپرسگەکانیان دەتوەستینن، هەموو جل و بەرگ و زێرو زیوەکانیان کەتۆ خەونی پیوە دەبینی، هەموو ئەمانەو زیاتریش هی تۆیەو هی ئەو خەلکە رەش و رووتەیە کەبوونەتە سوتەمەنی شۆرش و راپەرینەکان. کەدووبارە ئەمرۆ دەیکەنەوە شەری ناوخۆو لەبەین بردن و کاولکردنی ئەو کوردستانە ئازادەی کەگەل هەزاران نەوەی خۆی بۆ کردووە بەقوربانی.

کاکی خوینەر، خوشکی بەریز، لەخویندنەوەی ئەم کتیبە بۆت دەرکەوت کەبەندە چەند هەولێ داوە بۆ یەکگرتنی حزبە کوردییەکان و ریکخستنیان لەبۆتەی بەزەیەکی بەرفراوانی نیشتیمانی گەورەدا تا لەسایەیدا شۆرشەکەمان سەر بکەویو چۆك بەدوژمن دابدەین و رزگارمان بیت لەو هەموو شەرو شۆرەو ویرانکارییە. هەروەها ئەوەشت بۆ دەرکەوت کەمن بەتەنیاو بەفەرمانی سەرکردایەتی شۆرشی گەلەکەمان چوومە ناو قولایی دەزگای موخابەراتی عیراقی و گەیشتم بەعەبدولرەحمان عارف و سەدام حسەین و هەموو گەورە بەرپرسەکانی ئەم رژیمە، تەنها بۆ خزمەتی شۆرش و گەلی کورد. چونکە لەو ریگایەوە توانیومە چەندین زانیاری گرنگ بۆ شۆرش بنیرم و یارمەتی خەلك بدەم

بەبەردانی دیلەکانیان یان سووککردنی حوکمەکانیان، بەپارە پیدان و رزگارکردن و دەربازکردنیان، بەدالدە دان و شاردنەوەیان، کەئەمرۆ ژمارەیەکی زۆریان لەژیاندا ماون و دەستەلاتی گەورەیان هەیە لەشۆرشداو، هەندیکیتریان چوونەتە هاندەران و ژمارەیەکیشیان شەهید بوون.

لەو ماوەیەدا بروای تەواوم بەوە هات کەسەدام تاوانبارو خوینریژیکی بی وینەیەو ناکری هەرگیز چاوەری ئەوەی لی بکری کەبەئاشتی بچووکترین مافی گەلی کورد بدات و، ئەوەشم بۆ ئاشکرا بوو کەئەم کابرایە بەرادەیەك رقی لەکوردە کەچاوی هەلنایە یەکیك ببینی بەکوردی قسە بکات. دوای بەیانی ١١ی ئاداریش کەئەمان توانی بەباشی کەلکی لی وەربگرینو، پاش ئەوەی بالی مەکتەبی سیاسی خۆی حەل کرد، من هەر پەیوەندیم بەشۆرش و نیشتمانپەروەرانەوە نە پچرا بۆ زیاتر پیش خستنی کیشەکەمان. بەهەرەس هینانی شۆرشیش لەلایەن بنەمالەوەو راگەیاندنی ئاشبەتالیش من لەهەولەکانی خۆم نەکەوتم لەریگای خۆدی خۆمەوەو بەبی هیچ رینمایەکی شۆرش، بۆیە زیاتر لەجاران خۆم لەسەدام نزیك کردەوە تا بتوانم ئەوەندەی هیزم تیدایەو توانام هەیە دووبارە شۆرش دەست پی بکەینەوە، لەپیناوەشدا یەکەمین چەکداری شۆرشی پاش ئاشبەتال کەحەمەی مەلا شەریف بوو من دام مەزراند، هەروەها پەیوەندیم بەمام جەلالەوە کرد لەبەیرووت ئەویش داوای لی کردم کەبەمەبەستی دامەزراندنی سەرکردایەتی پەیوەندی بکەم بەو خەلکانەی کەبەریزیان دای نابوون بۆ

سەرکردایەتی شۆرش. دوای گیرانیشم لەلایەن رژێمی بەعسییەوە لە١٩٧٩/٩/١٤و بەفەرمانی خودی سەدام حسەین وەزیندانیکردنم، لەناو زیندانیشدا وازم لەبرواو هەلویستەکانم نەهینا کە لەزیندانیش بەقودرەتی قادر رزگارم بوو بەرەو لەندەن رۆشتمو لەویش لەگەڵ سیاسەتمەدارانی گەلەکەمانو رۆشنبیرانی پەیوەندیم توندتر کرد بۆ زیاتر خزمەتکردنی نیشتمانەکەمان. لەوێ لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەدو د. لتیفوعومەر دەبابەوعەلی کمالوتۆفیق وەهبی بەگو چەندین نیشتمانپەروەریتر پیکەوە لەخزمەتی کوردو کوردستاندا لەهەوڵدا بووین، من لەوێ بەهەموو رووییك هەولم دەدا دەنگی گەلەکەم بەجیهان بناسیدنم تاوانەکانی رژیمی بەعس ئاشکرا بکەم، هەر بۆیە یەکەمین کورد بووم لەسەر کەنالی جیهانی BBCلەسالی ١٩٨١ چاوپیکەوتنم ئەنجام داو باسی مەینەتەکانی گەلی کورد بەتایبەتی عیراق بەگشتیم کرد لەسایەی رژیمی بەعسدا، هەروەها گەورە بەرپرسانی زۆربەی سەفارەتەکانی جیهان لەوێ بەسەر کردەوە بۆ هەمان مەبەست.

لەدوایدا گەیشتمە سوریا، لەویش بەهەمان شیوە دریژەم بەخەباتی رزگاری گەلەکەم دا، بەلام هەر زوو بۆم دەرکەوت کەئەوانیش وەکو رژیمی عیراق هیچ چارەسەریکیان بۆ گەلی کورد پێ نییە وە ئامادە نین دان بەمافی کوردا بنین. دوای ئەمە گەرامەوە کوردستانو لەویوە چووم بۆ ئیران ئەوانیش بەهەمان شیوە بۆم دەرکەوت لەگەڵ چارەسەرکردنی کیشەی کوردا نین، بەلکو دەیانەویت هەموو کورد ببیتە پیاوی ئەوانو کاریان بۆ

بکات هەر بۆیە داوایان لەمنیش کرد کەببمە موخابەراتی ئێران، بەڵام من زوو لەدەستیان هەڵاتم و خۆم گەیاندە سەرکردایەتی پارتی لەراژان بۆ ئەوەی بەرەو تورکیا بم نێرن و رزگارم کەن لەدەست رژێمی کۆماری ئیسلامی، لەبری ئەوە بنەماڵەی بارزانی داوایان لێ کردم کەئەو داخوازییەی ئێران جێبەجێ بکەم و وەکو ئەوان ببمە پیاوی دوژمن. لەبەرامبەردا دوژمن هەموو داوایەکی بۆ خودی من ئەنجام دەداو ژیانمی هەتا هەتایە دابین دەکرد بەڵام من ئامادە نەبووم بیرو باوەری خۆم بدۆرێنم بۆ پارەو پول: هەر بۆیە لەنیوە شەویکدا رێگای تورکیامان گرتەبەرو هەڵاتین بەناو بەفرو کرێوەی زستاندا رۆیشتین، لەرێگادا ئەوەندە تووشی نارەحەتی بووین سێ جار شاهادەمان هێناو وەسیەتمان کرد. لەو کاتەدا بەخۆم داچوومەوەو بریارمدا ئەو بەسەر هاتە بۆ گەلی کورد بەیان کەم و بیکەم بەچرایەك و بیدەم دەست خەڵکی رەش و رووتی گەلەکەم تا بزانن کێ دۆستیانەو کێشش دوژمن.

من هیچ قینی شەخسیم لەبارزانی و بنەماڵەکەی نییە، لەکاتێکدا بارزانی – وەکو لەکتێبەکەمدا بەدرێژی باسم کردووە – ئیهانەی خودی کردم و چەندین جنێوی ناشرینی بەخۆم و کەس و کارمدا من وەکو باوکی خۆم حسابم بۆ دەکرد لەکاتێکدا هیچ باوکێك وا بەکوردکەی نالێ. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بووم بەئامر بەتالیۆن لەناوچەی قەرەداغ و چەندین شەرم لەگەڵ رژێمدا کردووو زیانی گەورەم لێ دان کە لەدواجاردا بەقازانجی شۆرش و سەرکردایەتییەکەی تەواو بوو. بەڵام کاتێك کەزانیم

بارزانی دەیەوێ بمکوژێ‌و لەناوم بەرێ لە ترسان هەڵاتمە ناو رژیم.

دوا بەدوای ئەوەی مام جەلال‌و حلمی عەلی شەریف یش لەو ماوەیەدا هاتنە بەغدا بۆ گفتوگۆو دانووستان، یەکسەر پەیوەندیم پیوەکردن‌و لەگەڵیاندا دەستم کرد بەبەرنامە دانان بۆ درێژەدان بەخەبات. ئەو هەلویستەی بارزانی بەرامبەر بەمن جیا لەوەی هەلویستیکی نا لیپرسراوانەی دوور لەگیانی سەرکردایەتی شۆرشەوە بوو، لەهەمان کاتدا بێ وەفایی بوو بەرامبەر بەمن، چونکە من لەسالی ١٩٥٦ەوە پەیوەندی خیزانیم لەگەڵ ئەو بنەمالەیەدا هەبوو، پاش ئەوەی بارزانی لەرووسیا گەرایەوە یەکەمین دەقە کەمنی بینی بوویین بەهاوڕێو پیکەوە نانمان خواردو داوای لی کردم کە لەگەلی دابم. لەو کاتەدا من بەدلیکی ئەوەندە پاك‌و بەگیانیکی نیشتمانپەروەرانەوە تەماشام دەکرد وام دەزانی خەلاتەی خوا لەئاسمانەوە بۆ کوردی ناردووە تا لەسەرجەم کیشەکانمان رزگارمان بێ.وە هەموو کات لەبەر دەستیدا وەك مندال لەبەرامبەر باوکیدا رادەوەستام دەست لەسەر سنگ‌و گوێ رایەڵ، هەر فەرمانیکی دەر کردبا یەکسەر بەبێ دواکەوتن جێبەجیم دەکرد.کاتیك بەمنی دەوت تۆ وەك لوقمانی کەرم وای وام دەزانی گەورەترین خەلات کراوم‌و فەخرم بەخۆمەوە دەکرد. هەربۆیە هەموو ئیهانەو جنیوەکانی لەرانیە لەبەرچاووی خەلك بەخۆم‌و کەس‌و کارم وەك توڕەبوونی باوکیك تەماشام دەکردو، لەکۆتای سالی ١٩٨٢دا کاتیك لەناو یەکیتی نیشتمانیدا ریزی زۆرم لی دەگیرا، پەیوەندیم بەمەسعود

بارزانییەوە کرد تەنیا لەبەر ئەوەی وام دەزانی ئەو بنەمالەیە دەتوانن کورد رزگار بکەن.

سەرەتای گومان و دوو دلیەکانم لەو رۆژەوە دەستی پی کرد کە لەدەستی رژیمی کۆماری ئیسلامی رام کرد چونکە خیانەتم قبول نەکرد، بەلام ئەوان ویستیان تەسلیم بەئیرانم بکەنەوە. من ئەو رووداوەم لەناخی خۆمدا هیشتەوەو لای کەس نەم درکاندو، ئەگەر پرسیاریشیان لی کردبام دەمگووت: من بەئاگاداری کاك مەسعود لەدەست ئیران هەلاتووم.

کاتیك کەراپەرین بوو بەشی هەرە زۆری کوردستان رزگار کراو کاك مەسعود لە١٢/٣/١٩٩٢ لەقەزای صدیق پیی وتم لەو جەولانە لەگەلم دابەو تۆ وەك وەزیری دەستە راستمی، منیش کاتیك وەلامم دایەوە دەبمە فەراش و نابمە وەزیری تۆ مەبەستم ئەوە بوو کە من هیشتا گومانم لەو بنەمالەیە ماوەو بروام پییان نەماوە.لەگەل ئەوەشدا هیچ هەلویستیکی خراپم بەرامبەریان نەنواند، بەلکو لەبەرامبەر یەکیتیدا پشتگیری پارتیم دەکرد. تا خیانەتی ٣١ی ئاب، لیرەوە دلنیا بووم کەئەم بنەمالەیە بۆ کورد مایەی خیر نین و لەخراپە زیاتر هیچیان لەدەست نایەو، هەر کاتیك بزانن کورد خەریکە دەبیت بەشت و بەرەو سەرکەوتن دەروا، ئەوان لەریی ئاشبەتال و خیانەتەکانیانەوە بارو دۆخەکە دەشیوین و ئەو کارانە ئەنجام دەدەن کەبەتەنیا بەدوژمن ناکری.

لەو رۆژەوە من دەستم دایە نووسنەوەو کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەو بنەمالەیە، تا بۆ هەموو لایەك ئاشکرا بیت کەماهیەتیان چییە.

لەکۆتایی ئەم کتێبەشمدا پێم باشە هەندێك راستی و نهێنیتری تایبەت بەبنەماڵە بخەمە روو، بەو هیوایەی خوێنەر دڵنیا بێت کەماهیەتی ئەو بنەماڵەیە هەر ئەوەیە کەمن باسم کردووە. چونکە سروشتی مرۆڤ وایە تا بەڵگەی زیاتری بۆ بێنینەوە زیاتر دڵنیا دەبێت. لەقورئانیشدا خوای گەورە لەچەندین جێگادا وەسفی ئەخلاق و بڕوای پێغەمبەر ئیبراهیمی کردووەو، چەندین بەڵگەی خوایی گەورەی نیشان دەدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پێغەمبەرە مەزنە داوا لەخوا دەکات بەڵگەی زیاتری بۆ بهێنێتەوە لەسەر مەزنی و گەورەی خۆی کاتێك دەفەرمووێ (ارنی کیف تحی الموتی) واتە خوایە نیشانم دە مردوو چۆن زیندوو دەکەیەوە، خوای گەورەش لەوەڵامدا پێی دەفەرمووێ (او لم تؤمن)؟ واتە ئایا تۆ بڕوات نەهێنارە، پێغەمبەر ئیبراهیمیش دەفەرمووێ (بلی ولکن لیطمئن قلبی) واتە بەڵێ بڕوام هێناوە بەڵام مەبەستم ئەوەیە دڵنیا بم. منیش بۆ ئەوەی خوێنەر دڵنیا بکەمەوە لەماهیەتی ئەو بنەماڵەیە وە هەندێکیتر لەو نهێنییە گەورانەی ئەو بنەماڵەیە ئاشکرا دەکەم.

١-ئەم بنەماڵەیە لەکوردستاندا هیچ نین جگە لەباندێکی مافیا. ژمارەی ئەم بنەماڵەیە ٢٥٠ کەس دەبێت، بەڵام توانیویانە بەفرو فێڵ و تەڵەکانیان زیاتر لە٢٥٠ هەزار کەس لەدەوری خۆیان کۆ بکەنەوە سەرپەرشتیاری سەرەکی ئەم مافیایەش حمایل خانی دایکی مەسعود بارزانییە.

## تێبینی لەسەر حمایل خان

ئەو ژنە زیبارییەو مامی بەپیلانی مەلا مستەفا کوژراوە.دوای ئاشبەتاڵ رۆژێکیان عوبێداللەی کوری مەلا مستەفا لەمیرگەسوور وتاریکی پێشکەش کرد، لەووتاردکەیدا هێرشی کردبووە سەر حەمایل خان، یەکێك لەئامادە بووەکان کەئامر لیوایەکی لەشکری عیراقی بوو هاتە لام و پێی وتم کەعوبێداللە لەمیرگەسوور هێرشی کردۆتە سەر مەلا مستەفاو بەتایبەتی حەمایل خان.بۆیە داوای لی کردم بچمە لای عوبداللە قسەی لەگەلدا بکەم چونکە ئەمە کردەوەیەکی ناشرینەو جوان نییە کورێك لەووتاردا قسەی ناشرین بەژنێك بلێ. منیش چوومە لای عوبێداللەو ئاماژگاریم کردوو پێم وت ئەمە کردەوەیەکی زۆر ناشرینە کەتۆ قسە بەژن بلێی. ئەویش وەلامی دامەوە وتی مامی ئەم ژنە زیبارییە بەفەرمانی مەلا مستەفاو شیخ ئەحمەد کوژراوە، بۆیە لەناخی خۆیدا رقی لەئێمەیە وە لەیەکەم رۆژی هاتنی ئەو ژنە بۆ ناو ئیمە گەورەترین ئاژاوەمان کەوتۆتە ناوو بۆتە مایەی دووبەرەکی لەنێوانماندا.

تێبینی/

شیخ محەمەد هەرسی کەدۆستێکی دێرینی بارزانی بوی لەکتێبەکەمدا لەزۆر شوین باسم کردووە، لەکاتی شۆرشدا بەرپرسی فرۆشگا بوو. دوای ئاشبەتاڵ داوایان لی کرد ئەو سەرمایەی لایەتی کەبری سێ ملیۆن دینار بوو تەسلیمی

بنەماڵەی بکاتەوە. ئەویش لەوەڵامدا پێی وتبوون منیش وەکو ئێوە کوڕی مەلا مستەفام و لەبنەماڵەم، شۆڕیش نەماوە بۆیە ئەم پارەیە هەقی خۆمە شایانی باسە تاوەکو ئاشبەتاڵ هەموو قازانجی ئەو فرۆشگایە بۆ حەمایل خان بوو، بەڵام کاتێك ئەو ژنە ئەو وەڵامە لەشێخ محەمەد هەرسینەوە دەبیستێ، فەرمان دەدا بەکوشتنی و بەدەستی پیاوانی بنەماڵە دەکوژرێ.

تێبینی/

خوشکە مارگرێت یەکەم ئافرەت بوو لەشۆرشی ئەیلولدا، هەر لەیەکەم رۆژەوە دژی داگیرکەران چەکی هەلگرت. ئەم ژنە لەلایەن جەماوەرەوە خۆشەویست و بەڕێز بوو، حەمایل خان گومانی وابوو کەمارگرێت لەگەڵ مەلا مستەفادا پەیوەندی هەیە. کاتێك کەبارزانی بەگومانی حەمایل خانی زانی مارگرێتی دوورخستەوە بۆ ناوچەی بادینان و لەوێ دەست بەسەری کرد، بۆ ئەوەی حەمایل خان گومانی نەمێنێ. بەڵام حەمایل دەست بەرداری گومانەکەی نەبوو بۆیە بارزانی فەرمانی کوشتنی مارگرێتی دەرکرد ئەوەبوو یەکسەر تیرۆر کراو باوکی مارگرێت لە ترسان بەرەو کویت هەڵات.دوای ئاشبەتاڵ کاتێك بەسەردان هاتەوە عیراق لەئاسایشی گشتی بۆ ئیفادە بانگ کرا، لەو کاتەدا منیش لەوێ بووم کەئەم نهێنییەی درکاند کە لەسەرەوە نووسیوومە.

## دابەشکردنی دەورەکان لەناو بنەماڵەی بارزانیدا

بنەماڵەی بارزانی بەم شیوەیە تۆری مافیایەکەی خۆیان دابەش کردووە

١-ئەندامانی بنەماڵە کەلیپرسراویەتیان هەیە لەپارتیدا ئەویش بەم شیوەیەی خواردوەیە:

-ئەندامانی بنەماڵە کەلیپرسراویتیان هەیە لەحزب و لەحکومەتدا.

-مەسعود مستەفا محەمەدعەبدولسەلام بارزانی سەرۆك

نیچیرڤان ئیدریس مستەفا بارزانی ئەندامی مەکتەبی سیاسی و سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران.

-هۆشیار محمود ئاغا محەمەدزیباری خالی مەسعود ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لیپرسراوی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوە

-عبدالمهیمن سلیمان عەبدولسەلام بارزانی کوری ئامۆزای مەسعود ئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی و لیپرسراوی ئیدارەی فەرماندەی لەشکری کوردستان فلك

-سیداد مستەفا بارزانی سەرپەرشتیاری مەکتەبی سەرۆك

٢- مەکتەبی سیاسی پارتی ٩ کەسە، ٣ کەسیان بنەماڵەیە.

٣-لیپرسراوانی بنەماڵە لەفەرماندەیی لەشکری کوردستان فلك ئەمانەی خوارەوەن.

*مەسعود مستەفا بارزانی فەرماندەیی گشتی فلك

*عبدالمهیمن سلیمان عەبدولسەلام بارزانی لیپرسراوی ئیدارەی فلك

*قاسم بارزانی لیپرسراوای هەوالگری گشتی فلك

*لیوا بابەکر زیباری خزمە دایکی مەسعود لیپرسراوی فەرماندەیی دهۆك

*وەجیە مستەفا بارزانی لیپرسراوی فەرماندەی سەفین و لیوای تایبەت و سەرپەرشتیاری تۆپخانە

*بەهزاد لوقمان مستەفا بارزانی لیپرسراوی سوپای بارزان

*مەنسور مەسعود مستەفا بارزانی لیپرسراوی جیمایەی بارەگای بنەماڵە

*شوکت شیخ یەزدین وەزیری ئەنجومەنی وەزیران

٤-لیپرسراوانی بنەماڵە لەپەیوەندیەکانی دەرەوە

*هۆشیار محمود ئاغا محەمەدزیباری خالی مەسعود لیپرسراوی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوە.

*دلشاد مستەفا بارزانی نوینەری پارتی لەئەلمانیا

*سەیوان سابیر مستەفا بارزانی نوینەری پارتی لەفەرەنسا

*فەرهاد لوقمان مستەفا بارزانی نوینەری پارتی لەئەمریکا

٥-لە سنووری ناوچەی سۆران قەزای سۆران و قەزای میرگەسوور پارتی مەبەستیەتی لیپرسراوەکان بارزانی بن، لەوانە:

*لە لقی ١٠ی سۆران شیخ شەجیع بارزانی لیپرسراوی لق و عەدۆ کەریم بارزانی کارگیری لق.

*رەزا خالید بارزانی لیپرسراوی ئاسایشەکانی سۆران و میرگەسوورو چۆمانە

## چەند تێبینیەك لەسەر سامی عەبدولڕەحمان:

لەکاتی هەلبژاردنی پەرلەماندا لەدهۆك ئەم کابرایە بەفەرمانی بنەمالە درایە بەر هیلکەو تەماتە رزیو، بەلام پاشماوەیەکی کەم بوو بەدەم راستو دەهۆل چی ئەم بنەمالەیە، لەکاتیکدا خۆی ئەندام نیە تیایاندا!

لەدانیشتنیکی بەرەی کوردستانیدا مام جەلال رووبەرووی پێ وتبوو تۆ هەشت ملیۆن دینارو ئیزگەیەکی رادیۆت لەرژیمی بەغدا وەرگرتبوو ئەویش وەلامی دەداتەوەو دەلێ بۆ هەر من وەرمگرتوە ! ئەی بۆ لەمەسعود بارزانی ناپرسی کەئەم هەموو یارمەتیەی لەرژیمەوە بۆ دیت؟ بەلام ئیستا خۆی ناویرێ بپرسێ بۆچی لەشکری بەعس لە٣١ ی ئاب ئاوا بەهانای بنەمالەوە هات !

لە دوای راپەرین سامی بەناوی نەخۆشی چوو بووە بەغدا، لەوێ چاوی بەسەدامکەوتو لەسەر تەلەفزیۆن دەرکەوت. دوابەدوای ئەمە کەهاتەوە حزبەکەی هەلوەشاند پارتی گەلی دیموکراتی کوردستانو چووە ناو ریزی پارتی کەدیارە ئەمە فەرمانی صەدام بووە. ئەم کابرایە ئیستا گەورەترین دەستی هەیە لەئاژاوە گیرانو تەخریبو خۆشکردنی شەری برا کوژی.

لەکتیبی (الموساد فی العراق ودول الجوار)دا لاپەرە ٢٢٠ هاتوە ئیسحاق عیبادی کەئەفسەریکی ئیسرائیلی بوو، هەردەم لەگەل سامیدا بووە لەهاتوچۆکانی بۆ بینینی بەر پرسە

ئیسرائیلییەکان لەوانە گۆلدا مائیر کەسەرۆکی حکومەتی ئەوسای ئیسرائیل بوو. ئەمە بەلگەیەکی ئاشکرای خیانەتکاری لەمیژینەی ئەم کابرا سەر بەگۆبەندەیە، هەروەها ئاماژەیەکی روونە بۆ ئەوەی کەسامی هەردەم گوێ رایەلی بیگانە بووە، چونکە بەپێی عورفی دیبلۆماسی سامی مافی ئەوەی نیە سەرۆك وەزیرانی وڵاتیك ببینێ ئەگەر بۆ کاری موخابەراتی و جاسوسی نەبێت.

هەر بۆیە ئەم کابرایە لەیەکەم رۆژی دەست تیکەڵکردنی لەگەڵ سیاسەتدا تەنها ئەرکی خیانەت و گوێ رایەلی بیگانەیی ئەنجام داوە. لەکاتی کودەتای سالی ١٩٦٣دا لە ترسی کوشتن هانای بۆ پارتی برد، کاك عەبدوڵڵا کانی ماڵانی بەئۆتۆمبێلەکانی خۆی دەیگوازیتەوە بۆ کۆیسنجەق و لەمەرگ رزگاری دەکات، بەلام ئیستا خەلکی گلەیی لەبنەمالە کاك عەبدوڵلا دەکەن و دەڵێن ئەمە بوو ئەم کابرایە [illegible] رزگار [illegible] لەبەرئەوەی بنەمالەیەکی رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرن.

٢-ئەم بنەمالەیە لەرۆژهەلاتی ناوەراستدا خاوەنی گەورەترین سەرمایەن. دوای ئاشبەتاڵ ئەوەی کەزانراو ئاشکرابوو ئەوەبوو کەئەم بنەمالەیە ٧٠ ملیۆن دۆلارو ٤٥ ملیۆن دیناریان لەبانکدا بوو، خوینەری بەریز هەرچەندە من لەو کاتەدا ئەمە دەتوانم حاسیبەم لەبەر دەستدایە، بەلام لەبەر سەرقالی و بێکاتی بۆ تۆی بەریزی جێدیلم تا حسابی بکەی و بزانی ئەم سەرمایە بەسود فائضی بانکەوە تا ئیستا بووە بەچەند، لەسالی ١٩٧٥ ەوە تا ئەو سالەی ئەم نوسینە دەخوینیتەوە. ئەوە جگە لەوەی

کەئەم بنەماڵەیە وەکو حوت لەهەموو لایەکیان هەر وەرگرتووەو دەستیان بەسەر هەموو داهاتو سەروەتوو سامانی خزمەتگوخزمەتدا گرتووەو لەدەرەوەی وڵاتدا چەندین پرۆژەو کۆمپانیاو شەریکەو ئوتیلو چیشتخانەی گەورە گەورەیان هەیەو، وەکو پیشتریش لەم کتیبەدا باسم کردوە حالی حازر خاوەنی ملیاریکو سەدو حەفتا ملیۆن دۆلارن. ئەوە بیجگە لەوەی ساڵانە معاشی ١٥ هەزار چەکدار لەحکومەتی تورکیاوە وەردەگرن، هەر چەکدارەی ٢٠٠ دۆلارەو، جگە لەوەی کەمانگانە یەك ملیۆن دۆلار پارەتی لەهەمان حکومەت وەردەگرن بەرامبەر شەرکردنی دژی(PKK).

٣-ئەو بنەماڵەیە شیوازی کارکردنیان شیوازیکی موخابەراتی رووتە. هەر لەیەکەم رۆژی دەستبەسەراگرتنی ئەم بنەماڵەیە بەسەر پارتیدا لەلایەن مەلا مستەفاوە دەستیان کرد بەتەسفیەکردنی نەیارانی سیاسەتەکانی خۆیان. بەتایبەتی دوای کۆنگرەی شەشەمی قەلادزێ، کە لەدوای ئەم کۆنگرەیەوە بنەماڵە توانی بەیەکجاری دەست بەسەر پارتیدا بگرێ.

زۆر کەس لەمن دەپرسن دەلین ئایا پارتی دەسکردی داگیرکەران نییە؟! لەراستیدا نەخیر، چونکە ئەم حزبە شۆرشگیرە لەسەرەتادا لەلایەن هەمزە عەبدوللاو کاکە زیادو شیخ لەتیفی حەفیدو ئیبراهیم ئەحمەد دروستکرا، دوای ئەوەی قازی محمدپیێی وتن ئیوە حزبیك بۆ خۆتان دروست بکەن. ئەوانیش هاتن بارزانییان کردە سەرۆکی حزب. لەو رۆژەوە بارزانی لەهەولدا بوو حزب بۆخۆێ بەکاربینیو لەریگای خەباتی

کوردایەتی پاك لای بدا. بەلگەیەکی تری ئەم ڕاستییە ئەوەیە کە لەدوای ئەوەی بنەماڵە بەیەکجاری دەستی بەسەر پارتی ئەوەیە کە لەدوای ئەوەی بنەماڵە بەیەکجاری دەستی بەسەر پارتی داگرتووە تا ئیستا پشتی بەهیزی چەکداری خۆی نەبەستوە، بەلکو تەنها لەڕیگای پاراستنەوە پلانە دوژمنکاریو نائینسانییەکانی خۆیان دەرهەق بەگەلەکەمان پیادە دەکەن و، هەر کاتێ پێویست بکا داوا لەدەولەتە ئیقلیمیەکان دەکەن تا بەفریایانەوە بین. هەروەکو چۆن لە٣١ ی ئابی١٩٩٦ دا لەشکری بەعس فریایان کەوتو لە١٩٩٨دا لەشکری تورکی.

٤-ئەم بنەماڵەیە، لەڕیگای دەزگا جۆراوجۆرەکانی ڕاگەیاندنەکانەوە، بەردەوام شەڕیکی تەفرەدانی خەڵکو هەلخەلەتاندنیانن هەموو عیراق و گۆڤارو رادیۆو کەنالە تەلەفزیۆنە جۆراجۆرەکانیان و وەزارەتی ڕۆشنبیریان خستۆتە سەرسەختی خۆیان. لەسەر چوار پارچەی کوردستاندا چەندین ڕۆشنبیرو نوسەریان ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ کریوە، هەر بۆیە بریاری کوشتنی منیشیاندا چونکە ئامادە نەبووم ببمە زورنا ژەنی ئەوان. ئەمڕۆ لەهیچ ناوچەیەکی کوردستانداو لەژێر دەسەلاتی هیچ حزبیکی کوردیدا بەئەندازەی پارتی بلاوکراوەو نوسین لەسەر کوردایەتی دەرناچیت، بەلام لەواقیعدا هیچ حزبیك بەو ئەندازەیە خائین و دژە کورد نییە! لەناو هەموو ئەو دەزگایانەی پارتیدا گولان کە لەلایەن خودی نیچیرڤانەوە سەرپەرشتی دەکری و رووی ڕاگەیاندنی پاراستنە، ئەم دەزگایە لەهەموویان بەد ناوترو گلاوترە.

٥-ئەم بنەماڵەیە بەتەواوی پشتیان بەدەوڵەتە ئیقلیمیەکان بەستوە، ئەم دەوڵەتانەش بۆیە یارمەتیان دەدەن چونکە دڵنیان لەوەی کەئەم بنەماڵەیە مە ترسی نین لەسەر بەرژوەندیەکانیان و کار بۆ سەربەخۆیی کوردستان ناکەن. بەڵگەی ئاشکرای ئەوەش ئەو هەموو شەرانەیە کەدەوڵەتە ئیقلیمیەکان لەسەر ئەو بنەماڵەیە کردویانەو دەی کەن، کە لەراستیدا شەرە لەسەر بەرژوەندیەکانی خۆیان. هەر ئەوەش وای کردوە سنووری دەسەڵاتی ئەوان تا رادەیەك بێ دەنگو ئارام بیتو، کو هەولیر. چونکە ئەم شارە بارەگای نهینی هەموو دەزگاکانی موسادو موخابەراتی عیراقی سی ئای ئەیو میتی تورکیو ئیتلاعاتی تیدایە، کەبەهەر هەموویان کار بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەکەن. بەڵام کاتیك مەسعود بارزانی دیت بۆ هەولیر هەزار پاسەوانی زیاتر لەگەلە، چونکە گەل و جەماوەری لەگەڵدا نیە، دڵنیام لەداهاتوشدا چۆن لوقمان دوای ئاشبەتاڵ بارزانی لەئیران جیهیشتو لەنامەیەکدا بۆ باوکی نوسی بووی من توانام نەما جیت دیلمو دەچمە بەغدا بەهەمان شیوەش رۆژیك دیت سوداد وا بەمەسعود بلێو، چۆن لەزاخۆ خەلك پەلاماری گومرگی ئیبراهیم خەلیلی دا، بەهەمان شیوەش جەماوەری شاری قەلاو منارە لەبچوکترین فرسەتدا رادەپەرنو شار بەدەریان دەکەن.

٦-ئەم بنەماڵەیە هەرگیز گوییان بەهیچ پیوەرو ئەخلاقیکی کوردەواری نەداوە.بۆ نموونە:

ا- لەساڵی ١٩٦٥ کاتێك بارزانی هاتە گوندی لەنگە دێو بەمیوانی مایەوە، کە لەو کاتەدا ئەحمەدی مینەرەندان خاوەنی گوندەکە بوو، کاتێك ئەو نۆکەرەی لەبەر دەستی بارزانی دابوو هاتووچۆی دەکرد بینی کچێکی جوان لەو گوندە هەیە، بۆیە هاتە لای و پێی وت لەماڵی ئەحمەد مینە رەندان کچێکی زۆر جوان هەیە، کەناوی سەبرییە. بارزانی یەکسەر بەشوێنیدا دەنێرێ کاتێك کچەکەدا بارزانی پێی دەڵێ: دەمەوێت بتکەمە کچی خۆم، ئەویش وەڵامی دەداتەوە دەڵێ: هەموو ئافرەتانی کوردستان کچی تۆن و شانازیشت پێ دەکەن، بارزانی دریژە بەقسەکانی دەداو دەڵێ: دەمەوێت بتدەم بەسایبری کورم. هەرچەندە کچەکە وەڵامی دەداتەوەو پێی دەڵێ: من لەساڵی ١٩٥٩ دەست گیرانم هەیەو دراوم بەبەهائەدین حاجی سەفەر، بەڵام مەلا مستەفا بەدەستو پیوەندەکانی خۆی دەڵێ بچن بەخزمو کەسو کارەکانی بڵێن خۆشی بێو ناخۆشی بێ ئەمە بووکی بارزانییە. لەو کاتەدا خۆم لەو ناوچەیە بووم کەزێرو جلو بەرگەکانی بەهائدینیان لەسەبریە کردەوەو بۆ ماڵی حاجی سەفەریان ناردەوە، هەروەها لەویش بووم کەهەڵپەرکێکەیان لەبەردەم ماڵی بەهائەدین کرد بۆ سوکایەتی پێکردنو دەربرینی دەسەڵاتی خۆیان.

ب-عوبەیدوڵڵای کوری گەورەی مەلا مستەفا ژنێکی ئاسوری هەبوو وە خاوەنی منداڵیکیش بوو، بەڵام بارزانی فەرمانیدا بیکوژن هەتا ئەمرۆش نازانرێت تەرمەکەی چی بەسەر هات.

ج- لەناوچەی بالەکایەتی‌دا چەندین روداوی لەو جۆرە رووی داوە کەوای لەخەلکی ناوچەکە کردوە بەگشتی دژی ئەم بنەمالەیە بن. بۆ نموونە بارزانی زۆر ژنی ئەم ناوچەیەی لەدۆست و پیوەندەکانی خۆی مارە کردوە، دوای ئەوەی بەمیردەکانی خۆیان بەتەلاقدانی داون. یەکیك لەوانە بەبارزانی دەلێ تۆ ئامادەی دەست بەرداری ژنەکەی خۆت بیت تا میرد بەیەکێکی‌تر بکات، بارزانی بەم قسەیە تورە دەبێ‌و یەکسەر فەرمانی کوشتنی دەدا. ژنیکیتریش بەهەمان شیوە لەتاو پاراستنی ناموس‌و کەرامەتی خۆی مل کەچی فەرمانی بارزانی نەبوو بۆیە خۆی کوشت.

٧-ئەو بنەمالەیە دوژمنی سەر سەختی هەموو عەشیرەتە کورد پەروەرو نیشتمانپەروەرەکان بوونەو، لەریگای دژایەتی‌کردنی ئەو عەشیرەتانەوە خۆیان بەسەر کوردستان سەپاندوە. لیرەدا بۆشی دەزانم بەکورتی تیشك بخەمە سەر هەلویستی نابەرپرسانەو دوژمنکارانەی ئەو بنەمالەیە بەرامبەر ژمارەیەك لەعەشیرەتە ناودارو ناسراوەکانی گەلەکەمان. بنەمالە لەمیژووی دوژمنکاری عەشیرەتە کوردیەکاندا خاوەنی لاپەرەیەکی خوینناوی‌و پڕ لەخیانەتە، لەو ریگایەدا چەندین گوندیان سوتاندوەو چەندین هاولاتی کوردیان کوشتوە، لەدواجاریشدا لەریگای درۆو بوختانەکانیانەوە ناو سومعەی ئەو عەشیرەتانەیان زراندوە. تا خۆیان بەتاکە عەشیرەتی کورد پەروەر بناسینن. کە لەراستی‌دا ئەمەش یەکیکی‌ترە لەفیلە گەورەکانی ئەم بنەمالەیە. هەروەها بەلگەیەکی‌تری دیکتاتۆری‌و

ملـهوڕی بنەماڵـەی بارزانییـە بەرامبـەر گـەلی كـورد بەگشـتی و عەشـیرەتە ناسـراوە كوردپـەروەرەكان بەتایبـەتی. كەهـەر لەسەرەتای پەیدا بوونیانەوە ئەمە كاریان بووە تا ئیمرۆ.ئەمەی خـوارەوە نموونەیـەكی رەفتارەكانیانـە بەرامبـەر عەشـرەتە كوردیەكان.

## یەكەم:- هەڵوێستیان بەرامبەر بەعەشیرەتی سورچی.

سەرۆكی ئەم عەشیرەتە لەناوچەی سۆران حوسێن خدر ئاغا سورچی‌و عومەر خدر ئاغای سورچی‌یە لەگوندی "كەلەكین"ی سەر بەناحیەی خەلیفانی پاریزگای هەولێر. من لەشەستەكانی سەدەی رابردووەوە تا ئێستا پەیوەندیەكی دۆستانەی تووندم لەگەڵ ئەم دوو پیاوەو عەشیرەتەكەیاندا هەیە. عومەر ئاغا لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە لەگەڵ شۆڕشی پێشمەرگە بوون رۆلی سەرەكی هەبووە لەچالاكی یەكانی سنووری خەلیفان. بەسەركردایەتی ئەو زاتە ناحیەی حەریر لەسەرەتای شۆڕشدا ل دەست رژێمی عیراقی دەرهێنراو ئازاد كرا، هەر ئەم پیاوە توانی مەخفەرەكانی كەلەكین‌و خەلیفان‌و گەلی عەلی بەگ‌و خیلان ئازاد بكا. هەر بۆیە دوای ئەم چالاكیە فراوانانە ناو ناوبانگی خۆی‌و عەشیرەتەكەی لەناو هەموو كوردستان بلاوبووەوە. بارزانی كەزانی ناو عەشیەتی سورچی‌و ناوی عومەر ئاغا خەریكە جیگەی خۆی‌و عەشیرەتەكەی دەگریتەوە دەستی كرد بەبەرنامە دانان بۆ زراندنی ناو سومعەیان. هەر بۆیە دوای ماوەیەكی كەم

لەو داستانان بارزانی بۆسەیەکی بۆ عومەر ئاغاو عەشیرەتەکەی نایەوە، تا لەناویان بەرێ. بەڵام یەکێك لەوانەی فەرمانی کوشتنی عومەر ئاغای پێدەدرێت هەواڵەکە زوو دەگەیەنەتە لای عومەرئاغا، ئەویش لە ترسات شۆرش بەجێ دەهێڵێ و دەچیتەوە ناو رژێم. ئەو عەشیرەتە لەوساتەوە تا راپەرین هیچ پەیوەندیەکیان بەبنەماڵە نەما. لەساڵی ١٩٨٣ مام جەلال وەکو لەکتێبەکەم باسم کردووە منی ناردە لای ئەو عەشیرەتە بۆ گفتوگۆو دانوستان.

ئەو عەشیرەتە لەمێژووی خۆیدا چەندین هەڵسوکەوتی جوامێرانەی بەرامبەر گەلەکەمان نیشان داوە، بۆ نموونە ساڵی ١٩٨٨ کاتێك رژێم دۆڵی بالیسانی کیمیاباران کرد، خەڵکی ناوچەکە هانایان بۆ ئەم عەشیرەتە برد تا فریایان بکەون، بۆیە زەیدی کوری عومەر ئاغا بەهانایانەوە دەچێ و هەموو بریندارەکانیان دەگەیەنێتە نەخۆشخانەی سەربازی. لەنەخۆشخانەدا کابرایەك بەزەید دەڵێ بەفەرمانی رژێم تیمارکردنی بریندارى چەکی کیمیاوی قەدەغەیە، ئەگەر برینداردکە سەر بازی لەشکری عێراقیش بێ و بەهەڵە پێکرابێ، بۆیە ئەم خەڵکە ئەو دەرزیانەی لێ دەدرێ دەرمان نییەو ئاوی مقەتەرە. زەید کەگوێی لەمە دەبێ دەچێتە لای ئەفسەری بەرپرسی نەخۆشخانەکەو بەتورەییەوە فەرمانی پێدەکات کەدەبێ ئەو بریندارانە تیمار بکرێن، بەڵام ئەفسەرەکە پێی دەڵێ ئەو کارە لەدەست من دانییەو فەرمانی سەرکردایەتی شۆرشە. بۆیە زەید دەمانچەکەی دەردەهێنێ و دەیخاتە ناو دەمی و بەزۆر

هەموو بریندارەکانی پێ تیمار دەکات. ئەم رووداوە لەدوایدا زەیدو عەشیرەتەکەی تووشی گێروگرفتی زۆر کرد لەگەڵ رژێم.

نموونەیەکی تری جوامێری ئەو عەشیرەتە ئەوەیە کەکاتێك سەدامحوسێن لەسەرەتای راپەریندا حوسێن ئاغا سورچی و لەگەڵ چەند کەسانیتر بانگ دەکاو داوایان لێ دەکا هەریەکە لەگەڵ هەزار چەکداردا بچن بۆ باشوری عێراق بۆ رووبەروو بوونەوەی راپەرینی شیعەکان، خوسێن ئاغا وەڵامی دەداتەوەو بەزیرەکی خۆی بروا بەسەدامو داروودەستەکەی دەهێنێ کەنابێ یەك کورد لەدامرکاندنەوەی راپەرینی باشوردا بەشدار بن.

هەروەها کاتێك لەفەیلەقی هەولێر کۆبوونەوە بەچوار سەدو پانزد مستەشار دەکرێ و بەناوی سەرکردایەتی شۆڕشی بەعسەوە پێیان رادەگەیەنرێ کە لەمەودوا لەهەر گوندێك یەك پێشمەرگەی لێبێت هەر هەموو گوندەك کیمیاباران ددکرێ، یەکەمین کەس کە لەو کۆبوونەوەیەدا دەستی نارەزای بەرز کردەوە عومەر ئاغای سورچی بوو، کە لەبەرپرسەکەی پرسیی بوو ئایا ئەوەی ئێوە لەکوردستان ئەنجامی دەدەن، لەباشووریشدا دووبارەی دەکەنەوە؟ ئەوانیش وەڵامیان دابوەو وتبویان نەخێر، ئەو جار عومەرە ئاغا وتبوی گوندەکەی من کەلەکین نزیکەی ٥٠٠ ماڵە، ئایا ئەگەر کوڕێك لەماڵێك لەو ماڵانە چووە ناو پێشمەرگە ئێوە هەموو گوندەکە کیمیا باران دەکەن ؟ ئەوانیش وەڵامی دەدەنەوە دەڵێن بریاری سەرکردایەتی شۆڕشە کەدەبێت هەموو گوندەکە ویران بکرێت.

ئـەم هەڵویسـتەی عومـەر ئاغـا وای کـرد لـەکۆی ٤١٥ موستەشـارەکە ٤٠٩ یـان دەنگـی نـارەزایی خۆیـان بخەنـە پـاڵ عومـەر ئاغـاو بەرامبـەر ئـەو بریـارە بوەسـتن و تەنـها شـەش موشتەشـاریان لەگـەل بریـاری بـەناو ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی شۆرشدا دەبن.

دوای ئەمە رژیم لەسـەعات نـۆی بەیانیـەوە تـا پینجـی ئیـوارە دەرگایان لەسەر دادەخا، لەو هەشت سەعاتەی زیندانـی ئـەو ٤٠٩ موستەشـارەدا لـەناو خۆیـاندا دەسـت دەکـەن بـەگفتوگۆو قسەکردن، لەئەنجامدا بریار دەدەن ئەگەر ئەم جارە رزگاریـان بـێ ئـەوا لـەداهاتودا هـەموو توانایـەکی خۆیـان بەکاربهینن دژی رژیم. لەکاتی رایەرینیشدا ئەو بەلینەیان بردە سەر، تەنها ئـەو شـەش موستەشارە خۆفرۆشـە نـەبیت کەبریارەکـە رازی بـوون، شـایانی باسـە ئیسـتا دانەیـەکیان لەگـەڵ بنەمالـە دایـەو نـاوی میرزایـەو خەلکی کۆیە.

سـورچیەکان لـەکاتی رایـەریندا رۆلـی سـەرەکییان هـەبوو لەراماڵینی بەعس و رزگـارکردنی ناوچـەکانی خۆیـان و سـەرجەم ناوچەکانیتر بەتایبـەتی کـەرکوك. دوای رایـەرین کـاتیك مەسـعود بـارزانی گەیشتە قـەزای سـۆران لـەمالی عـزەت بـەگی دەرگەلـەدا لەگـەڵ عومـەر ئاغـاو حوسـین ئاغـا کۆبـۆوە، دوای کوبوونەوەکـە کـاتیك عومـەر ئاغـاو حسـین ئاغـا هەلسـان بـرۆن، موسـعود لەخزمەتیان چوو تا گوندی کەلەکین.

سورچیـەکان لەسـەرەتادا یارمەتیـەکی زۆری بنەمالـەیان داو چـەندین سـەیارەو پارەیـان پیـدان. تـا لـە٢٩/٥/١٩٩٦ مەسـعود

داوای لەعومەر ئاغا کرد بۆ ئەوەی میوانداری بکا، ئەویش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ، ئیمەی حزبی پاریزگاران لەگەڵ هەموو حزبە کوردیەکان لەیادی شۆرشی ئیسلامیدا لەکۆماری ئیسلامی ئیران دەعوەت کراین، بۆیە هەر کاتیك لەو سەردانە هاتینەوە ئاگادارت دەکەینەوە.

دوای ئەوەی عومەر ئاغا لەگەڵ حزبە کوردیەکان کارەکانیان تەواو دەبیت، لە١٩٩٦/٦/٩ دەسەڵاتدارانی ئیران ئاگاداریان دەکەنەوە کە١٠ ی مانگ لەتارانەوە بۆ ورمێ بە فرۆکە بەرێ دەکریت لەویشەوە بەئۆتۆمبیل بۆ کوردستانی عیراق. دوای خۆ ئامادەکردنی نوینەری حزبە کوردیەکان بۆ گەرانەوە بۆ کوردستان، سکرتیری ئاغای محەمەدی دیتە لایان‌و پییان دەڵێ: ئەوەی سورچیە با بمینیتەوە، چونکە کارمان پییانە. لەهەمان رۆژ بەفەرمانی مەسعود بۆسە بۆ عومەر ئاغا دەنریتەوە لەحاجی ئۆمەران، لەخەلیفانیش بۆ حسەین ئاغا. بەلام لەبەرئەوەی عومەر ئاغا لەئیران دەمینیتەوەو لەکاتی دیاری کراودا ناگاتەوە کوردستان، تەنها حسەین ئاغا کەوتە ناو بۆسەوەو لەخەلیفان دەستگیر کرا. بۆیە کاتیك بنەمالە دلنیا دەبیت کەعومەر ئاغایان بۆ دەستگیر ناکری‌و پلانەکەیان سەر ناگرێ بۆیە لەهەمان رۆژدا حسەین ئاغا ئازاد دەکەن، دوای ئازادکردنی قەرەنسێ خەریری‌و کەریم جومعەو عەریف حوسین رۆژانە دەچنە لای‌و پێی رادەگەیەنن کەئەم کارە بەفەرمانی مەسعود بارزانی نەبوە، بەلکو بەهەلە رووی داوە، بەم قسانە

تەنها مەبەستیان شاردکردنەوەی حوسێن ئاغا بووەو دروستکردنەوەی متمانە بووە.

لەهەمان ماوەدا کەریم جومعە لە١٥ مانگدا نامەیەك مەسعود بارزانی بۆ حسەین ئاغا دەباو پێی رادەگەیێنێ کەشەوی مەسعود نانی نیوەڕۆ لەلای تۆ دەخوا میوانت دەبێ، کەحسەین ئاغا ئەمە دەبینیت بەتەواوی دلنیا دەبیتو، یەکسەر فەرمان بەهەموو ئەو چەکدارو کەس و کارەی کرد کە لەچوار دەوری گوندی کەلەکین لەئامادە باشی دابوون بلاوەی لی بکەن، کەژمارەیان نزیکەی ٣٠٠٠ هەزار چەکدار دەبوو، لەوانە جەمیل ئاغای سورچی و زەیدی کوری عومەر ئاغای سورچی کەبرازاو زاوای عومەر ئاغا بوون. زەید دەچیتە لای حسەین ئاغاو پێی دەلێ ئەو فەرمانەی تۆ نە لەبەرژەوندی عەشیرەت و نە لەبەرژەوەندی کوردە، بنەماڵە درۆت لەگەڵدا دەکەن و خیانەتت لی دەکەن، تۆ مامی و من برازاتم بۆیە نارۆم و بەتەنها جیت ناهیلم و نایەلم ئەو هیزەش بلاوەی لی بکا. بەلام حسەین ئاغا دەلێ مەسعود من ناکوژیت چونکە من هیچم بەرامبەری نەکردوە. لەدواجاردا حسەین ئاغا فەرمان بەزەید دەدا کەدەبێ خۆی بڕواو هیزەکەش بلاوەی پێ بکریت، ئەوانیش بلاوەی لی دەکەن. بنەماڵە ئەمە بەهەل دەزانێ و لەرۆژی داهاتودا سەعات پینجی بەیانی لە١٩٩٦/٦/١٦دا لەشکری بنەماڵە پەلاماری گوندی کەلەکین دەدەن و حوسێن ئاغا بەبریندداری دەگرن و دەیکوژن. دوای ئەوە لەشکری بنەماڵە هەموو گوندی کەلەکینیان تالان کردو دارەکانیان سوتاندو نەوتیان کردە ژیر رەگەکانیان.

*　　*　　*

لەدوای ٣١ی ئابیشدا جەمیل ئاغای برای حسین ئاغا گیراو پاشان کوشتیان. هەر وەکو لەبەرگی دووەمدا باسم کردووە، لەدوایی ئەم رووداوە هەر سەرکردەو کادیریکی پارتیم بینیبێ لەبەرامبەر ئەو رووداوەدا دەی وت: ئەمە باشترین کاری مەسعود بارزانی بوو، واتە رووداوەکەی کەلەکین. تەنها شیخ محەمەدخالید بارزانی نەبیت کەکارەی بەکردەوەیەکی خراپ دادەناو، کاتیك چووم بۆ لام پیی وتم: ئەگەر زوو هاتبایی بۆ لام و لەو کارەساتە ئاگادارت کردبام، نەم دەهیشت روو بدات.

دوای ئەو کارەساتە کەوتمە لیکۆلینەوە تا بزانم بنەمالەی بارزانی بۆچی وایان کرد. پاش بەدوا داچوون و لی ورد بوونەوە سەرەداوی زۆر زانیاریم کەوتە دەست، کە بروای پێ هینام کەئەم کارەی بنەمالە بەفەرمانی خودی سەدامبوودو لەدژی دروشمی رزگارکردنی ولایەتی موسڵ کە لەلایەن حزبی پاریزگارانەوە بەسەرکردایەتی عومەر ئاغا بەرز کرابوودوە. کەوا لیرەدا بەکورتی بۆ خوینەری دەخەمە سەر کاغەز.

هەمووومان دەزانین حزبی پاریزگاران بەسەرکردایەتی عومەر ئاغای سورچی و خزم و کەس و کارەکانی دامەزراوە، لەرووی سیاسیشەوە خالی جیاکەرەوەی ئەم حزبە لەهەموو حزبە کوردییەکانی تر زەقکردنەوەی کیشەی ولایەتی موسڵە، کەدەیان گووت بەشیکی دانەبراوە لەکوردستان و پیویستە وەکو کەرکوك بەکوردستانی داگیرکراوی دابنین. هەر وەکو لەکتیبەکەی کاك نەجم عومەر ئاغای سورچیدا مصیر ولایە الموصل دەردەکەوێ. ئەو پێ داگرتنەی پاریزگاران لەسەر کیشەی

ویلایەتی موصل وای کرد سەرنجی زۆر رووناکبیرو سیاسەتمەدار بەلای خۆیاندا رابکیشن، لەناوەو لەدەرەوەی کوردستاندا.

عومەر ئاغا زۆرجار باسی ئەوەی بۆ کردووم کەوولاتە داگیرکەرەکانی کوردستان لەسەر ئەم دروشمە گرفتیان بۆ ناونەتەوە، هەروەها دەی وت داوام لی دەکەن دەستبەرداری ئەو دروشمە بم.وە ئەوەی بۆ گیرامەوە کەجاریکیان لەئەنقەرە صلاح عومەر عەلی وعەلی سنجاری داوایان لی کردووە کەواز لەکیشەی ولایەتی موصل بینیت.هەروەها ئەوەی بۆ باس کردم ئەو کاتەی لەژنیف عومەرئاغای سورچی و نەجم سورچی و مستر کیلەر بۆ گفتوگۆ لەسەر کیشەی موسل کۆبوونەوە، کە لەئەنجامدا ریگایان پی درابوو ماوەی چارەکە سەعاتیك لەسەر کیشەی ویلایەتی موسل قسە بکەن پاش ئەوەی نووسینیکیان لەسەر ئەم بابەتە دایە دەست بەرپرسانی ژنیف.ئەوانیش لەودلاەدا رۆژیکیان بۆ دیاری کردبوون بۆ ئەم مەبەستە.لەهەمان هۆلدا لەنزیك عومەرئاغاو کاك نەجم سی نوینەری رژیمی عیراقی دانشتبوون، کەبارزان تکریتی بەرپرسی یەکەمیان بوو وە دووکەسەکەیتریان مەسیحی بوون بەناوی ابو محمەدەوە خۆیان پی ناساندم. هەرسیکیان پییان رادەگەیەنن کەکاغەزیکی سپی بەئیمزای بارزان دەخەنە بەر دەستیانو، ئازادن چی دەنووسن تا بۆیان جیبەجی بکەن، بەمەرجیك ئەو وتارەی لەسەر کیشەی ویلایەتی موسلە نەخویندریتەوە. عومەرئاغا ولامیان دەداتەوە پییان رادەگەینی کەئەو

دوەستبەرداری ئەم بیرو باوەرە نابێ و وتارەکەیان پیشکەش دەکەن. بەڵام بارزان تکریتی وازی لێ ناهێنێ و هەر لەهەوڵدا دەبێ بۆ بروا پێ هینانیان، وەکاتیك دلنیا دەبێ لەوەی کەئەوان وتاردکەیان هەر دەخویننەوە بەعومەرئاغا دەلێ پیم باشە بزانی مادام وایە تۆو هەموو بنەماڵەکەت لەناو دەبەین عومەرئاغاش بەرەقی وەڵامی دەداتەوە دەلێ من بەجل و بەرگی کوردی لەو هۆلە دیمە دەرەوە تۆ کەراست دەکەی بمکوژە.

دوای ئەوەی عومەرئاغا ئەوەی بۆ گیرامەوەو کارەساتی کەلەکێن رووی دا، دوای ئەمە بەتەواوی بەردەوام بەوە هات کەسەدام لەپشتی ئەم رووداوەیە. بۆیە تا چەند سالیك بەدوای ئەم رووداوەش من هەر گومانم هەبوو لەو کارەساتەو دلنیابووم کەئەو کارەی بنەماڵەی بارزانی لەوە گەورەترە کەخەلك تیی گەیشتووە، چونکە من بەتاقیکردنەوە بۆم دەرکەوتووە کەبنەماڵە بەو شیوەیە کاریك ئەنجام نادات ئەگەر فەرمانی دەولەتانی لەسەر نەبیتو، هەمووشمان دەزانین پاریزگاران و عەشیرەتی سورچی لەدەرەوە دۆستی زۆریان هەیە، بۆیە بەردەوام پرسیارم لەخۆم دەکرد کەچۆن ئەم کارە ئەنجام درا ؟هەتا ئەوە بوو لەمانگی ٩ی سالی ٢٠٠٠ لەکاتی نان خواردنم لەگەڵ عومەرئاغای سورچی پیم گووت:من هیشتا گوومانم هەیە لەهۆکارە راستەقینەکانی ئەو کارەساتە ؟بەو شیوەیە هینامە قسەو راستییەکانم پێ درکاند، کەوا لیرەدا دەیخەمە بەردەست خوینەران تا بزانن بنەماڵەی بارزانی چۆن بەفیتی بیگانە ئاگر لەماڵی کورد بەردەدەن. هەرچەندە تا ئەو رۆژە زیاتر لەبیست

جار لەسلیمانی لەگەڵ عومەرئاغا دانشتبووم و گفتوگۆم کردبوو، بەڵام ئەوە یەکەم جار بوو بەم شێوەیە بکەویتە قسەکردن لەسەر رووداوی کەلەکین، منیش بریارمدا ئەو راستییانە بۆ هەموو خەلك ئاشکرا بکەم.عومەرئاغا بەم شێوەیە رووداوەکەی گیرایەوە:

سەرکردەیەکی موخابەراتی عەسکەری تورکی بەناوی جەم پەیوەندی پێوە کردم و پێی راگەیاندم کەحوکمەتی تورکی بەتایبەت سەرۆك تورکوت ئۆزال بەهەموو جۆریك پشتگیریتان دەکات بۆ دامەزراندنی کۆنفیدرالیەك لەنێوان تورك و کورددا بۆ ویلایەتی موسڵ.هەروەها پێی راگەیاندم کەپاش ماوەیەکی‌تر داوا دەکریم بۆ تورکیا تا لەگەڵ ئۆزالدا قسە لەسەر ئەو بابەتە بکەین، وە وتی دەبێ ئەو قسەو باسە تا رۆژی راگەیاندنی نهێنی بێت. حەوت رۆژ پێش مردنی ئۆزال گەیشتمە ئەنقەرە لەوێ لەیەکێك لەئۆتێلە گەورەکان ژووریکیان دامێ، یەکەم جار سکرتێری حزبێکی تورکی کەناوی تورکش بوو بینی. ئەو کەسەی منی بردە لای ئەفسەریك بوو بەپلەی عەمیدو زمانی عەرەبی و کوردی بەباشی دەزانی. دوا بەدوای ئەوە هەمان ئەفسەر بردمیە لای سەرۆك ئۆزال، لەکاتی گفتوگۆکانمدا پێی وتم: من بریارم داوە شتێك بۆ ئێوە بکەم، چونکە بروام هاتووە کەئێوە زولمی زۆرتان لێ کراوەو ناڕەحەتیتان زۆر بینیوە، بۆیە دەمەوێ یارمەتیتان بدەم تا ببنە حکومەت.دووبارە ئەویش داوای لێ کردم کەئەم کارە تا رۆژی راگەیاندی بەو پەری نهێنی بمێنێتەوە. لەدوای کۆبوونەوەکە داوای لێ کردم کەکاریکی وا

بکەم لەماوەی ١٠ ڕۆژدا سێ سەرکردەو سیاسەتمەداری ناسراوو سەرۆك عەشیرەتی گەورەی کوردی بگەیەنمە لای.
هەروەها پێی ڕاگەیاندم کەسەرکردە جەم هەموو کارئاسانییەکیان بۆ دەکات لەسنووری تورکیاوە تا ئەنقەرە.ئەوسا کۆبوونەوەیەکی فراوان ئەنجام دەدەین و ئەوە ڕادەگەیەنین کەئیمە بڕیارمان داوە موسڵ بەشێکی کوردستانەو لەلایەن تورك و کوردەوە بەڕێوە دەبرێ.

پاش چەند سالێك بۆ یەکجاری حکومەتی کوردی ڕادەگەیەنین. سەرۆك ئۆزال ئەوەشی پێ وتین کەپێویستە لەهەمان کۆبوونەوەدا نوێنەرانی کورد بەیاننامەیەك ئیمزا بکەن بۆ حکومەتی تورکی، کەبەپێی ئەو بەیاننامەیە بەڵێن بدەن ساڵانە یان ملیارێك دۆلار بدەن بەحکومەتی تورکی یان لە٢٥٪ی داهاتی نەوت.بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارەش تورکەکان وتیان ئێمە هەموو شتێکمان ئامادە کردووە.عومەرئاغا لەدرێژەی قسەکانیدا وتی دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکە بەدڵخۆشی هاتمە دەرێ و بڕیارمدا لەماوەی دیاری کراودا ئەو ٢٠ کەسە کوردە ئامادە بکەم، بۆ ئەم مەبەستە یەکسەر پەیوەندیم کرد بەنەجمو داوام لێ کرد کەبەزوترین کات بەم کارە هەڵبستێ، بەڵام بەداخەوە دوای ٧ ڕۆژ لەم کۆبوونەوەو بڕیارانە تورگت ئۆزال لەبارودۆخێکی نادیارو ئاڵۆزدا کۆچی دوای کرد، پاش ئەمەش بۆ ماوەیەکی کەم سەرکردە جەمکە لەفرۆکەیەکی هەلیکۆپتەردا بوو موشەکێکی ئاراستە کراو کوژرا لەگەڵ یاوەرەکانی کە لەناویاندا ئەفسەرێك و سکرتێرەکەی کەئافرەت بوو بەرکەوتن.

شایانی باسە لەکاتی گفتوگۆکانی عومەر ئاغا لەگەڵ ئۆزالدا، شەریکەیەکی نەوتی ئەمریکی بری ٥ ملیۆن دۆلاری لەبانکیکی سویسری دادەنێ بەناوی پینج سەرکردەی حزبی پاریزگاران، بەو مەرجەی هەرکاتیك کورد ببیت بەدەولەت و ویلایەتی موسڵ بیتە ژیر دەستیان ئەوا دەبێ لەبری ئەو پینج ملیۆن دۆلارە ٧ ملیۆن دۆلار بدریتەوە هەمان کۆمپانیاو هەروەها پرۆژەی بیرە نەوتەکانی کوردستان بدریتە هەمان کۆمپانیا، بەنرخی رۆژ نەوتیان پێ بفرۆشرێ. پارەی کۆمپانیاکە لەبانکی سویسرا لەژیر ئەو ناوانە دانرابوو: عومەر خدر سورچی، عبدالقادر بریفکانی، ئاکۆ عەباس مەمەند ئاغا،ئیبراهیم حاجی مەلۆ،مستر کیلەر. بەلام عومەر ئاغا لەدوایدا بەو چوار کەسەی‌تر رادەگەیەنێ کەئەم پارەیە هی گەلی کوردەو بەناوی حکومەتەکەیەوە خراوەتە بانکەوە، بۆیە کەس بۆی نییە یەك دۆلاری لێ رابکیشێ بەبێ رەزامەندی هەر پینجیان. کاتیك عومەرئاغا زانی عبدالقادرو ئیبراهیم حاجی مەلۆو میستر کیلەر دەیانەوێ پارەکە لەنیوان خۆیاندا دابەش بکەن، خۆی دەگەیەنیتە سویسراو هەموو پارەکە بۆ کۆمپانیاکە دەگیریتەوە. پەیوەندی ئەم رووداوە بەمەسەلەی تورکت ئۆزال و دروستکردنی کۆنفدرالی کوردی تورکی لەسەر ویلایەتی موسڵ ئەوەیە کەئەم مەسەلەیە نەك هەر لەلایەن تورکیاوە بەجدی وەر گیراوە بەلکو لەلایەن کۆمپانیا نەوتە گەورەکانی جیهانیشەوە لەئان و سات دابووە.

هەر لەچوارچێوەی ئەم كارەدا ئۆزال پێش ئەوەی عومەرئاغا ببينيت بەماوەيەكی كەم مام جەلال و كاك مەسعودی لەگەڵ خۆيدا بۆ سعوديا بردبوون، چونكە ئۆزال بڕوای وابوو كەئەگەر سعوديا بەم كارە رازی ببيت ئەوا دەكريت سەرجەم ولاتە عەرەبييەكانی‌تر و ئەمريكاش رازی بكرێ. بەڵام كاتيك كەدەگەن بەسعوديا ئۆزال و مام جەلال و كاك مەسعود لەلايەك و مەليك فهد و ئەمير خاليد و ئەمير عەبدوللا لەلايەكی‌تر كۆبوونەوەيان ئەنجام دا، لەدانيشتنەكەدا ئۆزال باسی چەوساوەيی كورد و ئازار و ئەشكەنجەكانيان دەكات و دەڵێ كوردەكان مافی خۆيانە ددولەتی سەربەخۆيان هەبێ، بەم كارە جگە لەوەی كەچاكە لەگەڵ ئەم گەلەدا دەكەين لەهەمان كاتدا هۆی سەرەكی ئاژاوەو نا ئارامی لەناوچەكەش بنبر دەكەين. بۆ ئەم مەبەستە پێويستە ويلايەتی موسڵ لەعيراق جيا بكريتەوەو بەڕيوە بردنەكەی بدريتەو دەست تورك و كورد. مەليك فهد بەئينگليزی وەڵاميان دەداتەوەو چەند جاريك لەسەر يەك دەڵێ N O شتی وا نابيت، هەرچەندە ئۆزال هەوڵ دەدا بڕوايی پێ بێنێ بەو پيشنيارە بەڵام ئەو هەر دەڵێ NO. بۆيە كۆبوونەوەكە بەبێ هيچ ئەنجاميك كۆتايی پێ دەهێنريت. دوای ئەوە بەماوەيەكی كەم ئۆزال بەدوای عومەرئاغادا دەنيرێ و ئەوەی پێ رادەگەيەنێ كەپێشتر باسم كرد.

دوای ئەوەی ئەو زانياريانەم دەست كەوت بڕوای تەواوم بەوە هات كەكوژرانی سەرۆك ئۆزال و سەركردە-قائد- جەم بەدەسيسەی C.I.A وموساد و ميتی توركی بووە. مەسعود

بارزانیش بۆ جێبەجێکردنی فەرمان و داخوازییەکانی موخابەراتی عێراقی و ئەو دەزگا سیخوڕیانە پەلاماری گوندی کەلەکینی داو ئەو کارەساتەی خولقاند.

خوێنەری بەڕێز لێرەدا بۆت دەرکەوت کەئەو بنەماڵەیە چۆن خەڵکی چەواشە دەکەن و فێڵ لێگەڵ دەکەن، ئەوان لەژێرەوە بەفەرمانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان دەست لەگەڵەکەمان دەوەشێنن و لەسەرەوەش پڕو پاگەندەی کوردایەتی دەکەن لەکاتێکدا عەرەبەکان لەوپەری ناکۆکی و دوژمنایەتیاندا ئامادەنین پشتی یەکتری بەردەن ئەگەر ناهەقیش بن، هەروەکو چۆن سعودیە ئامادە نەبوو لەکاتی ئەو پەری ناکۆکی لەگەڵ رژێمی عێراقیدا مل کەچی بڕیارێك بێت کەبەبڕوای خۆیان دژی نەتەوەی عەرەبە. بەڵام لەناو ئێمەدا بنەماڵە نەك هەر زۆر بەئاسانی بەبێ دواکەوتن فەرمانەکانی دوژمن جێبەجێ دەکا بەڵکو هیچ کات دریغی نەکردووە لەبزراندنی ناوی عەشیرەتە کورد پەروەرەکان و تاوانبارکردنیان بەخائین و خۆفرۆش و پیاوی بێگانە، کەخۆیان لەراستیدا داهێنەری خیانەت و خۆفرۆشین.

## عەشیرەتی برادۆست

ئەم عەشیرەتە لەوەچەی خانی لەپ زێرینن ئەو پیاوەی کەقەڵای دم دمی ولەئێراندا دروست کرد، ئەمانە لەئێرانەوە بۆ عێراق هاتوون و بۆیە ئێستاکەش لەئێران لەئورمێ و دەورووبەری و لەمەرگەو شنۆو ناحیەی برادۆست لەئێران هەن،

هەروەها لەتورکیا لەشەمزینان. بنەماڵەی بارزانی لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کەدوای ئەوەی ئەو بنەماڵەیە دەستیان بەسەر عەشیرەتەکانی شیروانی و دۆلەمەری داگرت کەسنووریان لەگەڵ عەشیرەتی برادۆستە، لە سییەکانی سەدەی رابردوودا بارزانییەکان هیزیکی زۆریان کۆکردەوە پەلاماری عەشیرەتی برداۆستیان داو شەر دەستی پێ کرد، لەئەنجامی ئەو شەرەدا چەند گوندیکی برادۆست کاول و ویران کران، لەم گوندانە گوندی مەلای شەکی کەهەموو\یان مەلا زادە بوون و هەژارو کەم دەرامەت بوون و گوندەکەیان چۆڵ نەکرد بەلکو مەلای گوند کەناوی مەلا سعید بوو قورئانی پیرۆزی هەلگرت و بەرەو لەشکری بارزانییەکان چوو کەهاتبوون گوندەکە ویران بکەن، کاتیك پییان گەیشت داوای لیکردن بۆ خاتری ئەو قورئانە هیچمان لی مەکەن، بەلام بارزانییەکان پاش ئەم پارانەوەی مەلا سعید قورئانەکەیان لی وەرگرت و مەلا سەعید و هەموو خەلکی گوندەکەیان بەگەورەو بچوکەوە کوشت و، چەند کەسیکیان وەکو ئاژەڵ سەر بری. ئەو جار پاش چەند رۆژیك برادۆستییەکان پەلاماری بارزانییەکانیان داو لەناوچەکە دەریان پەراندن، دووبارە پاش چەند سالیکی تر بارزانییەکان کۆبوونەوەو دیسانەوە پەلاماری عەشیرەتی برادۆستیان دایەوە وەگوندەکانی دەشتە هیرت و لیلکان و چەند گوندیکی تریان سوتاندو تالانیان کردوو چەند رۆژ شەر لەنیوان هەردوولادا بەردەوام بوو، ئەوەبوو چەند سەرۆك عەشیرەت و ئاغای کوردستانی ئیران نامەیان بۆ شیخ رەشید لولان کەشینی سەرۆك عەشیرەتی برادۆستی نارد

وە تییدا وتبوویان کەتۆ چۆن لەگەڵ مەلائیکەتەکان شەر دەکەی کەمەبەستیان بارزانییەکان بوو. ئەویش وەڵامی دانەوە کەئەم مەلائیکەتانە پاش ماوەیەکی کەم بۆلای ئێوە دێن و دەگەنە خزمەتان، ئەوەبوو پاش ماوەیەکی کەم بارزانییەکان لەشەری برادۆستییەکان شکان و بەرەو ئێران هەڵاتن.

پاش ماوەیەکی کەم کاتێك لەیەکێك لەگوندەکانی سیلوێ بۆ نان خواردن کۆ دەبنەوە بارزانییەکان هەر هەموویان دەکوژن، پاش ئەوە بارزانییەکان لە ترسان هەڵاتنەوە بۆ کوردستانی عیراق و پەنایان بۆ عەشیرەتی برادۆستی هێنا عەشیرەتی برادۆستیش زۆر ریزی لێ گرتن و بەخێراتنیکردن و لەگوندی خەنیرە کەگوندیکی برادۆستییانە لەسەر سنووری کوردستانی ئیرانە لەرۆژهەڵاتی گوندی لۆلان جێیان بۆدانان، بەڵام بارزانییەکان پاش ماوەیەکی کەم خۆیان تەسلیم بەرژیمی عیراق کردەوە، تەنها مەلا مستەفاو چەند کەسێك نەبێ لەناو عەشیرەتی برادۆستیان مانەوە، لەو ماوەیەدا عەشیرەتی برادۆستی گەورەترین خزمەتیانکردن. پاش چەند رۆژێك محمود بەگ کەسەرۆکی عەشیرەتی برادۆستی بوو هێزیکی لەبرادۆستییەکان لەگەڵ مەلا مستەفادا نارد بۆ ناوچەی بارزان، لێپرسراوی ئەو هێزە حسەین بەگی مەجید خانی برادۆست بوو کەئیستاش لەلای مەسعود بارزانی زیندانییە لەمەسیف بەبێ هیچ تاوانێك، جگەلەوەی ئیستا تەمەنی هەشتا ساڵ زیاترە، لەکاتێکدا ئەم کابرایە نەك هیچ تاوانیکی دەرهەق بەبنەماڵە ئەنجام نەداوە بەڵکو مەلا مستەفاشی لەدەست حکومەتی بەعس رزگار کردووە.

هەروەها کاتێك کەمەلا مستەفا بەرەو سۆڤیەت رۆیشت محمود بەگ یارمەتیو کۆمەکی خزمو کەسو کارەکانی دەکرد لەموسڵ ، بگرە محمود بەگ یارمەتی لەسعید قەزاز وەرگرتو چووبۆ لای شێخ ئەحمەدی بارزان کەئەو کاتە نەفی کرابوو بۆ بەصرە وەلەوێ پێی راگەیاندبوو کەئەو ئامادەیە هەر داوایەك شێخ ئەحمەد هەیبێ ئەو بۆی جێبەجێ بکات. بارزانی یەکەم کەس بوو کەبڕی ٥٠٠ تفەنگی ئینگلیزی لەرژێمی عیراقی وەرگرت بۆ شەڕی برادۆستییەکان شان بەشانی رژێمی عیراقی، کە لەئەنجامدا پاش شەڕێکی درێژخایەن برادۆستییەکان ناچار بوون داخل بەسنووری ئێرانو تورکیا ببن، ئەوەش لەپاداشتی ئەو هەموو چاکەی برادۆستەکان لەگەڵ بنەماڵەدا. پاش ئەوەی عەبدولکەریم قاسم هاتە سەر دەسەڵات گفتوگۆ لەنێوان برادۆستییەکانو حکومەتی بەعس دەستی پێ کرد، ئەوەبوو دانووستانەکە سەری گرتو هەموو برادۆستەکان گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان. لەبەهاری ١٩٦١دا دووبارە بارزانییەکان شەڕیان بەبرادۆستییەکان فرۆشت، ئەمجارەیان برادۆستییەکان بەسەر بارزانییەکاندا زاڵ بوونو تەواوی گوندەکانی دۆلەمەریان لەبارزانییەکان پاك کردەوە وەتا نزیك میرگەسوور راویان نان، بەڵام حکومەتی بەعس بەفریایان هاتوو فرۆکەو تۆپو دەبابەی رژێم بووە پاڵپشتی بارزانییەکانو چەندین ناوچەیان بۆردوومان کردو خەڵکی بێتاوانیان کوشت، بەڵام هەر نەیانتوانی برادۆستییەکان بشکێنن، ئەوەبوو حکومەت هەڕەشەی کردو وتی ئەگەر برادۆستییەکان پاشە کشە نەکەن ئەوا سەرجەم

ناوچەکە ویران دەکەین ئەوانیش بەمەبەستی پاراستنی ژیانی هاوڵاتیان گەرانەوە سنوورەکانی خۆیان.

کاتیك کەشۆرشی ئەیلولیش دەستی پێ کرد برادۆستییەکان وەکو هەموو عەشیرەتیکی کورد پەروەر رۆلی سەرەکییان هەبوو لەسەرخستنی شۆرشەکەدا، ئەوەبوو کەریم خان لەگەڵ هێزیکی گەورە چووبۆ ناوچەی بالەك و پەلاماری بنکەو بارەگا سەربازییەکانی رژیمی عیراقیدا، لەهەمان کاتدا لەشکریکی گەورەی بارزانییەکان بەسەرکردایەتی مەلا مستەفا لەبارزانەوە بەرەو بالەکایەتی بەرێ دەکەوێ، لەریگادا تووشی کاروانیکی برادۆستییەکان دەبن کەبەبێ چەك لەدیاناو رەواندزەوە بەرەو ناوچەکانی خۆیان دەگەرانەوە، لەشکری بارزانییەکان ریگایان پێ دەگرن و بەئەمری مەلا مستەفا هەر هەموویان قەتڵ و عام دەکەن، لەناویاندا سێ منداڵ بەچەقۆ سەر بران پاشان هەموو کاروانەکەیان تالان کرد. کاتیك کەبارزانییەکان دەگەن بەبالەکایەتی فەرمانی کوشتنی کەریم خان دەر دەکەن بەلام لیپرسراوی ناوچەکە وەلامیان دەداتەوە دەلێ چۆن دەبێ پیشمەرگەیەکی قارەمانی وەك کەریم خان بکوژن، پاشان بارزانی دەلێ دەبێ بەززترین کات کەریم خان بکوژن بەلام هەندیك کورد پەروەر دەگەیەننە کەریم خان، ئەویش لەگەڵ لەشکری برادۆستی لەدۆلی بالەکایەتی دەکشێتەوە بەرەو ناوچەکانی خۆیان، هەتا لەهاوینی سالی ١٩٦٢دا مەلا مستەفا لەگەڵ هێزیکی گەورەی بارزانییەکان و ژمارەیەکی زۆر لەهێزی پیشمەرگە بەناوی کوردایەتییەوە پەلاماری عەشیرەتی

برادۆستتی دایەوە، لەئەنجامدا شەریکی گەورەی چەند رۆژە بەرپا بوو کە لەئەنجامدا برادۆستییەکان دووبارە ئاوارەی ئێران و تورکیا بوونەوە. تا سالی ١٩٧٠ کەبەیانی ١١ی ئازار دەرچوو دووبارە عەشیرەتی برادۆستی گەرانەوە ناوچەکانی خۆیان بەو ناوەی کەهەموو شتیك کۆتایی هات بەلام ماودیەکی کەمی نەبرد بارزانییەکان کەوتنەوە پیلان دانان و شەر فرۆشتن بەعەشیرەتی برادۆستی، کە وای لەکەریم خان و ئامۆزاکانی و هەندیك لەپیاوەکانی کرد پەنا بۆ ناو رژیم بەرن و لەناوچەی موسل جێ نشین بن تاکو سالی ١٩٧٥.

## عەشیرەتی شیروانی

شیروانییەکان یەکیکن لەو عەشیرەتە کورد پەروەرانەی کە لەشۆرشەکانی گەلەکەماندا چەندین شەهیدیان داوەو رۆلی گەورەیان هەبووە لەخەباتی رزگاریخوازی گەلەکەمان، وە لەگەل بارزانییەکاندا بەژداری گەورەی شۆرشیان کردووە دژی رژیمی عیراقی، بەلام هەر کاتیك بنەمالە فورسەتی بۆ هەلکەوتبێ دەستیان لەو عەشیرەتە وەشاندووەو لەپشتەوە خەنجەریان لیداون.

بنەمالە لەسەردتادا بەسەر شیروانییەکاندا سەپاند کەدەبێ جەمادی سوور لەسەر بنێنن، بەلام شیروانییەکان بەمە رازی نەبوون. لەو کاتەدا سەرۆك عەشیرەتی شیروانی عوزیر ئاغای سەروکانی بوو، کەنەوەی حەسەن بەگی کاکەیی بوو وە پییان

دەگووت ئەمارەتی شیروانی لەو کاتەدا بارزانییەکان بەسەر شیروانییەکاندا زاڵ بوون لەریگای خاتوونی خوشکی ئەحمەد ئاغای بیرسیاوەی کەخیزانی سۆفی محمەد بوو کەباوکی مەلا مستەفایە. ئەحمەد ئاغاش ئامۆزای عوزیر ئاغای سەرۆکانی بوو. بەلام هەر یەکەیان جینشینی گوندیك بوون. بنەماڵە ئەحمەدئاغایان چەواشە کردوو پییان وت ئەگەر تۆ هاوکاریمان بکەی بۆ کوشتنی عوزیر ئاغا ئەوا دەتکەین بەسەرۆك عەشیرەتی شیروانی، ئەوە بوو ئەحمەدئاغا هەلسا بەکۆکردنەوەی هیزیکی ١٥٠ کەسی لەخیلی بەرۆژی کە پییان دەلین بارزانی، بەلام لەراستیدا بارزانی عەشیرەت نییە بەلکو لەچەند گوندیك پیکهاتووە کەبەرۆژیو زیباری هیرشیان کردە سەر گوندی سەروکانیو عوزیرئاغایان کوشت لەگەڵ کورە گەورەکەی رەشیدو دووبرایی حاجی عەزیزو خوارزایەکی صالح. گوندەکەشیان بەشیوەیەکی درندانە سوتاندو تالانیان کرد، لەو کاتەوە ناکۆکی لەنیوانیاندا دەستی پی کرد.کۆمەلیك لەشیروانییەکان کەوتنە لای ئەحمەدئاغای بیرسیاوەیو کۆمەلیکیتریان کەوتنە لای میرایی کوری عوزیرئاغای سەرووکانی کەئەو کاتە تەمەنی ١٨ ساڵ بوو.

میرا دوای دوو ساڵ پەنای بۆ سالح بەگی برادۆستیو سەمەد بەگی هاروونەیی برد چونکە خاڵو خوارزای یەکتر بوونو هەروەها هاو سنووریش بوون. ئەوە بوو لەهەر سیك لا هیزیکیان کۆکردەوەو پەلاماری بنەماڵەی بارزانییاندا توانییان تا سەر جۆی ریزان سنوورەکەیان لی پاك بکەنەوەو نزیکەی ٣٠-٥٠

کەسیان لی بکوژن، بۆماوەی سێ ساڵ توانییان هەموو ئەو ناوچەیە لەبارزانییەکان پاك بکەنەوە. لەهەمان ماوەدا هێزێك لەعەشیرەتی سوورچی و زیباری و شێروانی و مزووری کۆبوونەوەو هێرشیان بردە سەر گوندی بارزان کەتوانییان گوندەکە بگرن، عەبدولسەلام بارزانی لە ترسان بەرەو ئێران رای کرد، ئێرانیش عەبدولسەلامی تەسلیم بەعوسمانیەکان کردەوە لەو کاتەدا دەولەتی عوسمانی ویلایەتی موسلی بەرێوە دەبرد، ئەم ناوچەیەش سەر بەویلایەتی موسڵ بوو عوسمانیەکان عەبدولسەلامیان لەسالی ١٩١٤ لەسێدارە دا. چونکە ناوبراو لەو ساتەدا کەلێپرسراوی گومرگی پردی نێوان زیبارو بارزان بوو پارەیەکی زۆری لەرێگای باجەوە کۆکردەوە، هەرهەمووی بۆ خۆی برد، لەکاتێکدا دەبو تەسلیم بەوالی برادۆستی بکا. هەروەها قافلەیەکی برادۆستی بەکەمینێك قەتل و عام کردبوو. پاش دروست بوونی دەولەتی عێراقی عەرەبی لێبووردنی گشتی بۆ بارزانییەکان دەرکراو گوندی بارزان ئاوەدان کرایەوەو شێخ ئەحمەد کرا بەسەرۆکی بارزانییەکان، ئەحمەد ئاغای بێرسیاوەی لەسەر خیانەتەکانی خۆی هەر بەردەوام بوو، ئەوەبوو کچەکەی خۆی مەحبوبیدا بەمەلا مستەفا کەخوارزای خۆی بوو، شێخ ئەحمەدیش بۆ دەربرینی سۆزو وەفاداری خۆی بەرامبەر ئەحمەد ئاغا بەنهێنی بەرەشیدی برازای ئەحمەد ئاغای پێی گووت ئەگەر تۆ مامی خۆت بکوژی ئەوا دەتکەم بەسەرۆك عەشیرەتی‌شێروانی. رەشیدیش مامی زەهر خواردوو کردوو لەسالی ١٩٢٣دا کوشت.

هەر لەو ساڵە میراوای عوزیر ئاغا کۆچی دوایی کرد. دوایی ئەمانە قورتاسی مەلا موسا کەئامۆزایی عوزیرئاغا بوو پەیدا بوو دەستی کرد بەدژایەتیکردنی بنەماڵە، بەڵام مەلا مستەفا هەر زوو کەهەستی بەوە کرد خوشکی خۆیدا بەنوری بەگی ریزانی کەئامۆزایی قورتاسی مەلا موسا بوو، دوای ئەوە یەکسەر مەلا مستەفا داوای لەنوری بەگ کرد قورتاس بکوژێ، ئەویش بۆ جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە هیرشی کردە سەر گوندی کەکلەیی و قوتاسیان کوشت، دوای ئەمە بنەماڵە بەتەواوی دەستیان گرت بەسەر شیروانی و مزووری سەرو ژۆریو دۆلەمەریو ناوچەیەکی فراوانی زیبارییەکان.کە تا ئەمرۆ لەریگای ئەو خیانەتو دوژمنکارانەی بنەماڵە توانیوویانە ئەو ناوچانە لەژیر دەستەڵاتی خۆیاندا بهیلنەوە.

## عەشیرەتی هەرکی:

ئەم عەشیرەتە کوردستانی سوریایی لی دەرچێ لەهەموو پارچەکانیتری کوردستاندا هەن. لەکوردستانی تورکیا لەم ناوچانەدا هەن هەکاری، وان، ئەرزەرۆم، ماردین، بنگلو- کەتورکەکان پێ دەلین بینگلو-، لەکوردستانی ئیرانیشدا لەم ناوچانەدا هەن ورمێ، ئازەربایجانی غەربی، لورستان لەکوردستانی عیراقیشدا لەپاریزگاکانیدهۆكو موصلو هەولیرو گوندی قەرەچەتان لەناوچەی سلیمانیدا هەن، هەروەها لەدیالە ژمارەیەکیان دەژین.

ئـەم عەشـیرەتەش وەکـو هـەموو عەشـیرەتە کوردەکـانی‌تر، لەشۆڕش و راپەرینەکانی گەلەکەماندا رۆڵی بەرچاویان هەبووە، لەکوردسـتانی تورکیـا کـاتێك شێـخ سـەعیدی پـیران شۆڕشـی راگەیاند، هەرکیەکان رۆڵی بەرچاویان هەبوو لەپشتگیری‌کردنی شـۆڕش دا، زیـرۆ بـەگی هـەرکی کـە لەتایفـەی سـیدانبوو، لەکوردسـتانی ئیرانـەوە خـۆی گـەیاندە کوردسـتانی تورکیـا بـۆ بەشداری‌کردن لەشۆڕشـدا. شـایانی باسـە عەشـیرەتی هـەرکی لەسێ تایفـە پیك دیـت مـەندان، سـەراتی، سـیدان. هـەروەها حارسـی بـاندوری هـەرکی کـەباپیری ئەحمـەد ئاغـابووە، لەگـەڵ سمکۆ ئاغای شکاك بەشداری شۆڕشی کردوە. ئەم پیاوە رابەری گشـتی هـیزە چـەکدارەکانی شۆڕشـی گرتـە دەسـت، هـەروەها جیهانگیر ئاغای‌کوری حاجی ئاغای هـەرکی لەتایفـەی مـەندان و پـیرۆت ئاغـای سـەعید ئاغـای مـەندان بەشـداری بـەرچاوی ئـەم شۆڕشـەیان کـرد، بەگشـتی هەرکییـەکان لەسـەردەتای شۆڕشی‌سمکۆ ئاغاوە تا کۆتایی رۆڵی بەرچاویان هەبووە. زیرۆ کـوری حـارس لـەکۆماری مەهابادیشـدا رۆڵـی سـەرەکی هـەبووە لەسەرخستنی ئەو تاقی‌کردنەودیـەداو، لەبەر قارەمانیـەتی پلـەی جەنەرالی پێ بەخشرا.

پـاش هەرەسـهینانی شۆڕشـەکەی شـیخ سـەعیدی پـیران و لەسیدارەدانی، شیخ عەبدوڵلا کوری شیخ عەبدول قادر نـەهری کەیەکیك بوو لەرابەرانی شۆڕش بەرەو کوردستانی ئیران وە لای زیـرۆ ئاغـا هـەڵات، تورکـەکانیش دەسـتیان گـرت بەسـەر خاوخیزان و هەموو سەروەتەکەی لەتورکیا، شـایانی باسە شیخ

عەبدالله تاكە سەرۆك عەشیرەت بوو لەو هەشتاو چوار عەشیرەتەی كەتوانی لەدەسەلاَتی توركەكان هەلبێو خۆی نەدا بەدەستەوە. زیرۆ ئاغا بەمەبەستی یارمەتی دانو رزگاركردنی خاو خیزانو كەسو كاری شیخ عەبدالله پەلاماری ناوچەی شەمزینانی كوردستانی توركیا دەداتو هەموویان رزگار دەكاو بەرەو كوردستانی ئیران دەیان هینیت، هەروەها لەو پەلامارەدا ١٢٠ سەربازی توركی كەچوار دانەیان ئەفسەری گەورە بوون بەدیلی گیران، كەدواتر لەكوردستانی ئیران ئازاد كران. ئەمانە هەموو بەلگەی شۆرش گیریو كورد پەروەری ئەو عەشیرەتەیە، كەمن لە ترسی دریژ بری بەوەندە كۆتایی پێ دینم، ئەگەر نا ئەوا ئەو عەشیرەتە نموونەی لەو جۆرەیان ئەوەندە زۆرە كەبەكتیبیكی گەورە نەبێ تەواونابیت.

بەلاَم بارزانییەكان لەریگای ناو ناتۆرو بوختانەكانی خۆیانەوە، ناوی ئەم عەشیرەتەیان زراندووەو ئەو راستیانەیان لەخەلك شاردۆتەوە. بارزانیەكان لەسیەكانی سەدەی رابردووەوە پەلاماری ناوچەی هەركی نشینیەكانیاندا بەمەبەستی كۆنترۆلكردنی. دوای روخانی كۆماری مەهاباد هەركییەكان دەستیاندا نەداو دریژدیان بەشەرەكانیاندا لەگەلّ حكومەتی ئیرانی دا، كەزیرۆ ئاغا سەركردایەتی ئەو شەرانەی دەكرد. پاش ئەوە زیرۆ ئاغا لەسەردەمی پاشایەتیدا گەرایەوە بۆ عیراق، ئەوەبو یەكسەر بۆ ماوەی چوار مانگو دوو سالّ گیراو، پاش ئەوەی چەندین جار لەلایەن كەسو كارەكانیانەوە مەرو

مالآت و پارەو پولیکی زۆریان سەرف کرد بۆ ئازادکردنی بەلآم بێ کەلك بوو، هەتا ئەحمەد ئاغا هاتە لای شیخ مەحمود کە لەناوچەی داری کەلی بوو لەسالی ١٩٥١. شیخ مەحمود بەدوای شیخ قادری برایدا نارد بەمەبەستی دانانی ریگاو شوینی ئازادکردنی زیرۆ ئاغا، شیخ مەحمودنامەیەك بۆ وەصی دەنوسێ‌و دەیداتە دەست شیخ قادری برای‌و، پیی رادەگەیەنێ کەنابێ لەدەسەلآتدارانی حکومەتی عیراقی ب ترسێ، ئەویش وەلآمی دەداتەوەو دەلێ لەکەس نا ترسم، ئەوجار شیخ مەحمود پیی دەلێ برۆ بەوەصی بلێ: مامت دەلێ ئەگەر جیاوازی لەنیوان کورد عەرەبدا نیە بۆچی زیرۆ ئاغا دەگرن، ئەو پیاوە لەکوردستانی ئیران هەرچییەکی کردوە پەیوەندی بەئیوەوە نیە، هەروەها شیخ مەحمود بەشیخ قادر دەلێ: بزانە ئەگەر بەپارەو سامان بەری دەدەن ئەوا چیان دەوێ دەیان دەینێ، ئەگەر نا ئەوە با بزانن من شیخ مەحمودی نە ترسم پێ دەلین، بۆیە لەئاسمانیش بیت لەدەستیان دەردینم. پاشان شیخ مەحمود دەلی دیارە ئەوانە دژی کوردن بۆیە ئەو کارەیان ئەنجام داوە. لەدوای ئەوە ئەحمەد ئاغا لەگەل شیخ قادر دەچنە بەغداو لەئوتیل سمیر امیس دادەبەزن، لەویوە هەوال دەگاتە وەصی عبدالە، ئەویش داوایان دەکا. شیخ عبدالقادر لەگەل مەجید برای زیرۆ ئاغاو لەگەل ئەحمەد ئاغای کوری زیرۆ ئاغا دەچنە لای وەصی، شایانی باسە شیخ مەحمود بەشیخ قادری وتبوو

ئەو دوانە بۆ شاهیدی لەگەڵ حۆیدا بەرێ و، صبی دوای ئەوەی نامەکەی شیخ مەحمود دەخوینیتەوە دەڵێ: دیارە مام تورە بوو.پاشان دەڵێ هیچ پیویستی نەدەکرد مام خۆی تورە بکات، یان ئیوە بنیرێ بەلکو دەبوو خۆی یەکسەر چووبا زیرۆ ئاغای لەزیندان دەرهینابا. دوای ئەوە یەکسەر فەرمانیکی مەلەکی دەرچوو بۆ ئازادکردنی زیرۆ ئاغا. زیرۆ ئاغا لەگەڵ عەشیرەتی هەرکی چوونە ناوچەی بیاو لەنیوان خەلیفان و بارزان. دوای نزیک ١٥رۆژیک دوو ژن کەیەکیان گەنج بوو هاتنە ناو هەرکییەکان و چوونە لای زیرۆ ئاغا، ئەویش پرسیاری لیکردن ئیوە کین و بۆ هاتوون ؟ ئەوانیش وتیان ئیمە هەردووکمان خیزانی ئەسعەد خۆشەوین، ئەم کابرایە دۆستی نزیکی مەلا مستەفا بووو، لەم کاتەدا لەروسیا لەگەڵی دابوو دوای گەرانەوەی بارزانی بوو بەلیپرسراوی هەموو ناوچەی بادینانئەوجا ژنە بەتەمەنەکە وتی ئیمە لەبەر ئەوەی لەگەڵ زیبارییەکاندا ناخۆشیمان هەیەو ئیستا ئەسعەد لیرە نییە، بۆیە پەنامان بۆتان هیناوە تا ئەو ژنە گەنجە لەلای ئیوە ئەمانەت بێ تاکو ئەسعەد دیتەوە، چونکە ئەگەر زیبارییەکان پەلامارمان بدەن ئەوا سومعەی شیخە بارزانییەکان دەرزیت. هەرکیەکانیش وەك عەشیرەتیکی رەسەنی‌کوردی ئەوداوایەیان جی‌بەجیدەکەن. پاش ماوەیەك ژنەکە کەناوی ئاسیا بوو داوا لەزیرۆ ئاغا دەکا بیباتەوە بۆ مالی باوکی لەکوردستانی ئیران، بەلام زیرۆ ئاغا

پێی رادەگەیەنێ کەتا بارزانی لەروسیا نەیەتەوە ناتوانم ریگات بدەم بەهیچ لایەکدا برۆی.بەلام ژنەکە هەر لەسەر ئەو خولیایەی خۆی دەمینێ، بۆیە پاش ماوەیەك بەدرۆ خۆی نەخۆش دەکا، بەمەبەستی ئەوەی بینیرنەوە بۆ مالی باوکی، بەلام دوای ئەوەی دکتۆر دەیبینێ درۆکەی ئاشکرا دەبێ ئەو ریگایەشی لی دەگیرێ. دوای ماوەیەکیتر ژنەکە دەلێ بمبەنە مالی فەتاح ئاغای هەرکی، چونکە کچە پوریکم لەوییە. دوای ئەوەی دەیبەنە ئەوێ لەوێ داوا لەکچە پوردکەی دەکا بیبەنەوە مالی باوکی، فەتاح ئاغاش بەلینی پێ دەدا کە لەبەهاری داهاتوودا داوایەکەی بۆ ئەنجام بدا.ئەوە بوو فەتاح ئاغا لەسالی داهاتوودا کچەکەی تەسلیم بەمالی باوکی کردوە.پاش گەرانەوەی مەلا مستەفائەحمەد ئاغا لەخزمەتی بابیدا زیرۆ ئاغا دەچیتە لای بارزانی ئەویش زۆر بەگەرمی پیشوازیان دەکاو بۆ نانی نیوەرۆ دەعوەتیان دەکا، لەکاتی هەلساندا مەلا مستەفا بەزیرۆ ئاغا دەلێ: با فەتاح ئاغا سەردانی من نەکا، زیرۆ ئاغاش بەمەلا مستەفا دەلێ بۆچی ؟ لەوەلامدا مەلا مستەفا دەلێ: چوونکە ئەو ژنەکەی ئەسعەدی ناردەوە مالی بابی، لەکاتیکدا ئیمە لەگەل عەشیرەتی باوکی ئەو ژنەدا ناخۆشیمان هەیە، بۆیە نەدەبوو فەتاح ئاغا وای لەگەل ئیمەدا کردبا. هەرچەندە زیرۆ ئاغا هەول دەدا بارزانی بروا پێ بینێ بەراستی رووداوەکەو تێی بگەیەنێ کەئەو پیویستە وەکو باوکیك هەلسو کەوت بکا چونکە هەموو

گەلی کورد چاوەڕێی دەستی ئەون و، پێویست ناکا سەرۆك عەشیرەتیکی ناسراو لەخۆی تورەبکا، بەڵام بێ کەلك دەبێ. دوای ئەمە ئەحمەد ئاغا لەگەڵ باوکیدا دەگەڕێتەوە، هەرچەندە زیرۆ ئاغا بەو قسانەی بارزانی زۆر تورە دەبێ بەڵام بەسەر خۆی ناهێنێ. دوای ئەوە دەچنە ئوتێلیك لەئوتێلەکانی بەغدا، لەوێ سەید خان و فەتاح ئاغاومحێ دێنە خزمەت زیرۆ ئاغا تا لەگەڵیاندا بچێت بۆلای بارزانی، هەرچەندە زیرۆ ئاغا بەبیانوی ئەوەی ئەو چۆتە بەخێرهاتنەوەی بارزانی دەویەوێ خۆی لەو داوایە بدزێتەوە بەڵام بێ کەلك دەبێ، چونکە ئەوان زۆر داوای لێ دەکەن کەهەر لەگەڵیان دابێت. بۆیە ناچار زیرۆ ئاغا لەگەڵ ئەحمەد ئاغای کوریدا دەچنە لای مەلا مستەفا، سەرەتا کەدەچنە دیوەخان بارزانی لەوێ نابێ، بۆیە شیخ صادق برازای مەلا مستەفا دوو جار دەچێت داوا لەبارزانی دەکات تا بێت بۆ بەخێرهاتنی میوانەکان بەڵام بارزانی نایەت، لەجاری سێیەمدا دێتە ژورەوەو زۆر بەساردی بەخێرهاتنی میوانەکان دەکا. پاشان دادەنیشێ و پاکەتیکی لۆکس دەردەهێنێ و جگەرەیەك دادەگیرسێنێ، ئەوجار بارزانی سەری خۆی بەرز دەکاتەوەو بەزیرۆ ئاغا دەڵێ: پێم نەوتی بەفەتاح بڵێ هاتوو چۆم نەکات؟ زیرۆ ئاغاش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: پێم نەوتبوو بەڵام ئەوە پێم وت، لەو ڕۆوە هیچ هەرکییەك نابێ لەگەڵ تۆدا بێ. دوای ئەوە فەتاح ئاغا دێتە لای مەلا مستەفاو پێی دەڵێ: پێم نالێی

بارزانی تۆ بۆ لەمن تورەی. ئەویش وەڵامی دەداتەوە: برۆ لەزیرۆ ئاغا بپرسە پێت دەڵێ.دوای ئەمە مەلا مستەفا پشتینەکەی فەتاح ئاغا دەگرێ و بەدیواری دادەدا. لەو کاتەدا محێ لەفەتاح ئاغا تورە دەبێ و پێی دەڵێ: زیرۆ ئاغا مەبەستی ئەوەبوو کەدەی گووت با نەچینە لای مەلا مستەفا، خەتای تۆ بوو دەنا ئیستا بارزانی ئاوای پێ نەدەکردین.دوای ئەوە بڵاوەیان لی کرد، لێرەوە ناخۆشی وکوشتار لەنیوان هەرکی و بارزانییەکان دەستی پێ کرد، ئەمە راستی شەری بنەماڵەیە لەگەڵ عەشیرەتی هەرکیدا، نەك کوردایەتی.بەم جۆرە بارزانییەکان لەبری ئەوەی ببنە پالپشت بۆخەباتی عەشیرەتە کوردپەروەرەکان، بوونە خەنجەری دەستی دوژمنان.

### عەشیرەتی دۆڵەمەڕی

ئەو عەشیرەتە لە ٤٢ گوند پێکهاتووە کەسەر بەقەزای سۆرانن، سنووری دراوسیکانیان هۆزی براۆست و هۆزی شێراوانی و گوندی هەودیانە، کەنیوەی دانیشتوانییان ئاسوورییە. ئەم عەشیرەتانە بەگشتی لەناوخۆیاندا بەئارامی و بەبێ کیشە دەژیان وە هیچ ناکۆکییەك لەنیوانیاندا نەبوو. دوای ئەوەی تەریقەی ئایینی لەنیوانیاندا بڵاو بۆوە، شیخ عەبدولسەلام بارزانی یەکەم لەم ریگایەوە دەسەڵاتێکی ئاینی گەورەی بەدەست هینا. کاتێك عەبدولسەلام بارزانی دووەم کەبەعەبدولسەلام کویرە ناسرابوو پەیدا بوو، لەریگای چەکەوە بەتەواوەتی دەسەڵاتی بەسەر

بەرۆژییەکان و شیروانییەکان و مزوورییەکاندا گرت، ئەوجار دەستی کرد بەپیلان دانان بۆ ئەوەی دەست بەسەر دۆلەمەرییەکاندا بگریت، ئەوەبوو لەشکریکی گەورەی کۆکردەوەو هیرشی کردە سەریان، شەر بۆماوەی حەوت رۆژ بەردەوام بوو بێ ئەوەی هیچ لایەك سەر بکەوێ. دوای ئەوە عەبدولسەلام پەنای بردە بەر مەلاو ریش سپی ناوچەکەو، بەکۆمەڵ هەموویانی ناردە سەر رەسول ئاغاکە سەرۆکی دۆلەمەرییەکان بوو. کە لەدواجاردا توانییان باوەری پێ بینن تا لەگەڵ عەبدولسەلامدا ئاشت ببیتەوە.

دوای ئەوەی پییان راگەیاند کەعەبدولسەلام دان بەهەلەی خوێدا دەنی و پەشیمانە لەو کارەی و، دریژەدانی شەریش زیانی زۆر بەناوچەکە دەگەیەنێ. دوای ئەوە رەسول ئاغا رەزامەندی دەربری بۆ ئاشتی، هەموو مەلاو ریش سپییەکانی کۆکردەوەو پیی راگەیاندن کەئاشتی لەنیوان دۆلەهەری وبنەمالەدا راگەیندراوە، لەو ریککەوتنەدا تەنها دوو ریش سپی دۆلەمەرییەکان ئامادە نەبوون چونکە بەگومان بوون لەشیخ عەبدولسەلام و بارزانییەکان. ماوەیەك ئاشتی و هاتووچۆ لەنیوان ئەو دوو لایەنە بەردەوام بوو، عەبدولسەلام توانی لەو ریگایەوە دۆلەمەرییەکان و رەسول ئاغا دلنیا بکا لەخۆی و بارزانییەکان. تا رۆژیك شیخ عەبدولسەلام بەناوی میوانی دەچیتە ناو دۆلەمەرییەکان، لەپرا دەست دەکا بەچەککردنیان، رەسول ئاغا دەگریّ و لەبەرچاووی کورە گەورەکەی ئەسعد ئاغا کەئەو کاتە تەمەنی حەوت سالانە بوو لەسیدارەی دەداو دەیکوژێ. ئەوجا

عەبدولسەلام هێرش دەباتە سەر عەبدولرەحمان ئاغا کەبرایی رەسول ئاغایە لەگوندە شیروکەیی، پاش ئەوەی بەبریندار دەیگرێ ئەویش دەکوژێ. پاش ماوەیەکی دورو درێژ بارزانییەکان توانییان بەشی زۆری دۆلەمەرییەکان بۆلای خۆیان رابکیشن و شەری دۆست و دوژمنیان پێ بکەن، تەنها ئەسعد ئاغای شیتنە نەبێ کەچۆکی بۆ دانەدان.

هەرچەندە چەند جار بارزانییەکان هەولی تیرۆرکردنیان دا. ئەوەبوو لەسالی ۱۹۳۳ مەلا مستەفا بۆسەیەکی بۆ دانا بەلام بەرنەکەوت و رزگاری بوو.تا بنەمالە ناچاریان کرد پەنا بەریتە بەر حکومەت، ئەمەش گەورەترین سەرکەوتن بوو بۆ مەلا مستەفا. چونکە مەلا مستەفا لەو ریگایەوە توانی زیاتر بەناوی کوردایەتییەوە دۆلەمەرییەکان تەفرە بدات، بۆ نموونە کوری عەبدولرەحمان کەناوی میری شیروکەیی یە بوو بەپاسەوانی تایبەتی مەلا مستەفا تا لەشەڕێکدا کوژرا، کوڕێکی ئێستا سەرلەشکری مەسعود بارزانییە.

ئەم بنەمالەیە بەپێی بەرژەوندییەکانی خۆیان لەگەل دۆلەمەرییەکاندا جوولاونەتەوە، بۆ نموونە لەسالی ۱۹٦۱دا شیخ ئەحمەد بارزانی هانا بۆ ئەسعەد ئاغای شیتنە دەبات، ئەویش شەش مانگ بەمال و منالەوە دەیان ژێنێ. دۆلەمەرییەکان لەراپەرینی سالی ۱۹۹۱دا بەشداری بەرچاویان بینی.بۆیە کاتیك مەسعود بارزانی دیتەوە کوردستانی ئازاد، پیلانی سەرەتای ئەوە بوو کەئالای ئاشتی لەسەرانسەری کوردستاندا لەنیوان هەموو کورددا جیگیر بکا، بۆیە جەنابی

عیزەت بەگ دەرگەلەیی دەچیتە لای سەعید ئاغاو پێی ڕادەگەیەنێ کەکاک مەسعود دەیەویت سەردانت بکات، لەوەلامدا ئەویش خۆش حالی خۆی نیشان دەدات. کاتیک مەسعود بارزانی دەگاتە نزیک گوندی سارداو داوا لەهەموو ئەو سۆرانییانە دەکات کە لەگەلی دان بگەرینەوە، چونکە ئەو گەیشتووە بەشوینیکی ئەمین. کاتیک مەسعود دەگاتە دیوەخانەکە ڕوودەکاتە سەعید ئاغاو لەبەرچاوی هەموو ئامادەبووان دەلیت: گەلی میللەتی بارزان، ئەز پەشیوانم لەهەموو غەلەتی بابی من مەلا مستەفا لەگەلْ ئەسعەد ئاغای شیتنە، سەعید ئاغا دەلێ: کەرەم کەئەزبەنی فەرموو دانیشە. ئەمە یەکەم جار بوو ئاشتی لەنیوان بنەمالەو دۆلەمەرییەکان دوای ئەم هەموو شەرو شۆرە بەردەوام بیت. مەسعود بارزانی ماوەی چوار مانگ و بیست ڕۆژ میوانی سەعید ئاغا بوو، لەو ماوەیەدا مەسعود ٥٠٠ کەسی لەگەلْ بوو وە ڕۆژانە زیاتر لە١٠٠کەس سەردانیان دەکرد.

خوینەری بەریز ئەم کردەوەیە یەکیکە لەرەوشتە باوەکانی بنەمالەی بارزانی، مەبەستم ئەوەیە هەر کاتێ ئەمانە میوان داری کەسیکیان کرد یان بەمیوانی چوونە لای ئەوە بزانە لەپشتەوە خەنجەری لی دەوەشینن. لەدوای ٣١ی ئابی ١٩٩٦ بەهەفتەیەک نیچیر بارزانی نووسراویك ئاراستەی سەعید ئاغا دەکات داوای لی دەکات کەبیتە قەزای سۆران بۆ ئەوەی چاووی بەمەسعود بکەوێ، هەروەها نیوەرۆ دەعوەتی مەسعود ببیت. ئەویش لەگەلْ کورەکەی محەمەدعەلی بەدەم بانگکردنەکە دەچیت، بەلام بنەمالەی بارزانی وەکو عادەتی خۆیان دەست بەسەریان دەکەن و تا ئەمرۆ بێ سەرو شوینن.

## رۆشنكردنەوەی لایەنە شاردراوەكان

خوێنەری بەڕێز من بەهۆی ئەوەوە ماوەیەكی دووروودرێژ لەگەڵ ئەو بنە ماڵەیەدا ژیاومو پەیوەندی توندوو تولم هەبووە لەگەڵ گەورەو بچوكو ژنو پیاوو گەنج وپیرو دوست ودوژمن یاندا پەیوەندیم هەبووە، توانیومە زانیاریەكی تەواو بەدەست بێنم دەربارەی سەر هەڵدان وپەیدابوونی ئەم بنە ماڵەیە لەكوردستاندا.هەمووشمان دەزانین كەئەم بنە ماڵیە رۆڵێكی گەورەو بەرچاویان هەبووە لەهەموو ئەو رووداوانەی كەپەیوەندییان هەبووە ژیان ومێژووی كوردەوە.من داوا كاریم لەپەروەردگار ئەوەیە یارمەتیم بدات تا شان بەشانی گەلی كورد ئەم بنەماڵەیە لەكوردستان بەدەر نێین و ئاسەواریان نەهێلین. با ئەوەش بزانن و لایان روون بی كەئەوان دەبی لەبەر دەم دادگای گەلدا بوەستن لەسەر هەر دیتارێك كەدزیویانە، لەسەر هەر منداڵێك كەهەتیویان كردووە یان كوشتوویانە، لەسەر هەر ماڵێك ویرانیان كردووە لەسەر هەر هاوڵاتیەكی شۆرش گێر كەبەناوی كوردایەتیەوە كردویانە بەقوربانی بەر ژەوەندیەكانی خۆیان.

## بنەچەی بنەماڵەی بارزانیەکان

سەدوپەنجا سالیك بەر لەئیستا کابرایەکی نەناسراوی قژنەی چلکنو، ك مشکی راکردوو لەبیابانی عەرەبەوە بەعگال ودزداشەوە لەسنووری سوریاوەو بەنیو خیلی شەممەرەوە پیی نایە خاکی کوردستان و لەنیو ئیزیدییەکاندا جیگیر بوو، جلوبەرگی ئەوانی لەبەر کردو چووە سەر ئاینی ئەوان. ئەم کابرا نەناسراوە باپیرەگەورەی مەلامستەفای بارزانی بوو.

لەوماوەیەدا کە لەناو ئیزیدیەکاندا مایەوە، هەولی زوریدا کەبەلای خوی راینبکیشی و بیانهینیتە ژیر دەسەلاتی خویەوە، بەلام بی کەلك بوو. چونکە ئیزیدیەکان لەو زیرەکتر بوون کەیەکیکی وا بتوانی کاریگەرییان لەسەر دابنیت و، لەسەر ریبازی ئاینی و نەتەوەیی باو باپیرانیان لایان بات. لەبەر ئەوە ئەم کابرایە ناچار بوو ئەو ناوچەیە بەجی بهیلی رووبکاتە ناوچەی زیبارییەکان.

دەلین ئەم کابرا عەرەبە لەناو زیباریەکاندا فیری کوردی بووە هەندیکیشیان دەلین نەخیر ئەم کابرایە خوی ئیزیدی بووە، من هەندی پیاوی بەسالاداچووی ئەوانم بینیوە دەیانگوت: ئەم بنەمالەیە ئیزیدین وتا ئیستاش هەندی مولکیان لەناو ئیزیدیەکاندا ماوە، کەماوەیەکی زور بەر لەئیستا لەژیر دەستیاندا بووە. بەلام ئەمە لەراست ناچی، چونکە هەرچەندە بارزانیەکان وەك ئیزیدیەکان جامانەکانیان دەبستن و لەهەندی

هەلسوکەوتیان بەئیزیدیەکان دەچن، بەلام لەراستیدا زور لەئیزیدیەکان جیاوازن. ئیزیدیەکان بەگشتی مروڤ دوست وخاوەن پیاوەتین، بەپیچەوانەی بارزانیەکان کەئەم سیفەتانەیان تیدا نیە.

هەرکام لەئیمە، من وتو ئەی ئەوکەسەی ئەونوسینەی من دەخوینیەوە، ئیمە هەمومان بنەچەمان هەیەو باپیرانی خۆمانمان هەیەودەتوانین چەندپشتیك بژمیرین،بەلام مەلا مستەفای بارزانی ئەوسەرۆکە ئەفسانەیەی کورد کەماوەیەك دەسەلاتی بەسەر هەرچوار بەشەکەی کوردستاندا هەبوو، نەك هەر ئەوە بەلکو دەستی دەگەیشتە دورترین شوین لەجیهاندا، بەهۆی ئەوپارەو دەسەلاتەی کەهەیبو، دەبوا لانی کەم دە پشتی خۆی هە لدایە وناوی بهینابان، کەچی لەدوو تا سی پشتی خۆی زیاتر کەسی نەدەناسی.

من لیرەدا مەبەستم ئەوە نیە خوانەخواستە توانج بگرمە هیچ خیلو هۆزو بنەمالەیەك بەلام دەمەوی ئەوە بخەمە رو کەهەندی بنەمالە لاڤ هەندی شت لیدەدەن و لەراستیدا وانین.من لیرەدا توانج ناگرمە بارزانی کە لەدورگەی عەردبەوە هاتون، بەبنەچە عەرە بن تەنیا ئەوەم بەلاوە ناپەسندە کەخۆی بە کوردیکی رەسەن دادەنیو، ئەم هەموو دوژمنایەتیەشی لەگەل کورددا کردووە . بیلالی حەبەشی کەکەس نەیدەزانی خەلکی کوییەو لەکویوە هاتووە، ئەوەندە مرۆڤیکی پاك ولەخواترس بووە.پیغەمبەر ( د.خ ) دەربارەی گوتوویەتی،کە بەهەشت جیگایەتی.

کەواتە ئەی بارزانی، تۆ کە بەرەگەز عەرەبی، چۆن هەستی نەتەوایەتی ریگای ئەوەی لی نەگرتی کەسەردانی ولاتی جولەکەکان بکەیت و، کار بکەیت بۆ بەرژەوەندی ئەوان ؟ لەکاتیکدا دەزانی جولەکە دوژمنی عەرەبە.

پیشتر ئەوەم بۆخوینەری خۆشەویست باسکرد کەبارزانی هەموو کاتیك هەولی داوە بۆئەوەی کۆسپ و ریگر لەبەردەم میللەتی کورددا دابنی تا بەئامانجەکانی خۆی نەگات . بەگشتی بنەمالەی بارزانی بەردەوام لەدژی بەرژەوەندی کورددا بوون .

هەرکاتیکیش شۆرش لەبەرژوەندییاندا نەبوایە پشتیان تیدەکرد . من داواتان لیدەکەم کەئیتر دەست لەئیخەی ئەم میللەتە بەربدەن ولەکۆلی ببنەوە . لیرەدا من بەردە لەسەر هەندی لایەنی شاراوەی ئە وبنەماله یه لادەدەم.

بنەچەی بنەمالەی بارزانی بەم شیوەیە هاتونەتە خوارەوە:

وەك لەسەرەوە باسمانکرد باپیرەگەورەیان ئەو کابرا نەناسراوە عە رەبە بوو کەلەبیابانی عەرەبستانەوە هاتبوو، ئەم کابرایە لەناو ئیزیدیەکاندا کوریکی بووە ناوی عبد الله بووە ، ئەمیش کوریکی بووە ناوی عبد السلامی یەکەم بووە،ئەمیش کوریکی بووە ناوی شیخ محەمەد بوو، ئەویش پاش خۆی کوریکی بەناوی شیخ عەبدولسەلامی دووەم جیهیشت . ئەمیش پینج کوری جیهیشت بەناوی شیخ ئەحمەد، شیخ بابۆ، مەلاجوج، مەلا مستەفا، محەمەد صدیق، ئەمانە بەهۆی ئەوەوە زمانی عەرەبییان زانیوە _کەزمانی قورئانە _ولەئاین وشەرع شارەزا بوون، توانییان کاریگەریی خۆیان بەسەر جوتیارە

سادەكاندا بسەپێنن . لەهەمان ڕێگاوە ناوبانگیان بلاو بۆوە، لەم ڕێگایەوە دەرگای خێریان لێكرایەوەی دەسەلاتیان فراوان بوو.جیا لەهەمو ئەمانە دەستیانكرد بەكۆكردنەوەی زەویوزارو مولك وسامان بۆ ئەوەی داهاتوی خۆیان مسۆگەر بكەن .عبداللەی نەوەی باپیرە گەورەی نەناسراو، مرۆڤێكی سادەی ساویلكە بووە. عەبدولسەلامی كوری ئەویش هەر مرۆڤێكی گۆشەگی ربووەو تیكەل بەخەلك نەبووە، بەلام شیخ محەمەدی كوری عەبدولسەلامی یەكەم پیاویكی كارامەو لیزان ودنیادیدە بووە. ئەمیش كوریكی بوو ناوی شیخ محەمەدبوو، شیخ محەمەدكوریكی پاش خوی بەجیهیشتووە ناوی ناوی شیخ عبد السلامی دووەم. ئەمەشیان پینج كوری بووە كەبریتین لەمانە/ یەكەم شیخ احمد، دووهەم /شیخ بابو، سی هەم /مەلا جوح، چوارەم / مەلا مستەفا، پینجەم /محەمەدصدیق، ئەمانە بەهوی ئەوەوە كەزمانی عەرەبیان زانیوە كەزمانی قورئانە وشارەزا بوون لەكاروباری ئاینیو شەرعیدا لەناو جوتیاری ساویلكەی ناو هوزەكانی دەوروبەرو ناو بانگیان پەیدا كردووە دەرگای خیروو بەرەكەتیان لی كراوەتەوە دەسەلاتیكە گەوریان پەیدا كردووە، كابرای نەناسراوی بی ناوی باپیرە گەوریان دەستیكی باشی هەبووە لەكوكردنەوەی.

پارەو كرینی زەوی زاردا. عبد اللەی كوریشی مروڤیكی ساویلكە بوو هیچ ئاگای لەجیهانی دەورو بەری خوی نەبووە. عبد السلام ی كوری ئەویش هەر مروڤیكی گوشە گیر بووەو تیكەل بەخەلك نەبووە، بەلام شیخ محمدی كوری عبد السلامی

یەکەم پیاویکی کارامەو لیزان دنیادیدە بووەو توانیویەتی بەناوی پەیرەوکردنی ریبازی نەقشبەندییەوە توانیویەتی خەلکیکی زور لەخوی کوبکاتەوەو نازناوی شیخیەتی بەبدەست بهینی بو خویو ئەوانەی دوای خویشی، وبەم هویەوە دەسەلاتی خوی بەسەر ناوچەکەدا سەپاندو هەموو عەشیرەتو هوزو تیرەکانی دەوروپشتی ملکەچی خو کرد. ئەم شیخ محمەدە لەناو خەلکدا بەپیاویکی ئاینی گەورەو سەیر .ئەکراو ناز ناوی جی نیشتنی شیخ رەزای نەهری یان لینا بوو. پاش مردنی شیخ محمد، شیخ عبد السلامی دووهەمی کوری، بەهوی بەکار هینانی هیزوو ئەو پارەو مالنگەوە کە لەو باوکەیەوەبوی بەجی مابوو، هەروەها بەهوی خستنەوەی دووبەرگی ونـاکوکی لەنیوان هوزەکانی دەوروبەریدا، توانی دەسەلاتی خوی بسەپینی بەسەر چوار عەشیرەتو هوزی دراو سیدا، هەر لەعەشیرەتی بەروژ وەتا ئەگاتە مزوری ژووروو شیروانی وپاشان دولەمەری، بەبی ئەوەی گوبداتە شتیك لەو کارانەی کەشیخ عبد السلامی دووهەم ئەنجامیدا لەپیناو زیاترکردنی دەسەلاتو بەرفراوانکردنی ناوچەی نشتەجیی بارزانی یەکانو زورکردنی دەسو پیوند بو خویان کەباشتر کورو کورشە زاکانی لەسەری بەردوام بوون تا ئەمرو، بەکار هینانی جامانەی سورد کەبەزور سەپینرا بەسەر هەموو ئەندامانی ئەو چوار عەشیرەتەی کە لەسەرەوە ناومان هینان ئەمانە پیشتر جامانەی سوریان نابەست بەسەرەوەتا رادەیەك ئیستا جامانەی سور بوو بەدروشمی بارزانی یەکان، ئەوا شارەزای ناوچەکە نەبیت لای

وایە هەر کەس جامەنەی سووری بەسەرەوە بیت بارزانی نی یە، تەنانەت هەندی لەسورانی یە سەختەچی یەکان جامانەی سوور بەکار دینن بو ئەوەی خویان وا پیشان بدەین کەدلسوزی بنەمالەی بارزانین یا بو ئەوەی لەخەلەکانی تەفتیشدا داوای ناسنامەیان لی نەکەن، یا کاریکیان دەبی لەفەرمانگەیەکی حکومیدا زوو بۆیان جی‌بە جی بکەن. ئەم کارەشیان بووە بەهوی رق وتوورەیی و بیزاری لەناو خەلکدا، هاوار بو ئەو روژە رەشەی چاوەرییان دەکات.لەگەل ئەمەشدا هەندیك لەئەندمانی ئەو چوار عەشیرەتەو ریبازیەکان ملکەچی ئەم بریارە نەبوون و بەشیکی زوریان پەنایان بردە بەردەسەلاتی ناوەندی حکومەت ئەمانەش کەوپەنایان بردەوتە بەر حکومەتی وەنەبی لەبەر ئەوە بی کەهەستی نەتەوایەیتیان تیا نی یە، نەخیر ئەمانە بەناچاری ریگایەیان گرتووتە بەر بو ئەوەی خویان و خیزانەکانیان بپاریزن لەبارزانی یەکان..

لەگەل ئەم حالتەشدا گەلیك لەئەنداماني ئەم عەشیرەتە پەیوەندییانی کرد بەشورشەوەو بوون بەپیشمەرگە. بەلام سورچی یەکان تووشی گەلیك ئازار بوون بەدەست ئەم بنە مالەویەوەو کەخوشیان هاویشتە باوەشی حکومەتەوە هەر لەبەر ئەوە بوو لەدەست سوکایەتی پیکردنی بارزانی یەکان رزگاریان ببی، کاتیکیش هەلیان بو هەلکەوت گەرانەوە بوونا و ریزەکانی شورش. هەرچەندە کاتیکیش لەناو رژیمدا بوون بەنهینی کومەکی هیزی پیشمەرگەیان کردووە، بەپیچەوانەی قسەی مسعود بارزانی کەدەلی: سور چیەکان هەربو ئەوە

دروست کراون لەدژی شۆرش چەك هەڵگرن. بەلام هەر سورچییەکان بوون لەراپەرینی ١٩٩١دا هەموو ناوچەکانی خویان لەرژیمی بەعس پاك کردەوە، پاشان بو ئازادکردنی ناو چەکانیتر بەری کەوت بەتایبەتی بو شاری کەرکوك. بویە شەش روژ دوای راپەرین تەرمی شەش شەهیدی سورچی گەیشتەوە ناو چەکانی خویان. ئەم شەهیدانە لە رزگارکردنی شاری کەرکوکدا گیانی خویان بەخشی، ئەوە لەکاتیکدا بوو کەهیشتا مسعود بارزانی بنە مالکەی نەگەیشتبوونە ناوچەی کوردستان.

پاش مردنی عبد السلامی دووهەم، مەلا عبد الرحمن کەکورزای شیخ عبد السلامی یەکەم بوو جلەوی شیخایەتی گرتە دەست ئەمەش بوو بەهوی پەیدابوونی رق و کینە لای کورکانی شیخ عبد السلامی دووهەم چونکە ئەمانە خویان بەشایستەتر ئەزانی بو ئەوەی شیخایە تیی بگرنە دەست، لەبەر ئەوە ئەمانە دەسەلاتی ئایینی و دنیاییشان لەکیس چوو، مەلا ومحەمەدصدیقی برای لەمانگی ئەیلولی سالی ١٩٢٧دا لەنزیك هاوینە هەواری چیای شیرین مەلا عبد الرحمانیان کوشت، پاش ئەم رووداوە دەسەلاتی ئایینی کەوتە دەست شیخ ئەحمەدو دەسەلاتی دنیایش کەوتە لای مەلا مستەفا.

لیردا جی خویەتی خوینەری بەریز وەکو من سەر سام بیت بەرامبەر بەگورانەکانی ئەم دنیایەو، بپرسی چون کابرایەکی نەناسراوی کول بەپشت توانی ببیتە خاوەنی عەشیرەتکی گەوروە خاوەن گەورەترین سامان و سەر مایە لەناوچەکەدا.

لەسالەكانی ١٩٣١ =١٩٣٢دا باری گوزرانی ناوچەكە زور خراب بوو بەشێوەیەك خەلكی لەبرسانا دەمردن و هەموو توانای هێزی خویان بو دابینكردنی گوزەرانی روژانەی خویان، بارزانی ئەو باروو دوخەی بەهەل زانی بوسەپاندنی دەسەلاتی خوی و ناو بانگ دەركردنی، هەر بویە لەو ماوەیەدا بەر نگاری حكومەتی عیراقی بووە.

پاش ئەوەش كەحزبی هیوا دامەزراو بەسەدان كەس لەروشنبیروو نیشتمانپەروەران چونە ناو ئەو حزبە، لیپرسراونی ئەو حزبەش بریاریاندا خویان لەمەلا مستەفا نزیك بكەنەوە و بزووتنەوەكەی وەك وەرەقەیەكی زەخت بو سەر رژیم بەكار بینن ئەمەش لەمانگی تەمووزی سالی ١٩٤٣ دا. لەمانگی تشرینی یەكەمی هەمان سالدا مەلا مصتفی توانی دەست بگری بەسەر ناوچەی بارزاندا هەموو هێزەكانی حكومەت لەو ناوچانە بەدەر بنی. ئەمەش بوو بەهوی ئەوەی ژمارەیەك لەئەفسەرە كوردەكانی ناو سوپای عیراقی كەسەر بەحزبی هیوا بوون پەیوەندی بەمەلا مستە فا وە بكەن، كە لەدوا جاردا بوو بەهوی ناودەركردنی بارزانی.

*تیبینی /*

لەسەردەمی عبد الكریم قاسم دا، كوبوونەوەیەك لەنیوان سەروك عبد الكریم و مەلا مستەفاو احمد زیباری لەوەزارەتی بەرگری لەبەغدا دەبەستری، ئەمەش بەمەبەستی ئاشتكردنەوەی بنە مالەی بارزانی و زیباریەكان كە تاكە عەشیرەت بوون تائیستا

ملیان نەداوە بو بارزانیەکان، هەر لەبەر ئەمە چوونە پال حکومەت واتە ئیستا لەوی. لەو کوبوونەوە احمد زیباری بەعبد الکریم قاسم دەلی: ئەگەر مەلا مستەفا راست دەکا و دەلی خاوەن عەشیرەتیکی دیرینم با پینج پشتی خوی بلی، جەنابی سەروك ئەم عەشیرەتە بی بن چینەن. من دەتوانم ناوی دوانزە پشتی خومت بوبلیم. دوای ئەوە مەلا مستەفا تورە دەبیت و کوبوونەوەکە جی دیلیت.

# بۆ بەڕێز کۆفی ئەنان سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان

## نامەیەك دەربارەی

## -ڕووداوی تەقاندنەوەی بەنزینخانەی شەقڵاوە لە١٩٩٥/٥/٧ دا

ئەم ڕووداوە کەبوو بەهۆی کوشتن و برینداركردنی زیاتر لە٢٢ كەس لەهاوڵاتییان كە لەنێوانیاندا دوو كارمەندی نەتەوە یەكگرتووەكانی تێدا بوو، ئەلقەیەكی ترە لەزنجیرەی كارە تیرۆریستییەكانی دژ بەگەل لەلایەن بنەماڵەی بارزانییەوە، ئەمەش لەسەر فەرمانی دەوڵەتەكانی دەوروبەر، مەبەستی سەرەكیش لەم تەقاندنەوەدا كوشتنی دوو كەس لەكارمەندەكانی ڕێكخراوەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان بوو.

پێش ڕوودانی ئەو كارەساتە بەچەند ڕۆژێك لەهاوینەهەواری سەلاح الدین كۆبوونەوەیەك سازكرا، كەسودادی كوڕی مەلا مستەفا و كەریم سنجاری لێپرسراوی دەزگای تیرۆریستی پاراستن سەرپەرشتییان دەكرد، حسەینی حەمەسوور ئاغای میراو دەڵی بانگ كرا بوو بۆ ئەو كۆبوونەوەیە. سەرەتای كۆبوونەوەكە ، سودادی كوڕە مەلا مستەفا دەستی بەقسەكردن كردو بەحسەینی حەمە سور ئاغای گوت: حكومەتی ئێران یارمەتی ئیمەی داوە لەگرتن و كوشتنی حەسەن كویستانی داو ئیستاش هەر بەردەوام یارمەتیمان دەداو پشتگیریمان دەكا، لەبەر ئەوە لەسەر ئیمە پێویستە هاوكاری ئێران بكەین و پاداشتی چاكەكانی بدەینەوە، حكومەتی جمهوری ئیسلامی داوای لەئیمە كردووە دوو كارمەندی ڕێكخراوەكانی سەر

بەنەتەوە یەکگگرتوەکانیان بۆ بکوژین کەهەردوکیان جولەکەن، ئیمەش ئەم کۆبوونەوەیەمان کردووەو تۆشمان بانگ کردووە بۆ ئەوەی بەیەکەوە لەم مەسەلەیە بکۆلینەوەو پلانیك دابنیین بۆ جیبەجیکردنی ئەم کارە.

بەم شیوەیە سوداد بارزانی مەسەلەکەی باسکرد بۆ پیاوی دلسۆزی بنەمالەکەیان حسەینی حەمەسوور ئاغای میراودەلی کەچەندەها پەیوەندی گومان لیکراوی هەیە لەگەڵ هەردوو حکومەتی عیراق و ئیراندا، ناوبراو ئامادەیی تەواوی خۆی پیشاندا بۆ جیبەجیکردنی تاوانەکە. هەرە لەو کۆبوونەوەیەدا بەنزینخانەیەکی نزیك شەقلاوەیان دەستنیشان کرد بۆ شەوی جیبەجیکردنی تاوانەکەیان، یەکەم جار خاوەنی بەنزینخانەکەیان دەستگیرکردو بەنزینخانەکەیان دایە دەستی یەکیکی تر کە بەکریگیراوی پاراستن بوو. ئەمیش بریك تی.ئین.تی خستە ناو یەکیك لەعەمباری بەنزینەکانەوەو خۆی ئامادەکرد بۆ ئەو کاتەی تاوانەکە جیبەجێ ئەکرێ. پاشان ریککەوتن لەسەر چۆنیەتی جیبەجیکردنی تاوانەکە بەم شیوەیەی خوارەوە:

کاتێ ئەو دوو کارمەندەی جولەکەیە ئەکەونە رێ بەرەو شەقلاوە لەئۆتۆمبیلەکەی خۆیاندا کە لەجۆری کرۆلای یابانییە، پاراستن بەهۆی بێ تەلەوە حسەینی حەمەسور ئاگادار دەکاتەوە ئەویش ئامادە دەبێ هەر کات سەیارەی کارمەندە جولەکەکان بگاتە بەنزین خانەکە بیتەقینیتەوە .

دوای کۆتایی هاتنی کۆبوونەوەکە حسەینی حەمەسوور شوێنی کۆبوونەوەکە بەجێ دێڵێ و بەرەو شەقڵاوە دەکەوێتە ڕێ. کەدەگاتە ئەوێ، یەکێک لەپیاوەکانی را ئەسپێرێ کەناوی تەحسەین خەرواتانییە لەتەپۆلکەیەکی بەرامبەر بەنزینخانەکەدا خۆی جێگیر بکات لەلای ڕۆژ هەڵاتەوە، هەروا ئامێرێکی کۆنترۆلی دایە دەست لەوانەی کە لەدوورەوە کاریان پێ ئەکرێ بۆ تەقاندنەوە. ئەوەشی تێگەیاند کەدەبێ زۆر لەئامادەباشیدا بێ بۆ چاودێریکردنی بەنزینخانەکە بەدووربین و ئامێرە بێتەلەکەشی هەلگرێ بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی کاتی بەرێککەوتنی سەیارەی کارمەندەکان لەکەریم سنجارییەوە.

لە ۱۹۹٥/۱۲/۷ کە ڕۆژی ڕوودانی کارەساتەکەیە، تەحسەین خرواتانی بەهۆی بێتەلەوە ئاگادار ئەکرێتەوە کەوا ئۆتومبیلەکیە ئەگاتە ئەوێ و خەریکی وەرگرتنی بەنزین دەبێ دەست ئەنێ بەدوگمەی ئامێرەکەدا و بەنزینخانەکە ئەتەقێتەوە و ئەنجامەکەشی کوژران و بریندار بوونی بیست و دوو کەس بوو لەنێویاندا دوو کارمەندەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لەستافی پۆلیسدا کاریان دەکرد.

پاش تەقینەوەکە هێزی پۆلیس و ئاسایش دەگەنە شوێنی ڕووداوەکە بۆ لێکۆڵینەوە. ژمارەیەکی زۆر خەلکیان گرت لەوانەی لەوێ بوون کە لەنێویاندا یەکێک لەپیاوەکانی حسەینی حەمەسوور لەناو گیراوەکاندا بوو کەبەشداری کردبوو لەجێبەجێکردنی تاوانەکەدا کەناوی مەحمود... بوو، دوای کەمێک لێکۆڵینەوە لەگەڵ مەحموددا ،ئەو ئەروخێ و دان ئەنێ

بەوەدا کەدەستی هەبوە لەجیبەجیکردنی تاوانەکەداو دەلێ: من بەشداریم کردووە لەو کارەدا لەسەر ئەمری حسەین حمەسور ئەویش فەرمانی جیبەجیکردنی کارەکەی لەسداد بارزانییەوە وەرگرتووە لەگەڵ کەریم سنجاریدا.

ئەم دەنگوباسە بڵاو بۆدوە لەناو خەلکدا، لەبەر ئەوە کەریم سنجاری بۆ پەردەپۆشکردنی تاوانەکە فەرمان ئەدا بەگرتنی هەموو ئەوانەی کەتاوانەکەیان جیبەجکردووە و رەوانەی بەندیخانەی ئاکرییان دەکا، ئەو گیراوانەش بریتی بوون لە۱- حسەین حەمەسور ئاغا، ۲- عەلی ئاغا، ۳-مستەفا ئاغا ، ٤- فەرهەنگ هیرانی ، ٥-عومەر گرکۆو براکانی، ٦-تەحسەین خرواتانی، ، ۷- مەحمود..... .

لەلیکۆلینەوەکەدا ئەوەش دەرکەوتووە کەتەحسەین پیشتر دوکتوریکی ئیرانی سەر بەپارتی دیموکراتی ئیرانی کوشتووە لەئۆردوگای هەریر، کاتێ خۆی وا بڵاو بوو لەناو خەلکدا کەئەم دوکتورە بەکریگیراوی اطلاعاتی ئیرانە، هەروەها دەرکەوت کەمەحمود پیاوی ئیرانەو یەکیکە لەپیاوکوژەکانی سەر بەاطلاعاتە.

بەم شیوەیە بنەمالەی بارزانی خۆیان دزییەوە لەو تاوانەو خستیانە ئەستۆی کەسانیکیترو هەموویان رەوانەی بەندیخانە کران . ئەم گیراوانە لەبەر ئەوەی سەر بەعەشیرەتیکی گەورەو بەهیزن ناتوانرێ لەسیدارە بدرینو بەرەلاکردنیشیان ئەبیتە مەترسییەك بۆ سەر ئاسایشی ئەندامانی بنەمالە.

لەکاتی خۆیدا دەنگوباس بڵاو بۆوە دەربارەی ئەوەی کەگۆیا ئەم تەقاندنەوەیە بەفەرمانی قوصەی کوری سەدام حسەین ئەنجام دراوە . بەهەرحاڵ ئەم تاوانە بەلگەیەکیترە لەسەر درندایەتیو هەلویستی نامرۆڤانەی ئەم بنەمالەیە دەربارەی کەسانیك کەهاتوونەتە ئەم ولاتە بۆ خزمەتکردنی میللەتەکەی، لەهەمان کاتیشدا بەلگەیە لەسەر وابەستەییو پاشکۆیەتی بنەمالە بۆ دوژمنانی میللەتی کورد.

**دلسۆزتان : رەفیق پشدەری**

**تێبینی:**

من نووسەریکی کوردم، سەربەخۆم لەبیرو بۆچوونمدا، بابەت دەنووسم لەسەر دیکتاتۆر سەدام حسەین، چونکە ماوەیەکی دووروودریژ لەگەلیدا ژیاوم. هەروەها لەسەر بارزانی و بنەمالەکەی دەنووسم، لەسەر جەلال تالەبانیو هەموو سەرکردە کوردەکان دەنووسم ئەوانەی کەپەیوەندیم هەبوە لەگەلیاندا هەر لەسالی ١٩٥٦دوە تاوەکو ئیستا.

لەم بوارانەدا تا ئیستا دوو بەرگم چاپکرادووە کەکتیبیکم بەناوی ( کوردە دوژمنی خۆت بناسە ) لەم دوو بەرگەدا بۆ دەرخستنی راستییەکان، ئەوەی کەبەسەرمدا هاتووەو بینیومە بەشیوەیەکی راستی و بەویژدانەوە ئەیخەمە روو، لەمەشدا مەبەستم رازیکردنی ویژدانی خۆمو حزمەتکردنی گەلە ستەمدیدەکەمە، بەشی سیهەمی کتیبەکەم خەریکە ئەکەویتە دەست خوینەران. ئەمەش بووە بەهۆی ئەوەی خەلك متمانەم پی

بکەن و زانیاریم بخەنە بەر دەست، چونکە بڕوایان پێم هەیەو دەزانن لەرێگەی راست لام نەداوەو مەبەستیشم هەر دەرخستنی راستییەکانەو بەلگەشم لایە لەسەر راستی و دروستی قسەکانم دەربارەی تەقینەوەکەی بەنزینخانەی شەقلاوە لەو کەسانەی کەبەچاوی خۆیان دیویانە.

بۆ زانیاری زیاتر کەئاگادارکراومەتەوە، بنەمالەی بارزانی و دیکتاتۆر سەدام حسەین فەرمانیان داوە بەتیرۆرکردنم ، هەولێرم بەجێ هێشت و بەخاوو خێزانەوە رامان کرد بۆ سلیمانی.

## نامەیەکی کراوە بۆ بەڕێز کۆفی ئەنان- سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان

## بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کورد لەژێر سایەی هەر سێ حکومەتی سەدام و مام جەلال و کاک مەسعود

بەڕێز کۆفی ئەنان، سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەرپرسی پاراستنی ئاشتی لەجیهان و یەکەم لێپرسراوی مافی مرۆڤ لەسەرانسەری جیهاندا .

سەرەتا بەڕێز کۆفی ئەنان، پاش ئەوپەری ڕێزو سڵاوم حەز ئەکەم سوپاسگوزاری خۆم وەك هاوڵاتییەکی کوردی کوردستانی باشوور ئاراستەی بەڕێزتان بکەم، بۆ دەرکردن و جێ بەجێکردنی بڕیاری ٦٩٨، کە لەسایەیدا بارێکی گرانی سەر هەموو گەلانی عێراقی خێرنەدیو سووك کراو، ژیان و گوزەرانی خەڵکی بەگشتی باشتر کرد. هەروەها لەڕێگای پرۆژە یەك لەدوای یەکەکانی ئاوەدانکردنەوەدا ئەمرۆ کوردستان دووبارە، بەرەو ئاوەدانی و دامەزراندنەوەی گوندە کاولکراوەکان و شارە وێرانکراوەکانی هەنگاو دەنێت.

جەنابی سەرۆك، ئاشکرایە لای جەنابتان کەرژێمەکانی ڕۆژهەڵات بەگشتی لەسەر ئاگرو ئاسن دامەزراون و گوێ بەپرنسیپەکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ نادەن ، لەبەڕێوەبردنی دەسەڵاتە تۆتالیتاری و دیکتاتۆریەکانیان. بەبڕوای من لەهەر هەموو ئەو ڕژێمانە درندەترو فاشیتر، ڕژێمی بەعسی عێراقە، کە لەماوەی دەسەڵاتی ئەو حزبەدا گەلانی عێراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی

تووشی گەورەترین نەهامەتی بوون لەمێژووی خۆیان‌و جیهاندا. ئەم رژێمە هیچ کات دریغی نەکردوە لەپیادەکردنی سیاسەتە نائینسانیەکانی بەرامبەر بەگەلەکەمان، کەکاولکردنی سەدەها گوندو ویرانکردنی چەندین شارو کیمیابارانکردنی هەلەبجەو ئەنفالکردن‌و بێ سەرو شوینکردنی ۱۸۲هەزار هاولاتی بەلگەی ئاشکرای درندایەتی ئەو رژیمەن بەرامبەر بەگەلی کورد.

بۆیە گەلەکەمان لەدژی ئەم رژیمە درندەیە پەنای بردەود بەر شاخەکانی کوردستان، کەبۆ ئیمە بەردەوام تاکە هاوریێی بەوەفا بوون، لەوێوە شۆرشی رزگاریخوازی گەلی کورد بەرامبەر بەسیاسەتە دووژمنکاریەکانی بەعس دەستی پێکرد، لەوپیناوەشدا چەندین هەزار شەهیدو قوربانی درا . بەلام لەبەر پشتگیری زۆربەی ولاتانی جیهان بەگشتی و عەرەب بەتایبەتی بۆ ئەم رژیمەو بیدەنگبوونیان لەبەرامبەر تاوانە گەورەکانی دەرهەق بەگەلی کوردو، کاولکردن‌و راگویزانی هەموو گوندەکانی سەر سنوورو بەکارهێنانی چەکە کۆکوژە قەدەغەکراوەکان لەلایەن رژیمی بەعسەوە بەرامبەر بەشۆرشەکەمان‌و، بیدەنگ بوونی نەتەوە یەکگرتووەکان‌و ئەنجومەنی ئاسایشی نیودەولەتی، لەبەر هەموو ئەوانە شۆرشەکەمان توشی قەیران هات‌و ریگا لەبەدیهینانی ئامانجەکانی گیرا. بەلام دوای ئەوەی رژیمی سەرکەش‌و دوژمنکاری بەعس لەعیراقدا پەلاماری کویتی داو ئەم ولاتەی تالان کردو بیرە نەوتەکانی تەقاندەوەو بەبێ گویدانە هیچ بریاریکی جیهانی ئاوی کەنداوی پیس کرد، دوای ئەمانە دەمامکی رووی ئەم رژیمە دەرکەوت ورووە ناشیرنەکەی بۆ هەموو لایەك ئاشکرابوو، دوای ئەمە ولاتانی جیهان بەسەرپەرشتی

ئەمەریكا كۆبوونەوە بۆ گەرانەوەی ئاسایش بۆ ناوچەكەو دانانی سنووریك بۆ سەركەشییەكانی بەعس. بۆیە توانرا لەماوەیەكی كەمدا رژیمی بەعسیەكان لەكویت دەربپەریندریت و ئەم ولاتە رزگار بكریت. ئەم رووداوە هەلیكی گەورە بوو بۆ گەلی كورد، هەر بۆیە ماوەیەكی كەم دوای ئەم رووداوە كورد لەكوردستانی عیراق راپەریو سەرجەم دەزگاكانی بەعسی دەركرد .

لەسایەی ئەم راپەرینەدا كورد بەئازادی خۆی شاد بوو كەسەرەتاییترین مافی گەلانە لەجیهاندا. لەو چوارچیوەیەشدا نەتەوە یەكگرتوەكان بریاری پاراستنی گەلی كوردیان دا لەپەلاماری لەشكری دكتاتۆری عیراق. بۆئەم مەبەستە هیلی دژە فرینی ٣٦یان كرد بەسنووری قەدەغەكراو لەفرۆكەكانی بەعس. بەلام ئەوەی جیگای داخە بۆ گەلی كورد ئەوەیە كە بەپیی ئەم بریارە ناوچە هەرە دەولەمەندو گرنگەكەی كوردستانی باشوور كەركوك ، خانەقین، شیخان، تەلەعفەر لەژیر دەسەلاتی بەعسدا مایەوە.

رەنگە جەنابیشتان باش بزانن كەئەم ناوچەیە بۆ ئیمە وەكو قودس وایە بۆ فەلەستینیەكان ، كەئیستا بەعس ئازادانە رۆژانە بەرنامەكانی تەعریب و تەبعیس و تەهجیری تیدا پیادە دەكا، كەدوایینیان پرۆژەی جینشینكردنی ئاوارە فەلەستینیەكانە لەكەركوك، كەبەدلنیاییەوە دەزانن ئەم كردەوەیە بۆ داهاتووی ئاسایشی ناوچەكە چەند سامناكە.

بەریز جەنابی سەرۆكی نەتەوە یەكگرتوودكان، ئەمرۆ گەلەكەمان سوپاسی یەزدان دەكا كە هەلیكی بۆ دروست بووە تا ئازاد بیءو شەوانە بەبیء ترس لەگەلْ خیزانەكانیان بنوون و خەون

بەسپیدەیەروناکترەوە ببینن. ئەم بارودۆخە لای گەلەکەمان ئەوەندە دڵخۆشکەرە کەبۆ ئیمە وەکو خەون وایە، چونکە ئەمە یەکەم جارە لەمیژووی چەند هەزار سالەماندا لەم ناوچەیە، لەژیر چەپۆکی رەشی دەولەتە ئیقلیمیەکان رزگارمان بیت. لەو ماوە کەمەی ئازادیشماندا بۆ هەموو جیهانیمان سەلماند کەئیمە گەلیکین تینوی ئازادیو دیموکراسین، هەر بۆیە سالیك دوای راپەرین بووین بەخاوەنی یەکەم پەرلەمانی بەراست هەلبژیردراوی گەل، کەهەمو حزبەکان بەراستو چەپیانەوە ئازادانەو بەبێ هیچ سانسۆریك بەشدارییان تیدا کرد، کە ئەم پرۆسەیە لەرۆژهەلاتدا تا ئیستا بی وینەیە. بەلام ئەوەی جیگای داخە لەم بارەیەوە ئەوەیە کەپاش ماوەیەکی کەم شەری ناوخۆو براکوژی کەوتەوە ناومانو تووشی پارچە پارچە بوونو پەرتەوازە بوونی کردین. کە لەدواجاردا مۆتەکەی شەر زیانیکی ئیجگار گەورەی لیداین. هەروەها مەترسی گەرانەوەی بەعسی خستەوە بەر دەرگاکانمان، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە١٩٩٦/٨/٣١، لەسەر داوی خودی مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، کەپیشتر لەپەرلەمانی هەلبژیراودا نیوەی کورسی یەکانی بەدەست هینابوو، لەسەر داوی ئەم و بۆ بەرژەوەندی بنەمالەو حزبەکەی خۆیان تانکەکانی گاردی کۆماری رژانە ناو پیتەختی کوردستانو پەرلەمانیان داگیر کرد. لەم بەرە بەیانەدا سەدەها تانکی گاردی کۆماری خودی سەدام حسەین پەلاماری ئەم شارەیان داو بەبۆمباکانیان سەرجەم خەلکی ئەم شارەیان لەخەو راپەراند. ئەم لەشکرە درندەیە هەر چەندە بەگالتە تۆپیان ئەگرتە شارەکە، بەلام خەلکی بەراستی ئەمردن. دوای ئەمە بنەمالەی

مەسعود لەناوچە هەرە دۆلەمەندەکەی کوردستانی ئازاددا بوون بەپشو دەستیان گرت بەسەر هەموو داهاتەکانی کوردستان دا، کە لەراستیدا داهاتی سەرجەم گەلی کوردستانە، بەپیرو لاوو ژنو پیاو منداڵو گەورەیەوە، بەبێ رەچاوکردنی بیرو باوەڕو ئایینو حزبەکان. بەلام ئەم بنەمالەیە وەك چۆن لەهەلگیرساندنی شەڕی ناوخۆدا گوییان بۆ کەس نەگرتو دەست بەرداری نیازە گلاوەکانیان نەبوون، بەهەمان شیوەش هەموو بانگەوزاو لەبەر پارانەوەکانی کۆمەلانی خەلکی کوردستانیان پشت گوێ خست، بەهەموو چینو تویژەکانیەوە.

بەریز لیپرسراوی مافەکانی مرۆڤ لەجیهاندا، هەموو کەس لەکوردستاندا دەزانیت کەمن سەر بەهیچ حزبیکی سیاسی نیمو پاکانە بۆکەس ناکەم، سێ بەرگی کتیبەکەشم (کورد دووژمنی خۆت بناسە) کە لەکوردستان بەکوردیو لەئەوروپا بەعەرەبی بلاوبۆتەوە بەئاشکرا ئەو راستیەی پیوە دیارە. چونکە من لەریگای تاقیکردنەوەی میژوویی زیاتر لەچل سالم لەناو سیاسەتو، ژیانم لەگەڵ خودی عبدولرحمان عارف و سەدام حسەینو مەلا مستەفاو کورەکەی مەسعود بارزانی و مام جەلالو سەرجەم سەرکردە کوردو عەرەبەکانی پەیوەندار بەکیشەی کورد، بۆم دەرکەوتووە کەهۆکاری هەرە زۆری نەهامەتیەکانی گەلی کوردو ئاژاوە لەم ناوچەیەدا لەسایەی بنەمالەی مەلا مستەفاوە بووە، کەئیستا دەستیان بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستاندا گرتووەو بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەکاری ئەهینن. لەو چوار چیوەیەشدا توانیویانە ملیاریكو سێسەدو هەفتا ملیۆن دۆلار لەبانکەکانی ئەوروپاو تورکیا دابنینن.

لەکاتیکدا من لـە١٩٩١/٣/١٣دا کـاتیك مەسـعود بـارزانیم بینـی پیـی وتم خاوەنی دۆلاریك نیم!

سـەرۆکی خۆشەویست کۆفـی ئـەنان: ئـەم سـەروەتە مولکـی گـەلی کوردە، سـامانی هـەژاران و سـەرجەم هاولاتییانـە، بـەلام لەبـەر ئـەوەی ئیمـە هیـچ دەزگایـەکی یاساییمان نییـە لەسـەروی سـەرۆك حزبـەوە بۆیە ناچارین پەنا بەرینە بـەر جـەنابتان وەکـو لیپرسـراوی یەکـەمی سـەرجەم مرۆڤایەتی، تا بتوانـین لـەریگای جەنابتانـەوە چارەیـەك بـۆ ئـەم گرفتـە گەورەیـە دابنیـین، کەچارەنووسـی گـەلیکی پیـوە بەستراوەتەوە. چونکە وا خەریکە ئەم بنەمالەیـە هیواکانی هـەزارەها سالەی گەلیکی زیاتر لە٤٠ ملیۆن کەسـی بـەبادا دەدەن و، ئەگـەر ئیـوە هیمەتیك نەکەن و فریامـان نەکـەون هیـچ ریگریـك نییـە لـەوەی ئـەو بنەمالەیـە دووبـارە دەسـتی بـەعس رانەکیشـنەوە سـەر کوردسـتان و، ئەگـەر لـەدوای خیانـەتی ٣١ی ئـابدا هـیزە نیشـتمانپەروەرەکان و شۆرشـگیرەکانی کوردسـتان لـەریگای بـەرەی نیشـتمانییەوە توانییـان هـەموو ناوچـە داگیرکراوەکـان بیجگـە لەشاری هـەولیر لـەژیر چنگـی بەعسیەکان دەربهیننەوە، ئەوا رەنگە بـەگۆرانی هەلومـەرجی سیاسـی ناوچەکـە، بـەعس بەیـەکجاری لـەریگای بنەمالـەی بارزانیـەوە لەکوردستاندا رەگی خۆی دابوکتیتەوە.

چارەکردنی ئەو بارودۆخەش تەنها بەوە دەبیـت کەبـەریز تـان کـار بکـەن بـۆ ئـەوەی کوردسـتانی ئـازاد بخریتـە ژیـر چـاودیری نەتەوەیـەکگرتووەکان و لـەژیر دەسـەلاتی حزبـە کوردسـتانیەکان دەر بهینریت، بەو ریگایە ئەتوانن چـۆن خـۆراك بەیەکسانی لەکوردستان دابەش ئەکەن، بەهـەمان شـیوە ئاشتی و ئازادی و ئارامی ناوچەکەش

بپاریزن. ئەم کارەش گەورەترین چاکە دەبێت بەرامبەر بەگەلەکەمان.

دەکرێ دوای ئەمەش بەچەند مانگێك لەرێگەی هەلبژاردنێکی ئازادو دیموکراسیەوەو لەژێر سەرپەرشتی ئێوە، سەرجەم دەزگا حکومیەکان بەپێی ئەو دەنگانەی حزبەکان لەهەلبژاردندا بەدەستی ئەهێنن دابەشیان بکەن.بەسەریاندا.

لە کۆتاییدا هیوادارم بەریزتان بەچاوێکی جدییەوە ئەم نامەیە بخوێننەوە، چونکە گەرچی یەك کەس ئەم نامەی نووسیوە ، بەلام بروا بفەرموون کەئەمە داخوازی سەرجەم گەلی کوردستانە کەتەنها لەرێی جەنابتانەوە جێ بەجێ دەبێ. بەهیوای ئەوەی بەبەرپرسیاریەتی مێژوویی خۆتان هەلبستن لەم رووەوە، چونکە ئیمە لەرێگای هەلویستو کردەوەکانی جەنابتان لەناوچە جیاجیاکانی جیهاندا ئێوەمان وا ناسیوە کەپیاوی ئەرکە قورسو زەحمەتەکانو خەمخۆری ئاشتیو ئاسایشن لەسەرجەم گۆی زەوی.

**برای دلسۆزت**

**رەفیق پشدەری**

## چەند تێبینییەك:

**یەکەم:** هەمووومان دەزانینو دلنیاین لەوەی کەهۆی نەهامەتیەکانی گەلانی عێراق بەکوردو عەرەبییەوەو، هۆی ٩٠٪ی کیشەکانی ناوچەکە بەگشتی شەحسی سەدام حسەینە. کەمن دلنیام ئەمریکا نایەوێ لەئەمرۆدا بیروخێنێ، بەلکو ئەوان بەردەوام دەلێن

صەدامیکی لاوازی دکتاتۆرمان پێ باشترە. لەکەسێکی ناتەبا لەگەڵ بەرژەوەندیەکانمان و بەتواناو دیموکراتی. ئەمە وای لەخەڵکی کوردستان کردووە کەبەگشتی رەخنەیان لەئەمریکا هەبێ، چونکە پێیان وایە ئەمریکیەکان تەنها بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆیان ئەو بارودۆخەیان ئاوا بەهەڵواسراوی راگرتووە.

لەکاتێکدا چۆن سەدام لەبەشی دەسەڵاتی خۆیدا دەستی بەسەر سامانی گەلانی عیراقدا گرتووە، بەهەمان شێوە بنەماڵەی بارزانیش لەسنووری دەسەڵاتی خۆیاندا بوونەتە باندێکی گەورەی مافیاو هەموو سەروەت و سامانی کوردستانیان دەست بەسەراگرتووە.

دووەم/ راستە لەدوای راپەرینەوە بەعس و دەزگا ئاشکراکانی لەکوردستان دەربەدەرکران، بەڵام دەزگا نهێنی و موخابەراتیەکانی عیراق و ئیران و تورکیا و چەندین وڵاتی تر ئەمڕۆ لەکوردستاندا بەهۆی نەبوونی حکومەتێکی بەهێزو یەکگرتوو لەناوچەکەدا توانیویانە دزە بکەنە کوردستان و کارە دوژمنکاریەکانیان دەرهەق بەگەلەکەمان ئەنجام بدەن، بەتایبەتی دوای دروستبوونی شەڕی ناوخۆو فراوانبوونی دووبەرەکی نێوان هەردوو حزبی دەسەڵاتداری یەکیەتی و پارتی.

سێیەم/ ناوچەکانی کەرکوک و خانەقین تەلەعفەرو سنجارو شێخان کە ناکەونە ناو سنووری هێڵی ٣٦ ئەمڕۆ لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا تووشی کاولکردن و راگوێزان بوون. رۆژانە چەندین خێزانی کوردی کەرکوک دەردەکرێن بەرەو کوردستانی ئازادو لەبری ئەوان عەرەبی عیراقی یان فەلەستینی جێنشین دەکرێن. رێکخراوە خێرخوازەکان و دەزگا بەرپرسەکانیش دوور

لـەزێدی باوباپیرانیـان خانویـان بـۆ دروسـت دەکـەن، کەئەمـە بۆخـۆی بەژداریکردنـە لەسیاسـەتی راگوێزانـی کـوردو جێنشینکردنی عەرەب لەجێگایاندا.

چوارم/ من لەبەرواری ١/٣/٢٠٠٠دا نامەیەکم بۆ بەرێز نوێنـەری نەتـەوە یـەکگرتوەکان لەسلێمانی نوسـیو لـەدوا لاپـەرەی بـەرگی دووەمـی کتێبەکـەمدا بـەئینگلیزی بـڵاوم کـردوە . لـەو نامەیـەدا داوام لی کردبـوو تـا یـەکتر ببینـین بـۆ ئـەوەی لەهـەندێ شـت ئاگاداری بکەمەوەو گفتوگۆ لەسەر هەندێ بابەتیتر بکەین. بەڵام تـا ئیسـتا وەڵامـی نـەبووە، بۆیـە ئـەم جارەیـان ناچـار بـووم راستەوخۆ لەگەڵ جەنابتان پەیوەندی بگرم.

وێنەیەك بۆ نوێنەرتان لەشاری سلێمانی

# An open Message to the General Secretary Of United Nation Mr. KofeeAnnan

Trading the Kurdish people issue under the Iraqi and the two goverments in the southern Kurdistan under the rule of Mam Jalal and Masu'd.

Mr. Cofee Annan, the general Secretary of United Nations and responsible of peace process and human rights in the world.

I would like to express my gratitude as a Kurdish citizen in southern Kurdistan for the efforts you made about the implementation of 986 resolution, that lifted part of the burden on the Iraqi people and made their life better, through implementing various reconstruction projects nowadays and rebuilding the destroyed villages.

Dear Sir,

As it is clear the system followed in the countries of the eastern region is based generally on fire and iron, and most of their rules believe in democracy and human rights in their way of dictatorship and totaliterate ruling. I think the most savage and fascist regime is Al-Ba'ath regime in Iraq that subjected Iraqi people generally and Kurdish people especially to the greatest disaster in its history and the history of humanity.

The regime did not get rid of its inhuman policies against its people any time. The destruction of four thousand and five hundred of Kurdish village, bombing Halabja with chemical weapons and tooling processes that killed more than 180 thousand people, all these evidences show how savage this regime was with Kurdish people, this made them to escape toward the mountains of Kurdistan. So they declared their liberation revolution against this aggressive policy. Through this revolution many thousands of people sacrificed themselves, but because many countries of the world and many Arabic countries had supported Iraq, and they had no attitude toward the great crimes committed by the regime against the people, and because of destroying the villages on the border and moving their people to the collective houses, and using mass destruction weapon by Al-Ba'ath regime against our revolution, that is prevented internationally, moreover United nations' Organization and the international Security council that had no point of view toward all these crimes collapsed our organization and it could not fulfil its aims. After the invasion of Kuwait by the Iraqi regime, robbing their properly and exploding their oil wells, neglecting the international public opinion and its resolutions concerning the sovereignty of the country, the real nature of this regime appeared. These countries met under United States administration and they decided to put an end to this regime and return peace to the region. These countries could set Ba'ath regime out of Kuwait.

These events were a golden chance for Kurdish people, they could destroy all Ba'ath institutions in

Kurdistan in a mass uprising and they get their liberty which is one of the main rights of all the people of the world, thus the United Nations decided to protect the Kurdish people from Iraqi attacks, their places were prevented from rich areas with oil in southern Kurdistan such as Karkuk, Khanakeen, Shekhan and Tala'far to remain under the administration of ba'ath regime according to this resolution.

As you know Karkuk for Kurds is just like Quds for the Palestinians, but Al-Ba'ath participates freely the policy of arabization, emigration in this region and forcing people to join Al-Ba'ath party. The latest policy this party used was setting the Palestinian refugees in this region which created unsettled situation.

Dear Sir,

Our Kurdish people are grateful for they could get this chance to have liberty and to sleep without any fear with their families and they can dream of a better future. This situation is like a happy dream, because it is for the first time to feel that we are not exposed to the attacks of the regional countries.

During this short period we could prove to the world that we want liberty and democracy, therefor a year after the uprising we could have parliament whose members were elected democratically by the rightist and leftist parties very freely, and I can say that it had no parallel in any country of the eastern region.

Unfortunately fighting started between the Kurdish parties and this is because of separation between the Kurdish political powers.

This coasted a great lose for the Kurdish nationalist movement, and the danger of Ba'ath coming back to the region, especially after the events of August 31-1996, when the leader of Kurdistan Democratic Party,Masu'd Al-Barzani, who wined %25 votes and %50 seats of parliament, personally asked for the regime's help.

Thus according to this demand for protecting his party and family the tanks of the republic guards attacked Erbil and they occupied the parliament. This army shooted haphazardly and the people were scared. Thus the Barzani family controlled the financial resources in the richest region in southern Kurdistan. These resources refer to the Kurdish people as a whole without any distinction between their political membership and their beliefs.

They paid no attention to the people's call to get rid of fighting and to solve the problems between them rationally and peacefully.

Dear sir,

Most of the people in Kurdistan bear witness that I am not a member in neither of these political parties and I do not defend any of them.

My book " You Kurd recognize your enemy", that is published in Kurdistan in Kurdish language and in

the European countries in Arabic language, is a witness.

Through my political expience during fourty years, and my life with the presidents of this country like Abdul Rahman Arif and saddam Hussein, and the Kurdish leaders like Mula Mustafa Al-Barzani, his son Masu'd Al-Barzani, Mam-Jalal and other Kurdish and Arabic leaders who are concerned with the Kurdish people issue, I notified that this family who controlled KDP and used it for their benefit is behind all these disasters and disorder in this region. Thus this family could put about one miliar and 300 000$ in the Turkish and the European banks, while in my meeting with Masu'd Al-Barzani on March 13-1991, he assured that he does not have one dollar in front of some witness.

Dear Sir,

This great wealth is Kurdish people's wealth. It refers to the labors and the poor peoples, since there is no legal institutions to rule and control the power of the party leaders, so we are forced to ask you us a responsible of the humanitarian society affairs to find a solution for this great problem that decides the future of this people. This family is about to play with the dreams of forty million of Kurdish people during thousands of years, so if you do not make an effort this family will bring back the regime's tanks to the region once again. Though the revolutionist forces could liberate all the occupied regions by the regime after the treason of August 31 except Erbil, but returning the regimes to Kurdistan with Barzanian family's help is expectable, in case of any political developments. You can solve this problem by putting

this liberated region under the protection of United Nations, and setting it free from the control of these Kurdish parties, thus you can spread peace and settlement in the region. As you could distribute food equally in Kurdistan, protecting this people also will be a great service for them.

Some months later it would be possible to start a free and democratic election under your supervision, and then dividing the government institutions on the political parties according to the votes they will gain. At the end I hope you read this letter seriously, through it is from one person but it expresses the needs of all the people of Kurdistan who believe that they can be fulfilled by you.

Yours
Rafik Al-Pishdari

Note:

1-We all know that remaining Saddam in his position is the main reason behind all these disasters in Iraq as a whole.

I am sure that America does not want to remove him now, but on the contrary they always say that " A dictator and a weak person is better than another democratic and active, who does not serve our benefits". This American point of view made the Kurdish people to critics them, because they think that America wants the situation to remain as it is for their benefits. At the same time as Saddam controlled all the Iraqi wealths, the barzanian family also

controlled the wealths in Kurdistan and they became a great gang for collecting money.

2-After the uprising of 1991 all the Ba'ath institutions were set out of Kurdistan, but now there are many Iraqi, Iranian, Turkish and other secrete intelligence institutions in Kurdistan, and this is because of lacking of a strong united country.

These institutions implement many destructive and aggressive works against our people, especially when the interior fighting started between the two main parties, PUK and PDK.

3-Karkuk, Khanakeen, tala'far, sngar and Shekhan, that are still under the control of the regime, for being outside the line of 36 ،are exposed to destruction and emigration. Every day many Kurdish families in Karkuk are transported to the liberated Kurdistan ،and they are replaced by Arab people of Iraq and Palestine. The charitable organizations and the responsible local authorities build them houses in regions for from the cities of their ancestors. This is a policy of transporting Kurds and replacing them by Arabs.

4-I sent a letter to the United Nation's representative in Sulaimany on March 1-2000, I published its translation in the last paper of the second part of my book "Your Kurd recognize your enemy", in which I asked for a meeting with United Nation's representative to deal about some private issues and to inform him about some matters, but till now I received no answer. This time I am forced to contact with you directly and I presented a version to your representative in Sulaimany.

# To: Mr. Kofi Annan ،UN Secretary General

Greetings,

It is a great pleasure for me to bring the following issue to your kind attention.

The Incident of Explosion for the Fuel station in Shaqlawa, 7th December 1995

This incident,which caused killing and injury of more than 22 civilians including two UN staff members, is another ring of the terrorist and criminal scheme against the people by the Barzani family, ordered by regional countries. The target of the operation was the killing of two UN staff members.

Few days before the incident, a meeting was held in Salahaddin summer resort, attend by Sudad, the son of Mulla Mustafa Barzani and the so-called Karim Chairman of the terrorist "Parasten Intelligence Organization". The so-called Hussein Hama Soor Agha Mirawdali had aslo been invited for the said meeting in the beginning of the meeting, Sudad Barzani spoke to Hussein Hama Soor saying: "The Iranian Government has helped us in detaining and killing of Hassan Kwestani, and Iran has been and is continuously supporting us and has become a supporter to us, therefore, we should also be

cooperative with it Iran and pay back the good will. The Iranian Government has requested us to assassinate two Jewish persons working United Nations Organization. That is why we have held this meeting to study the matter jointly and put a plan to carry out this operation.

In this manner, Sudad Barzani explained to the loyal man of the familyHussein Hama Soor Agha, whom has had suspicious relationships with both the Iraqi and Iranian Goverments. The said person showed full readiness to carry out the criminal scheme. During the same meeting, the fuel station near Shaqlawa was identified as a place for committing the crime. The ownership of the fuel station was deported and detained and the station was handed over to another person who is an agent of Parasten Organization. The latter put some TNT explosives inside one of the fuel storage as a preparatory step to carry out the operation. They agreed to implement the plan as following: when the two staff steer to Shaqlawa in their Japanese COROLA car, the Parasten informs Hussein Hama Soor Agha through Radio. When the car of the UN staff arrives in the fuel station, the plan would be implemented. After finishing the operation, Hussein Hama Sooe Agha left the place steering towards Shaqlawa, and asked one of his men called Tashin Khrwatani to stay on the hillside opposite to the fuel station from the eastern side, giving him a remote control set and advised him to be fully ready to monitor the station with binoculars. He was using a radio set to receive orders and guidance from Karim Sinjari about the departure of the car.

On 7th December 1995, the day the incident took place, Tashin got information that the car has departed steering towards Shaqlawa, he prepared to commit the crime and when the vehicle arrived, he pressed on the button of the remote set and the fuel station exploded and was on fire. It resulted at killing of two persons and injury of 20 people including the two UN staff members that were working for UNGCI.

Following the explosion, the police & security force came to the locating of the incident for investigation. The detained a great number of people at the location, amongst them was one of the men of Hussein Hama Soor called Mahmood, who was participating in committing the crime. After investigation, he collapsed and admitted his participation in the explosion starting: I participated in the process with the order from Hussein Hama Soor, he in turn, has been ordered by Sudad Barzani and Karim Sinjari to carry out the operation. The news was spread amongst the public. To cover his scandal, Karim was urged to detain all parties involved in the crime and sending them to Akra Jail who were: Hussein Hama Soor Agha, Ali Agha, Mustafa Agha, Farhang Hirani, Omer Gergo and his brothers, Tahsin Khrwatani and Mahmood. During the investigation, it was revealed that Tahsin and killed an Iranian doctor in Harir collective town, who was a member of Kurdistan democratic party- Iran KPPI. News was spread at that time that this doctor was an agent of Iranian intelligence Ittaliat. It was

revealed that Mahmood is one of the Iranian agents and one of the killers of the said body.

Thus, the Barzani family evaded holding the responsibility and imprisoned a great number of people to cover the crime, Since those detained people belong to a powerful tribe, it would not be possible to execute them, while releasing them would threat the security of Barzani family.

Various rumors were spread at that time about the parties behind this crime and was said that the crime has been committed with the order of Quasi Saddam Hussein. Regardless that, this crime is another prove on the brutality of this family and their inhuman stance towards those who have come to this country to provide humanitarian services to the people here. It also proves their subordination to the enemies of the Kurdish people.

Yours
Rafiq Pishdari
10th October 2000

**Remarks:**

I am a kurdish non-aligned writer. I have writings and proceedings about the dictator Saddam Hussein, since I have lived close to him for some period. I have also writing on Barzani and his family as well as on Talabani and all Kurdish leaderships that I have lived with them since 1956 till now.

In this regard, I have published two volumes of my book: "Kurds, recognize your Enemy", aiming at revealing the truth. I am writing to relief my conscience, when explaining what has happened to me and what I have seen. It aims at serving my suppressed people. The third volume of my book is about to publish.

All these have made people trust in me and respect me and have made them provide me information, trusting me and since I would never turn aside and keen to tell the truth. There is an eyewitness to prove my above- mentioned statement regarding the explosion incidence of Shaqlawa.

To be informed that I have been informed that Barzani family and the dictators Saddam Hussein have ordered to assassinate me, and hence I have escaped along with my family to Suleimainyah.

Regards.

CC: UN Representative in Suleimaniyah.

**نامەیەکی کراوە بۆ هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەری دانیشتووی هەندەران، ئەوانەی بەتەنگ کەس و کارو هاوزمانەکانیانن لەکوردستانی باشور. بەتایبەتی بەریزان:**

*١-د. کەمال میراودەلی*

*٢-د. جەمال نەبەز*

*٣-د. نجمەدین کەریم*

*٤-پرۆفیسۆر ئەسعەد خەیلانی*

*٥-د. محمود عەلی عوسمان*

*٦-مامۆستا جەمال عەلەمدار*

بەریزینە، سەرەتا تکا دەکەم ئەو پەری خۆشەویستی و ریزم قبولّ بفەرموونو، هیوادارم سەرجەمتان بەردەوام لەلەش ساغی و خۆشحالی دابن و، گیانی کوردایەتیتان هەر لەجۆش و خرۆش دابێت.

خوشك و برا کوردەکانم لەهەندەران، بەتایبەت ئەوبەریزانەی کەناوم هینان، من لەریگای هەرسێ بەرگی کتیبەکەم کورد دوژمنی خۆت بناسە زۆر لایەنی شاراوەو نهینی شۆرشی رزگاریخوازی گەلەکەمانم ئاشکرا کردو، گەلەکەمانم لەچەندین راستی ئاگادار کردەوە. بەو هیوایەی بتوانم خزمەتیکی بزافی رزگاریخوازی گەلەکەمان بکەم و لەدواجاردا خەباتی نەپساوەمان لەو قەیرانە دەربینین کەتیێی کەوتوە.

بەریزینە ئیوە دەزانن کەگەورەترین ریگر لەبەردەم بەئاکام گەیشتنی سەرجەم شۆرشەکانمان، بوونی دوژمنی ناوخۆیە.کە بەردەوام هۆی سەرەکی شکستەکانمان و لەمپەری بەردەم دروست بوونی دەولەتی کوردی بووەو، کو لەهەر سێ بەرگی کتیبەکەم جەختم لەسەر کردوەو سەلماندوومە کەدوژمنی ناوخۆی هەرە گەورەو نەیاری سەرسەختی شۆرش، بنەمالەی بارزانی بووە. کەئیستاش لەسەر هەمان سیاسەتی دژە کوردی خۆیان و لەپیناو بەرژەوەندیە زۆر تایبەتیەکانیان گالتە بەموقەدەراتی گەلەکەمان دەکەن. ئەو بنەمالەیە وەکو جالْ جالوکە بەجۆریك تۆری دەسەلاتی خۆیان دامەزراندوەو بلاوەیان کردوە کەمەگەر نەتەوە یەکگرتوەکان و لەریگای خودی کۆفی ئەنان ەوە رزگارمان ببێ. بۆ هەمان مەبەست لەکۆتایی کتیبەکەمدا نامەیەکم ئاراستەی بەریزیان کردوە، کەپیشتر لەریگای فاکس بەزمانی ئینگلیزی گەیاندمە لای جەنابیان.

بەریزینە، ئەی ئەو کورد پەرودرانەی لەهەندەران و ژمارەتان زیاترە لە۲۰۰ هەزار هاولاتی کوردی، ئەی ئەوانەی دریغی تان نەکردوە لەکۆمەککردنی کەس و کارەکانتان لەکوردستانی ئازیزدا، بەتایبەت ناوبراوانی سەرەوە. ئەمرۆ بارودۆخی کوردستانی باشورو روداوەکان ئەو ئەرکەتان دەخاتە ئەستۆ کەهەریەکەتان لەئاست خۆیەوە کار بکات بۆ سەرخستنی ئەو پیشنیارە، کە لەراستیدا داخوازی سەرجەم گەلی کوردە لەباشور، کەئەمرۆ لە ترسی کوشتن و دەسەلاتی بنەمالە ناویرن لەپرۆژەیەکی ئاوادا بەشداری بکەن، ئەگەر نا ئەوا من دلنیام

لانی کەم ٩٥٪ ی گەلی لەگەڵ ئەو داوایە دایەو هیوا بەو رۆژەوە دەخوازێ کە لەواقیعدا جیبەجی دەبێ.

لەکۆتایدا هیوادارمو داوام ئەوەیە کەهەمووتان لەگەڵ ئیمەدا لەکاردا بن بۆ ئەم مەبەستە. کەتاکە ریگای رزگاربوونمانە لەکارەساتەکانی ئەمرۆو هەرەشەکانی سبەینێ.

خزمەتکاری کوردو کوردستان

رەفیق پشدەری

# کۆتایی

لە کۆتایی بەرگی سێیەمی ئەم کتێبەداو دوای ئەوەی خوێنەر دوژمنی کوردی ناسی، وای بۆ دەچم خوێنەر بۆی هەی بپرسێت: ئەگەر مێژووی بنەماڵەی بارزانی پڕە لەم هەموو ناپاکیو دەستدرێژیو زیادەڕەوییانە، ئەی چۆن توانیان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ سەرکردایەتی بگرنە دەستو خۆیان بکەنە چاوساغو پێشەنگی گەلی کوردو بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بکەن؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە مرۆڤ نابی بەسۆزبێت یان لەکاتی تاوتوێکردنی ئەم باسەدا ویژدان بەکاربهێنێت. ئەوەندەی پەیوەندی بەخۆمەوە هەبێت وای بۆدەچم چەند هۆکارێك بوونە هۆی پەرەسەندنی کاروبارەکان وگەیشتنیان بەم ئاقارە، چونکە جگە لە فاکتەرەکانی لێهاتوویی، شارەزاییو پشتگیری دەوڵەتانی ناوچەو داموودەزگا موخابەراتییە نێودەوڵەتییەکان لەگەڵ سەرهەڵدانی هەلومەرجی گونجامی پەیدابوونو گەشەسەندنی ئەم بنەماڵەیەو گەیشتنی بەترۆپکی دەسەڵات لەسەرکردایەتی شۆڕشی کورددا، دەڵێین جگە لەمانە فاکتەرێکی تری گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە کە گەلی کورد بەشێوەیەی گشتیو بەبێ جیاوازی پەرەسەندنو گۆڕانکارییەکان لەئەستۆ دەگرن، هەریەکە بەرێژەیەکی دیاریکراوو، لەچوارچێوەی ئەم پێودانگەدا خۆم بەبەرپرسیاری یەکەم دەزانم

چونکە بۆ ماوەیەك لەگەڵ ئەم بنەماڵەیەدا ژیام و زۆر خزمەتم کردن بەتایبەتی دوای گەڕانەوەی بارزانی لەیەکیتی سۆڤییەت (١٩٥٨) هەتا خیانەتی ٣١ی ئابی ١٩٩٦.

دوای ئەم رووداوە مەرگەساتە بە ئاشکرا بۆمدەرکەوت کە ئەم بنەماڵەیە هیچیان پێ نییە کە گەلی کورد سوودی لی وەربگریت لەبەر ئەمەشە دەستم کرد بە نووسینی ئەم یادداشتانەم بۆ پەردەهەلمالین لە رووی راستییەکان بۆ نەوەی نوی بۆ ئەوەی خواو گەلی کوردو ویژدانی خۆم ئاسوودە بکەم.

ئەگەر کارکردنم لە خزمەتی ئەم بنەماڵەیە هەلقولاوی بیرو باوەرو بۆچوونم بوو بێت ئەوا ئەمە لەپیناوی بەرژەوەندی کوردو کوردستاندا بووە بەو ناوەوە کە ئەوان پیشەنگی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کوردبوون، بەلام کاتیك راستییەکانم بۆ دەرکەوت وام بەباش زانی کارگوزار بم لە فەرمانگەیەکدا نەك وەزیریك بم لای ئەوان. هیواداریشم لە نووسینی ئەم یادداشتانەدا سەرکەوتوو بوویم لەرووی راستکردنەوەی هەلەکانی خۆم بەمەبەستی قەرەبووکردنەوەی ئەو رۆژگارانەی لەخزمەتی بارزانیدا بووم کاتیك هەنارم بۆ دەنك دەکرد تا بیخوات. لە هەمان کاتدا حەز دەکەم ئەوە رون بکەمەوە کەتاوانباری سەرەکی لەم مەسەلەیەدا ئەو سەرکردەو کەسایەتییە سیاسەتمەدارە کوردانەن کە تەنها بەناو دژایەتی ئەم بنەماڵەیەیان دەکردو لە راستیدا گەورەترین خزمەتیان پیشکەش بەبنەماڵە دەکرد.

بۆ نموونە باڵی مەکتەبی سیاسی، هەرگیز نەیتوانیوە بەشێوەیەکی ئاشکرا دوژمنایەتی خۆی بەرامبەر بنەماڵە رابگەیەنێت و ئەم دژایەتییە بکاتە هێڵێکی ستراتیجی لەکاری سیاسیی خۆیدا، بەڵکو بەپێی گۆڕانکاریەکان و وەرچەرخانی بارودۆخ و هەلومەرجی سیاسی، مامەڵەیان لەگەڵ ئەم بنەماڵەیەدا کردووەو ریوشوێنی دیبلۆماسی و زمانلووسییان لەگەڵیاندا بەکارهێناوە، لە کاتێکدا بنەماڵە هەرگیزو لە سایەی هیچ هەل‌ومەرجێکدا ئامادە نەبووە ئەوەندەی تۆزقاڵێک لە رووی مامەڵەکردن لەگەڵ هیچ لایەکدا نەرم بێت و دەستبەرداری هەوڵ‌کانی نەبووە بۆ ملکەچ پێکردنی بەرامبەرەکانی. بۆ نموونە کاتێک تەرمی بارزانی هێنرایەوە بۆ کوردستانی عێراق، حزبە کوردییەکان بەشێوەیەکی بێ وێنە کە لەمێژووی کورددا رووی نەداوە بەپێشوازی تەرمەکەوە بوون، لەبەر ئەوە کەسێکی وەك من ئەگەر رۆژێك لەرۆژان خزمەتی بنەماڵەشی کردبێت ئەوا باش نەیناسیون و ئەمەش بەکارێکی ئاسایی لەقەڵەم دەدرێت. بەڵام سەرکردە سیاسییەکان نەدەبوو نە لەرابردووو نەلە پاشەرۆژدا کاری وا بکەن، چونکە ئەوان بریارسازی پرۆسەی سیاسیی کوردن، ریبەری گەلن و راستییەکان دەزانن هەروەکو شاعیریکی عەرەب دەڵێت:

*إذا كنت لا تدري فتلك مصيبة*

*وإن كنت تدري فالمصيبة أعظم*

لەسۆنگەی ئەمەوەیە کەبەرپرسیاریتی ئەم سیاسەتمەدارانەمان گەورەترە، تەنانەت ئەو سەرکردانە کاتێك

کـردووە.خیانەتکارییـەکانی ئـەم بنەماڵەیـەیان بەشـێوەیەك بـۆ دەردەکـەویت کـە نـابێ چاوپۆشـی لێ بکریـت وەکـو هەرەسـی ١٩٧٥و خیانەتی ٣١ی ئاب، ئەوا دوای ماوەیـەکی کـەم تووشـی نەخۆشـی لـەبیرچوون و چاوپۆشـی دەبـن، وەك بلێیـت بنەماڵـەی بارزانی پەشیمان بوونەتەوەو لەسـەر دەسـتی شـێخانی تەریقـەت تۆبـەیان کـردووە، ئینجـا سیاسـییەکانمان ئـەوەندی پینـاچێت یادەدەنـەوە سـەر ڕێبـازی کۆنیـان لـە مامەڵەکردن لەگـەڵ بنەماڵەدا لەکاتێکدا خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ((إن الله لا يغفر أن يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء)).

بـەم پێودانگـە حزبـی شـۆڕگێری سیاسـیی و نیشـتمانپەروەر ئەگەر بۆی هەبێت چاوپۆشی لـە هـەموو هەڵەکان بکات ئەوا بۆی نییـە کـردەوە خیانەتکارییـەکانی وەکـو هـەرەس پێـهێنانی شۆڕش و ٣١ی ئاب پشتگوێ بخات. من لـەو باوەڕەدام کارکردن لـەپێناوی هێنانەدی ئاشتەوایی لەگەڵ ئەوانەی ناپاکی لەگـەڵ و نیشتمانیان دەکەن خۆی لەخۆیدا جۆرێکـە لـەناپاکی. هـەروەها کۆمەکی کردن و یارمەتیدانی تاوانباران کـاتێك تـاوانێك ئـەنجام دەدەن لەخۆیدا، بەپێی یاسا بەشداریکردنە لەتاوانەکە.

لەکۆتاییدا ئەوە ماوە بگوترێـت کـە ئـەم بنەماڵەیـە، هـەروەکو چۆن بوونەتـە بەڵا بەملی گەلی کوردەوە لەهـەمان کاتدا بوونەتـە بارێکی قورس بـەڵکو نەهامەتییەکی گەورە بەسەر خودی پارتی خۆیـەوە وەکـو حزبێـك ئەمـەش دوای ئـەوەی پـارتی کـردە داردەستیان و لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان هێنا. لەبەر ئەمە کاتێك ئەو بـارە قورسـە لەسـەر شـانی پـارتی لادەچێـت و

گەلی کورد تۆڵەی کردەو خیانەتکارییەکان و دزی و دەستدریژی و کوشت و کوشتار لەبنەمانە دەکاتەوە، ئەوساکە منیش وەکو کادیریکی دلسۆزی سیاسیی دیمەوە ریزی پارتی بۆ خزمەتکردنی کوردو کوردستان. لەوەش دلنیام کە ئەو رۆژەی گەلی کورد ئەم تۆڵەیە دەسەنیتەوەو حسابی خۆی لەگەڵ بنەماڵەدا یەکلایی دەکاتەوە نزیکەو بەریگەوەیە.

بابروخیت بنەماڵەی بارزانی، بژی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق کە بەرینمایی و رینوینی شەهیدی تیکۆشەرو قارەمان، سەرۆکی کۆماری مەهاباد قازی محەمەد (خوا بەبەهەشتی بەرینی شادبکات) دامەزرا .

## وتەيەكى پيويست:

بەپيويستى دەزانم سەرنجى سەرجەم دۆست و برادەرو خوينەرانى خۆشەويست بۆ ئەوە رابكيشم كەمن، زياد لەدوو بەرگى يەكەم و دووەم بايەخم بەم بەرگى سييەمە داوە، هۆى ئەمەش بۆ ئەوە دەگەريتەوە كەژمارەيەكى زۆرى خوينەرو رۆشنبيران تيبينى و رەخنەيان دەربارەى دارشتن و ريزبەندىى بابەتەكانى دوو بەرگى پيشوو هەبوو. ئەمە پالى پيوە نام زياتر گرنگى بەو لايەنەى نوسينى ئەم بەرگى سييەمە بدەم.

شايەنى باسە كەبەپيى توانا هەولم داوە ئەوەندەى لەتوانامدا بيت خۆم بەم بەرگە ماندوو بكەم، تا بەپوختى بكەويتە بەردەستى خوينەران و بەهۆى ئەمەوە دارشتنى زۆرى خاياندو ئەمەش وايكرد دەرچوونى، شەش مانگ لەوادەى خۆى دوا بكەويت، چونكە ئەم ماوەيەدا بەردەوام بەسەر دەستنوسەكانمدا دەچوومەوە، رستەيەكم ليرە دەگۆرى و برگەيەك لەوى بەهيواى ئەوەى بەسەر كەم وكورتيەكاندا زال بم، تا بەدلى هەمووان بيت.

لەلايەكى ترەوە پيم خۆش بوو نرخى ئەم بەرگە لە١٠ دينار تينەپەريت، بۆ ئەوەى هەموو خوينەريك لەتوانايدا بيت دانەيەكى لى بكريت، بەلام بەهۆى گرانيى نرخى چاپ هەروەها لەبەر ئەوەى هيچ لايەن يان كەسيك بەهيچ شيوەيەك دەستى يارمەتى بۆم رانەكيشا، ناچاربووم ئەو نرخەى لەسەر دابنيم كەبەپشتى بەرگەكەوەيە، بۆيە پيشەكى داواى ليبوردن دەكەم.